باری وەک نالی لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا گەشتی دوور و درێژی بێ لزوم بکات. گۆیا ئەگەر لە مەککە سەفەری کردبا بۆ کوێ دەچوو؟ ئەستەمبوڵ؟ شام؟ میصر؟ بابان؟ هیچ کامێکیان ئەوە نین نالی خۆی بۆ هەڵکوتێ لەو ئاخەلێوەی ژیانییدا. وا چاوەڕوان دەکرێ لە مرۆڤێکی دینداری وەک نالی تەنیشت و ڕۆخی کەعبە بەرنەدا تا مردن. پیاوی وەک ئەو لە جێیانەوە دەچن بۆ مەککە تا گۆڕی مەرگیان لە نزیک کەعبە وەیا قەبری پێغەمبەر «ص» بێ، چۆن دەشێ ئەو بە پیریی لە سەرەمەرگدا ئەو جێگە پیرۆزە جێ بهێڵێ. بێگومان کە نالی لەو عومرەدا لە مەککە بووبێ هەر لەوێش ماوەتەوە تا مردن.

ئەمە شایەدیەکەی باپیرم. مایەوە ئەو هەڵبەستانە کە تیشکێکی ڕوونکەرەوەی هەندێ ئەو لایەنانەی باسمان کردن، دەدەنەوە. هەڵبەستەکان لە خۆیانەوە بە دەنگ نایەن، دەبێ لە ڕێی بەراوردکردنەوە بە دەنگیان بێنین.

لە دیوانەکەی نالی چەند قەصیدەی سکاڵا و نەعت هەن پێوەندییان بە حەج و مەککە و مەدینەوە هەیە. ورد بوونەوە لەو هەڵبەستانە دیاردەیێکی بە دەلالەت دێنێتەوە بەرچاو، بەڵام ووردبوونەوەکە دەبێ بە دڵ و هۆشی کرایەوە بێ، بە نیازی گەییشتنە حەقیقەتیش بێ نەک بۆ مەبەسی دەمەتەقە هەڵستاندن و ڕەخنەگرتن.

ئەو هەڵبەستانە لە ڕووی دەلالەتیانەوە بۆ کێشانی نەخشەیێکی خەتی بزووتنەوەی نالی دەکرێن بە دوو بەشەوە:

بەشی یەکەم ئەم پارچە هەڵبەستانەن:

١- ئەی ساکینی ڕیاضی مەدینە

٢-ئەلا ئەی نەفسی بوم ئاسا

٣- شتربانا

٤- لە جوملەی موعجیز ئەندەر موعجیز.

بەشی دووەم ئەم دوو پارچەیەیە:

١- وەی کە ڕووزەردی مەدینە و ڕووسیاهی مەککە خۆم

٢- ئەی تازە جەوان -مستزاد-

بەشی یەکەمیان چەند دروشمێکیان هەیە کە دەست دەدەن دەلالەتیان لێ وەربگیرێ بۆ تەرجیحی یەکێک لەو ڕایانەی دەربارەی چەندوچۆنی ژیانی نالی بە یەکتر دەکەونەوە. دروشمەکانیش ئەمانەن:

١- پێیانەوە دیارە کە هەڵبەستی یەکەم ڕووبەڕوو بوونی مەککە و مەدینەن:

ئەی ساکینی ڕیاضی مەدینەی مونەووەرە
ڕەحمێ بکە بفەرموو مەدینەی منە و وەرە
ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا هەتا کەی حیرصی وێرانە
لەگەڵ ئەم عیشق بازانە بڕۆ «ئازانە بازانە» / «بازانە ئازانە»

مسڵمان لێرە «مانی» / «مان و» / خا مانت هەر نەمان دێنێ
پەشیمان بە کە دەرمانی نەمانت «مایەی ئیمانە» / «مایەیی مانە»
فیداکاری تەن و جان بە لە ئاسانی هەراسان بە
کە داغ و دەردی ڕێگەی مەککە باغی وەردی مردانە
شتربانا ئەمە پەرژینی باغی ڕەوضەیە یاخۆ
عەرار و عەرعەر و بانی خیابانی بیابانە
ئەگەرچی کوردی دەوری شەهرەزووری قەسوەتم ئەمما
وەسیلەم طیبەیی حیلمی شەفیعی فەضلی مەننانە

ئەم بەیتەی دوایی وا دیار دەدا کە تازە بە تازە نالی شارەزووری جێ هێشتبێ بۆیە وەها هەستی زۆر بەهێزی شارەزووری بوونی خۆی دەخاتە ناو هەڵبەستەوە. ڕەنگە ئەگەر دەمێک با شارەزووری جێهێشتبا بە چەشنێکی تر ئاخاوتنی کردبا هەروەک نەختێک پاشتر لێی دەدوێین.

٢- ئاخ و کەسەری پیربوونیان تێدا نیە.

٣- باسی غەریبی و دوور کەوتنەوە لە وڵات ناکەن.

٤- وەصفی درێژ و پڕ مەعنای بیابانی ڕێگەی حەج و کەعبە و مەرقەدی پێغەمبەریان تێدایە کە ئەمەش هەر دەلالەتی یەکەم ڕووبەڕوو بوونیان بە دەستەوە دەدات.

بەشی دووەم لە قەصیدەکانی «وەی کە ڕووزەردی مەدینە»، «ئەی تازە جەوان» بە تەواویی نوقتەی بەرانبەری بەشی یەکەمە، چەندی بڵێی شەکوای پیریی و دەردی دەربەدەریی و شتی وەهایان تێدایە:

ئەی تازە جەوان پیر بی ئیفتادە و کەوتووم – تا ماوە حەیاتم
دەستێ بدەرە دەستی شکستم کە بەسەر چووم – قوربانی وەفاتم
تۆ یوسفی نەوحوسنی لەسەر میصری جەهانی – من پیرم و فانی
موددێکە کە هەم گەردوشی دەورانی سوپیهرم – موغبەڕ بوە میهرم

پیری و ئیفتادەیی لەم هەڵبەستەدا چ خزمایەتی هاوتەمەنی پێ ناهێڵێ هەم لەگەڵ قەصیدەکانی تر و هەم لەگەڵ نامەی «قوربانی تۆزی ڕێگەتم»دا هەروەهاش کە دەڵێ بەینێکە لەگەڵ سوڕانەوەی فەلەکدا دەسووڕێمەوە بە ئاشکرایی ئەوە ڕادەگەیەنێ کە دەمێکە لە وڵاتی خۆی دوور کەوتۆتەوە و لەم شار بۆ ئەو شار دەگەڕێ.

وەی کە ڕووزەردی مەدینە و ڕووسیاهی مەککە خۆم
دەرکراو و دەربەدەر یا ڕەب دەخیلی عەفوی تۆم

ئەم «دەرکراو و دەربەدەرە»ش تام و بێنی ئاوارەیی و غەریبی لێ دێت. جگە لەم لایەنەی پیری و دەربەدەریی کە لە دوو قەصیدەکەدا دیارە، شێوەی داڕشتن و خورپەی وشەکان و نەفەسی ئاخافتن و

هەموو ئەو خاسیەتانەی کە لە هەڵبەستدا دەبن بە تووڕە و شەقڵی ناسینەوە، زۆر بە ئاشکرایی دیارە هی تەمەنی پیرین، پیرانەن، دەنگی پایزی عومرن– بەتایبەتی قەصیدەی «ئەی تازە جەوان». لەمەوە ئاکامێکی گرنگ وەردەگیرێت، نالی لە یەک جاری حەج کردندا هەر دوو بەشی قەصیدەکانی نەهۆنیوەتەوە، بەشی یەکەمیان هی یەکەم حەج و سەرەتای دەرچوونیەتی لە سلێمانی، بەشی دوەمیشیان هی حەجی دووەمە کە درەنگتر لە پیریدا کردوەتی، هەر بۆیەشە لە بەشی دوەم وەصفی ڕێگەی حەج و کەعبە و ڕەوضەی پێغەمبەر نیە چونکە جاری یەکەم لەمانە بۆتەوە، ئەمجارەیان وەصفی شتێکی نوێتر دەکا کە لە بەشی یەکەمدا نادیترێت ئەویش پیریی و ئاوارەییە.

خوێنەری ئەم نووسینە کە دێت و قسەکانم دەداتە بەر سرنج و لێکدانەوەی قبوڵ کردنیان وەیا پێڕازی نەبوونیانەوە، دەبێ ئەمانەی لە بیر بێت:

١– ئیسپات کردنی پرسیارێک لەوانەی تەنها بەڵگەی فکر و لێکدانەوە پاڵپشتییان دەکات، هەر ئەوەندەی لێ چاوەڕوان دەکرێت کەوا بگونجێ لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی بە مەعلوومی ڕاستن و پێوەندییێکیان بە یەکەوە و بە پرسیارەکەشەوە هەیە وەک ڕوداوو، مێژوو، واتای شیعر و گوتە و ڕاگەیاندنەکانیان، باری مادی، داخوازی کۆمەڵایەتی، ڕامیاریی... هتد. بەڵگەی فیکری هەرگیز نابێتە ئەو دیوارەی کە لە چەمەنتۆ و خشت و بەرد دروست دەکرێت و دەست و چاو هەستی پێ دەکەن، هەروەهاش دۆزینەوەی تەمەنی شاعیر لە هەڵبەستدا کارێکە دەگەڕێتەوە بۆ زەوق و هەست و وردبینی گوێگر مەگەر هەڵبەستەکە خۆی تەمەنەکە ڕابگەیەنێ وەک: «تەمەنی عومرم بە حەفتا گەیی» وەیا شاعیری عەرەب کە دەڵێ: «ان الثمانین و بلغتها».

وەک تەمەن، دۆزینەوەی ئاوارەبوونیش هەر ئەوەندە دەکرێ کە لەو بەیتانەدا دۆزیمانەوە. نابێ بە تەمای ئەوە بین لەو دەمانەدا کە یەکێکی وەک نالی لە سۆزی خۆیەوە شکایەتی لە دەست غەریبی دەکرد بیگوتبا ئەی ئەوانەی لە دوا منەوە دێنە دونیا، بزانن من کە ئەمە دەڵێم بەینێکە لە شارەزوور دوور کەوتوومەتەوە و پیر بووم وەک ئەو کاتە نەماوم کە فلانە شیعر و فیسارە قەصیدەم تێدا داناون! تۆ و من و یەکێکی تریش ناچارین دەبێ باوەڕ بکەین بەوە کە کاتێک شاعیر شکایەت لە پیریی و غەریبی دەکات بەڕاستی پیر و غەریب بووە، مەگەر لە لایێکی ترەوە بەڵگەیێکی بێ دەمەتەقە پەیدا بێت و پێچەوانەی ڕاگەیاندنی ئەو شکایەتە ئیسپات بکات.

کە هاتین گومان بکەین لە ڕاگەیاندنی بەیتەکان لە لایەن واتای پیریی و غەریبییەوە، ئیتر بۆ باوەڕیان پێ بکەین لەوەدا کە لە مەککە و مەدینە گوترابن، خۆ ئەم ڕاگەیاندنەش دیواری چەمەنتۆ و ئاسن نیە نەتوانین بە ناویدا تێپەڕین و ئینکاری وجوودی بکەین. بەسە بۆ دەلالەتی گوتە –شیعر بێ یا پەخشان– بە لووس و لێکی لەگەڵ ڕووداو و مێژووی بێگومان بگونجێت بایی ئەو گونجانەی کە لە ژیانی ئاساییدا، لە نێوانی گوتە و ڕووداودا پێویستە. بە نموونەی ڕوونکردنەوەی مەبەس دەڵێم، تۆ کە لە یەکێکت بیست گوتی دوو کیلۆم ترێ کڕی نایەی گومان لە قسەکەی بکەیت و بڵێی ئەم داوایەت لەگەڵ دیاردەی جوغرافی و نەزەریەی فیثاغۆرس و چوونە ناو مانگدا ڕێک نایەت. هەر بیریش لەوە ناکەیتەوە چەندین هەزار شتی مادی و مەعنەویی هەن لەکاتی باس کردنی ئەم دوو کیلۆ ترێیەدا. ئەوەندە بەسە بۆ باوەڕ کردن کە کڕی ترێ گەییشتن هاتبێ و کڕی بەسەرچوونیشی تێ نەپەڕیبێت. قسەی شاعیریش هەروەهایە، بەڵگەی پتری لێ داوا ناکرێ لەو بەڵگەیەی کە لە «ترێ» داوادەکرێ. گونجانی دەلالەتی هەڵبەستی بێ مێژوو ئاشکرا

لەگەڵ داخوازیی ڕووداو و مێژووی مەعلووم و باری کۆمەڵایەتی... و هتاد بەڵگەیێکی یەکجار بەهێزە بۆ سەلماندنی ئەو ئەنجامانەی کە لێی وەردەگیرێن و چ بەڵگەش ڕەدیان ناکاتەوە.

٢- لە حاڵێکدا ویستت ڕازی نەبیت بەو لێکدانەوانەی کە هێندە ڕێک دێن لەگەڵ هەرچی دەیزانین، ئاگات لەوەبێ ئاخۆ جێگری ئەو لێکدانەوانە چیە؟ چی چاکتریان دەخەینە جێگا؟ ڕێت نیە بڵێی ڕەنگە وابێ و ڕەنگە وەکوو فلانە شت بێ و دەشێ...! پێویستە تەصورێکی نوێ بخەیتە جێگەی ئەو لێکدانەوانە کە پتر بگونجێت لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی ئەوان لەگەڵیاندا دەگونجێن. لە خۆت مەسەلێنە هەڵبەستەکان و ڕاگەیاندنەکانیان بخەیتە بەتاڵیی نەگونجان لەگەڵ هیچ شتێکدا. من ئەوەشت لێ دەسەلمێنم کە بە بەڵگەی مەعقول لێکدانەوەکەم هەڵوەشێنیتەوە با پێشت نەکرێ جێگرێک پەیدا کەیت بۆ لێکدانەوە هەڵوەشایەوەکە، چونکە هەڵوەشاندنەوەی بە بنج و بناوان وەک گومانکردنی بێ بنج و بناوان نیە، بە پێچەوانە ئەم تەرزە کارەی بە بنج و بناوان دەبێتە سەرەتای چالاکیەکی دروستکەر.

٣- لێکدانەوەی ناو ئەم نووسینە بەراورد بکە لەگەڵ ئەو بیروباوەڕانەی کە بە بەڵگەی بێ دەمەتەقە ڕەد کرانەوە تاکو تۆش لە حاڵی ڕەدکردنەوەی لێکدانەوەکەم لەهەمان ڕێگەی بێ پێچ و پەنای بەڵگانەوە هەنگاو هەڵێنیت وەک کە دیتت شایەدیەکەی «ئا. خۆدزکو» بە جارێک ئەو ئیحتیمالەی سڕیەوە کە نالی لە ١٨٥٥ لە ئەستەمبوڵ مردبێ. سەرەڕای ئەمانە هەموو، لە بیرت بێ پیاوێکی وەک حاجی مەلا عەبدوڵڵا لە هەواوە قسە ناهێنێ تەنانەت لە قسەکەی ئەوەوە دەردەکەوێ کە لە ڕۆژگاری ئەودا هەر نەبیسترابوو کە نالی مردووە، دەنا ئیشارەی بۆ ئەو گوتەیە دەکرد و لە هەڵوەستی بە درۆخستنەوەی خەبەرەکەدا دەیگوت دیتوومە و زیندووە و... هتاد، چونکە دەزانین لە نێوان ساڵی ١٨٥٥ (١٢٧١، ١٢٧٢) کە ساڵە درۆزنەکەی مەرگی نالییە تا ١٢٨٩ کە حاجی مەلا عەبدوڵڵا لە حەج گەڕاوەتەوە بۆ کۆیێ، دەوری ١٧ ساڵ هەیە، ئەمەش دە جاران بایی ئەوە دەکات خەبەرەکە بگاتە هەموو شوێنێکی کوردستان. نەبوونی بەدرۆ خستنەوەی ئەم خەبەرە لە لایەن حاجی مەلا عەبدوڵڵاوە بەڵگەی نەبوونی خەبەرەکەیە. دیارە دواتر دەنگوباسی وەها لە سەرچاوەیێکی نەشارەزاوە کەوتۆتە سەر زار و زمانان.

لێرەدا شتێکم بە خەیاڵدا دێت لە بارەی کەوتنەوەی خەبەری هەڵەوە: دیوانەکەی نالی چاپکراوی عەلی موقبیل و گیو موکریانی کە دەڵێ لە ١٢٥٥ نالی لە شامەوە بەرەو ئەستەمبوڵ ڕۆیی ئەگەر بیگوتبا لە ١٨٥٥ ڕۆیشتووە قسەکە جێی باوەڕ کردن دەبوو و هیچ بەرهەڵستێکی نەدەهاتەبەر. تۆ بڵێی لە کاتی خۆیدا ئەم خەبەرە نەی گوتبێ ساڵی ١٨٥٥؟ دواتریش بە هەڵە کرابێتە ١٢٥٥؟ من بە دووری نازانم، سەهووی وەهاش زۆر جاران ڕووی داوە، تەنانەت وا بووە ناوێک بە یەکێکی وەک خۆی گۆڕاوە و دەماودەمیش بە هەڵە ڕۆییشتوە و چۆتە ناو کتێبانیشەوە.

من لە تەصورمدا یەک گرفت هەیە کە ناتوانم بیرەوێنمەوە ئەویش هەنگاوی نالی دوای جێهێشتنی شامە. ئایا گەڕایەوە بۆ ئەستەمبوڵ یاخود هەر لەوێ مایەوە تا دوو جار بەرەو حیجاز بۆوە و هەتا مەرگ تێیدا بەسەری برد! ئەم ١٩ ساڵەی نێوان ١٨٥٣ و ئەو دەمەی باپیرم نالی لە مەککە دیوە ١٨٧٢ بایی ئەوە دەکات لە شامەوە چووبێتەوە ئەستەمبوڵ و بەینێکی لەوێ ڕابواردبێ و دواتر، بابڵێیین دوای ١٠ ساڵ، سەودای دوەم حەج بەرەو حیجازی بردبێتەوە، بەڵام چ بنگەی مادی وەیا لێکدانەوە وەیا ڕاگەیاندنی حاڵ وەیا هێمای شیعرەکانی ئەم ئیحتیمالە بەسەر یەکێکی تردا زاڵ ناکات کە ئەویش لەگەڵ ڕووداو و مێژووی بێگوماندا بگونجێت. ئێمە پێویستمان بە خەبەرێکی تازە هەیە ئەم قۆناغەی ژیانی نالی

له شام بهاوێته ناو نەخشەی سەرلەبەری ژیان و جێگەی لەباری بۆ بدۆزێتەوە. لەم باسەی هاتوچۆی نالی و پیربوون و ئاوارەبوونی، ناوناوە بە پەلە گوتومە نالی ژنی نەهێناوە. لەمەشدا دژی گەلێک سەرچاوەی بەسەرهاتی نالی ڕادەوەستم کە دەڵێن حەبیبەی «ماڵی ئاوا»ی مارە کردوە و تا مردنی هەر عاشقی بووە...

له بارەی دێی «ماڵی ئاوا»وە ئەوەمان بەدرۆ خستەوە کە لە قەرەداغ دێی بەو ناوە هەبێ. بیستوومە دێیەک هەیە لەو ناوچەیەدا بە ناوی «ئالیاوا» ئەویش دێیەکی نوێیە بە بیری خەڵقەکە دێت کەی ئاوەدان کراوەتەوە. هەندێک ئەدیب و نالیدۆست هەن دەڵێن نە «حەبیبە» هەبووە و نە «ماڵی ئاوا»ش لەو وڵاتەی دەوروبەری شارەزوور ناوی هەیە. بەڵام ئەم گوتەیە لە دوو سەرەوە ڕووبەڕووی هەرا و دەمەتەقەی بێوەرام دەبێ. یەکێکیان ئەو تەواتورەیە کە هەمیشە باسی حەز لێکردەیی نالی و حەبیبەی گێڕاوەتەوە. دوەمیان ئەو هەموو ناوی «حەبیبە» و «ماڵی ئاوا»یەیە لە دیوانەکەی نالیدا کە مومکین نیە بەو جۆرە قسەی بێ بنج و بناوان بسڕێتەوە. کە ڕێگە هەبێ بە قسەی سادەی بێ بەڵگە جووتە خەبەری یەکتر تەصدیق کردووی تەواتور و دیوانی نالی ڕەشبکرێتەوە چ مانیعێک نامێنێ لەوەدا «خاک و خۆڵ»یش بکرێتە ناوێکی خەیاڵی (وا بزانم ئێستا ئاوەدان نیە)، هەموو دەنگوباسی چوونە حەج و دوورکەوتنەوە و واتاکانی «قوربانی تۆزی ڕێگەتم» و هەرچی تریش هەیە بدرێنە بەر ئەم ئینکار کردنەی بەهەوەس بێگومان نالی ئاگری عیشقی حەبیبەی تێ بەربوە، تەنها ئیحتیمالێک هەیە لەوەدا کە دەشێ ناوی کچەکە حەبیبە نەبووبێ و نالی ئەم ناوەی کردبێتە پەرژین بە دەوری ئابڕوی کچەکەوە کە لە هەمان کاتیشدا واتاکەی دەست دەدات بۆ دەربڕینی هەموو هەست و سۆزێکی عاشقانە بە دیاریەوە. دیوانەکەی نالی لە گەلێ جێگەدا ناوی حەبیبە دەبات و وتووێژی ئاگرینی عیشقی لەگەڵدا دەکات. تێکڕاشیان، یەک ئاهەنگ و یەک دەنگ، هەبوونی مەعشووقەیێکی ڕاستەقینە ڕادەگەیەنن بەڵام لە لایەنی دەلالەتی صەریحەوە غەزەلەکەی «ماتەم وەکو زولفەینی سیەه» بە تەنها خۆی بەسە بۆ سەلماندنی هەبوونی مەعشووقەی باوک مردوو. یەکێک بیەوێ بە ووردی ئەو غەزەلانەی ڕووی قسەیان لە حەبیبەیە بە یەکتر بگرێ، بە ئاشکرایی تارمایی یەک تاکە کچیان تێدا دەبینێت کە هەر خۆیەتی هەموو جارێک لە هەڵبەستدا جلوە دەبەستێ. ئەوەی ڕاستی بێ، لێکۆڵینەوە لەم غەزەلانە و چەندوچۆنی دەنگدانەوەی ناوەکییان دەشێ بکرێ بە دیراسەیێکی سەربەخۆ کە دیارە لێرەدا جێی نابێتەوە، لەوەش بکۆڵرێتەوە ئاخۆ ئەو هەموو شکاتەی نالی لە دەست بێ مەیلی مەعشووقەکەی، چەندی ڕاستە و چەندی شۆخییە و چەندی تەقلیدێکی دڵدارانەیە لە حاڵێکدا خۆی تێمان دەگەیەنێ کە یارەکەی مردنی باوکی خۆی بە ئاوات خواستوە تاکو بە نالی ببڕێ. ئەمە سێ چوار نموونەی ئازارکێشانە بە دەست بێ مەیلی مەعشووقەوە:

ئاخ لەگەڵ ئێمە حەبیبە سەری پەیوەندی نیە
نەی شەکەر قەددە / «بەڵابەندی هەیە قەندی نیە» / «بەڵاقەندی هەیە بەندێ نیە»
لەبۆ خەڵکی خەڵات پەخشانی ماچە
خەڵاتی من هەموو خۆ جوێنە قوربان
لەحزەیێک و لەمحەیێ چاوم بە چاوی ناکەوێ
کێ دەڵێ وەحشی غەزالە مەیلی ئینسانی هەیە

له صوبحی روویی تۆوە شامی خەلقی طەلعەتی صوبحە
له شامی زولفی تۆوە صوبحی ئێمە ظولمەتی شامە

ئایا ئەمانە، هی تریش، هەڵبەستی سەرەتای عیشقی نالین کە جارێ حەبیبە ئاسوودەیە لە گڕ و تاوی عیشق و گرفتاری داوی ئەفسوونی نالی نەبووە؟ یا تەئویلێکی تری هەیە؟ یاخود هیچ دەلالەتیان نیە؟ تۆ بڵێی داد و فیغانی غەزەلە ئاگرینەکەی: «نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ تۆ» پێوەندی بە کام پلەی ئەو عیشقەوە هەبێ؟ ئاخۆ دواتر چ تروسکەیێکی ئومێد لە دڵی نالیدا گەشاوەتەوە، یاخود دووری دو ساڵانەی ناو غەزەلەکە کە لەم بەیتەدا بەدیی دەکرێت:

هەموو ڕۆژم لە تاو هیجرانی ئەمساڵ
تەمەننای مردنی پێرارە بێ تۆ

بۆ بە دەست لێکبەردانێکی یەکجاریی؟ ئەم بێ ئومێدییە چ دەخلێکی هەبوە بەسەر جێ هێشتنی وڵات بەرەو حەج؟ ساغ کردنەوەی ئەم پرسیارانە بە ئەرک و کات و لێکدانەوەیێکی کەم ناکرێت، هەتا زەمانەش لە نالی دوورتر دەکەوێتەوە کارەکە زەحمەتتر دەبێ، بەڵام دەبێ بزانین ئەم بەیتانە و غەزەلانە و بەیت و غەزەلی تر کە لەمانە ناکەن هەروەها کەڕ و لاڵ و بێ دەلالەت نین وەک خوێندنەوەی بەپەلە و سەرپێیی تێیان دەگا– چاکتر ئەوەیە بڵێم تێیان ناگا. خستنەوە سەریەکی دەنگ و صەدای ناو دیوانەکەی نالی تا ئەو ڕادەیەی وتووێژێکی مەفهووم و مەعقوولی لێ وەردەگیرێ کە لەگەڵ ڕووداو و مێژووی زانراودا دەگونجێ، ئەو کارە ئاسانە نیە کە زەینی بە پەلە بۆی دەچێت هەروەک حاڵی بوون لە شیعرەکانی فەرمانێکی هێندە سادە و ساکار نیە کە بەزانینی واتای وشەکانی پێک بێت. ئێمە ئەگەر لیستەش ڕێک خەین بۆ ئەو هەڵبەستانەی ناوی حەبیبەیان تێدایە و ئەوانەی شکاتی بێمەیلی مەعشووقە دەکەن و ئەوانەی پێوەندی دولانەی عاشق و مەعشووق دەگێڕنەوە و ئەوانەی بێ ئومێدییان لێ دەفامرێتەوە ناتوانین بە تێوە ڕامان لەو لیستەیە تێ بگەین و تێگەییشتنەکە بکەین بە تصورێکی سەرانسەر و جێگەی قەناعەت و بێ کەلێن، هەروەک ڕێکخستنی فەرهەنگۆک لەو شتانەی واتایان زەحمەتە چ مەودایێکمان نزیک ناکاتەوە لە واتای شیعرەکان مەگەر مەودایێکی یەکجار کورت، چونکە لەوانەیە بەیتێکی لە هەموان وشەئاسانتری نالی لە هەموان واتاسەختتر بێت، وەک ئەم بەیتەیان:

تیژاوی سروشکم وەکو ئیکسیری سوهەیلە
ڕوخسارەیی زەردم وەکو ئەوراقی خەزانە

لە فەرزی زانیشت ئیکسیری سوهەیل غەیری واتا ئاشکراکەی دوو وشەی «ئیکسیر و سوهەیل» کە هەموو شیعردۆست دەیزانن، واتای تریشی هەیە لەوانەی مەیلە و داپۆشراو وەک ئەوەی پایزان کاتێک ئەستێرەی سوهەیل هەڵات و شەوقی بەر پەلکە قەمیش کەوت پەلکەکە سوور هەڵدەگەڕێ وەیاخود شاعیری فارس دەڵێ ئەم شەوقەی سوهەیل کە بە پێستی سەختیان دەکەوێ: «جای انبان می کند جای

ادیم» دیاره ڕووی نالیش پێسته و ئیکسیری سوهەیلی پێ کەوتوە کە دەشێ فرمێسکی بێ وەیا شەوقی سوهەیل بێ، چاویش بۆ خۆی بە ئەستێرە تەشبیه دەکرێ... ئەمانە هەموو بزانیت جارێ بەیتەکەت نەزانیوە. بەیتی تریش هەیە هەتا لە واتای وشەکانی پتر دەگەیت لە واتای بەیتەکە پتر سەرگەردان دەبیت. خولاسە ئەم حیکایەتەی عیشق و ئومێد و نەومیدیی و واتای بەیتەکانی نالی تەنکاویک نیە نەختێک دامەنی جلکەکانمانی بۆ هەڵکەین و لێی بپەڕینەوە.

ئەمە لەلایەن بوونی مەعشووقە و ناوی حەبیبەوە، لەلایەن «ماڵیاوا»شەوە وا دەزانم دەبێ هەر ئەو دێیە بچکۆلەیە بێت لە نزیکی بەرزنجە کە ناوی «مایياوا»یە و شاخەکەشی هەر بە ناوی ئەوەوە ناوی دێت. زێوەر لە زیمنی مەدحی بەرزنجەدا کە سەرەتاکەی ئەم مەصرەعەیە: «خاکی بەرزنجە چەندە دڵگیرە» ئەم بەیتە دەڵێ:

کوڕەکاژاو و شاخی مایياوە
سەیری دەشتی هەمووی جەلای چاوە

وا بزانم دوور نیە لەو سەردەمەدا کە نالی نزیکی ئەو دەوروو‌بەرە بوە ناوی دێیەکە «ماڵیاوا» بووبێت و بە تێپەڕینی کات گۆڕابێت، وەیاخود نالی وای بەڕاست زانیبێ کە ناوی دێیەکە لە بنەڕەتدا «ماڵیاوا» بووبێت وەک کە بۆ خۆم لە نووسینی مەلا عەبدورڕەحمانی کاکی جەلیم دیتووە نووسیوەتی «قريه ما وراء النهر» مەبەسیشی دێی «ماوەران» بوە، دیارە وای زانیوە کە ئەصلەکەی ئەوە بووە خۆی نووسیوەتی. ئەمەش نەبێ دەشێ نالی بە نیازی واتا سازیی، ناوەکەی لە «مایياوە» کردبێتە «ماڵیاوا» بۆ دروست کردنی جیناس لە نێوان «ماڵیاوا و ماڵی ئاوا»دا.

ناوی ئەو کچەی خۆشییستوە هەرچی دەبێ با ببێ، دێیەکەشی هەر ناوێک بە خۆیەوە دەنێ با بنێ، ئەو پرسیارە دەمێنێتەوە ئاخۆ نالی بەو کچە شاد بوە؟

من نازانم سەروکاری حەبیبە بە چی گەیشتووە، بەلامەوە دوو شت ڕوونە:

یەکەم: باوکی حەبیبە ڕازیی نەبووە کچەکە بدا بە نالی– وەک لەمەوپێش ڕوونمان کردەوە– ناشزانین دوای مەرگی ئەو بابە خوێنەستێنی کچەکە چیان بڕیار داوە.

دوەم: نالی لە بنەڕەتدا ژنی نەهێناوە تاکو سەرەنجامی عیشقی حەبیبەمان لێ ببێتە گرفت. ئەوانەی دەڵێن نالی ژنی هێناوە و لەگەڵی بوە تا کۆتایی ژیانی قسەیێکی ڕەشۆکی بێ بنج دەکەن کە لەگەڵ مەنتیقدا ڕێک ناکەوێت. جارێ با لەوە بگەڕێین کە لێیان بپرسین کوا ئەو ئیسپاتەی ئیقناعمان دەکا بەوەی خوێنەستێنی حەبیبە دوای مەرگی باوکی ڕازیی بوون پێی بدەن، ئەوەشیان لێ ناکەینە زەحمەتێکی سەربار کە بلێین نالی بەو هەموو غەزەلە صەریحە و ناوهێنانی حەبیبە بەجارێ ڕێی گەیشتنی بە حەبیبەی لە ڕووی خۆی کوێر کردۆتەوە. ئەمانە واز لێ دێنین و بەرەنگاری ئەم تاکە پرسیارەیان دەکەین: ئایا ئێوە لەوە فکریوون کە ئەگەر نالی حەبیبەی لەگەڵ خۆی بردبێ بۆ سەفەری حەج، دەبێ لەوێشەوە بردبێتی بۆ شام و بۆ ئەستەمبوڵ و سەرلەنوێ هێنابێتیەوە بۆ مەککە لەو هەموو هاتوچۆیەشدا مرۆڤێکی بێ پارەی بێ حاڵوبار و بێ یارمەتیدەر بوە، بەشێکی سەفەرە درێژەکەشی دەکەوێتە تەمەنی پیریی؟ لەمەش پتر پرسیار هەڵدەستێ: نالی کە چووە بۆ حەج خۆی نەیدەزانی لەو

سەفەرە ناگەڕێتەوە تاکو مەجبور بێ ژنی لەگەڵ خۆیدا ببات، لە حاڵێکدا دەزانین لە هەزاری یەکێکی پیاوی دەوڵەمەندیش ژنیان بۆ حەج نابەن. سەیری وەزعی نالی بکەن بە چاوێکی واقیع بین دەزانن و تێدەگەن ئەگەر نالی قەفەسی تووتییێکی لێ بووبایە بار گرانی پێ نەدەکرا ئەو هەموو هاتوچۆیە بکا، بگرە لە یەکەم جارەوە نەی دەتوانی لە سلێمانی بەدەرکەوێ. هەموو ئەو کوردانەی کە لە کوردستانی عێراقەوە بەرەو دەرەوەی وڵات ڕۆیشتوون بێ ژن و ماڵ بوون مەگەر ئەوانەی حاڵ و وەزعی تێریان هەبووبێت.

لێرەدا دەتوانین، بە تایبەتی، بەراوردی حاڵی نالی بکەین لەگەڵ هی حاجی قادر کە ئەویش بە ڕەبەنی بۆی دەرچوو. تایبەتەکەش لەوەدایە هەردووکیان شیعرەکانیان بە ئەولاد داناوە. حاجی دەڵێ «لە سایەی شیعرەکان بابی کوڕانم». نالیش لە چەند جێگەیەکدا ئەم دڵدانەوەی خۆی کردووە:

شیعرەکانم کە جگەرگۆشی منن، دەربەدەرن
دڵی نالی چ ڕەقە قەت غەمی فرزەندی نیە
لە جگەرگۆشەیی شیعرم مەدە مەعنایی خراپ...

سەرانسەری دیوانەکەی بە وردیی تەماشا بکە چ هێمایەکیش نادۆزیتەوە ببێتە دەلیلی هەبوونی ماڵوحاڵێکی نالی، تەنانەت حاجی مەلا عەبدوڵڵاش کە باسی نالیی کردوە شتی وای لێ گێڕاوەتەوە کە لەگەڵ مرۆڤی بێ ژن و منداڵدا بگونجێت.

نووسینەکەی «ئا. خۆدزکو» گەلێک جار ناوی هات و سوودی لێ وەرگیرا. مایەوە سوودێکی تریش بخەینە بەر ڕۆشنایی لێ دوانەوە. لەو قسانەی کە لە ئەحمەدخانی دەگێڕێتەوە باسی ئەوەی تێدایە کە نالی کتێبی لەسەر زمانی کوردی دانابێ. ئەم خەبەرە خۆی لە خۆیدا جێی باوەڕ پێ کردنە ئەگەر هیچ بەڵگەش لە لاوە پەیدا نەبێت بۆ سەلماندنی. خۆشبەختانە، خەبەرێک هەیە هەم نوێ و هەم دەشێ ببێتە پاڵپشتی قسەکەی ئەحمەدخان.

خوالێخۆش بووی مەلا محەمەدی مەلا ئیبراهیم «دلاوەر» دەیگێڕایەوە کەوا لە نێوان فەقێیان سیپارەیێکی قەواعید بە هەڵبەستی کوردی لە نالییەوە نەقڵ دەکرا هەموو مەبحەسی «حروف»ی کتێبی «شەرحە موغنی» تێدا بوو. «دلاوەر» بۆ خۆی تاکە یەک بەیتی ئەو سیپارەیەی لە بیر مابوو کە میسالی «البر الکر بستین درهما»ی هێناوەتە سەر هەڵبەستی کوردیی، ئەمەش بەیتەکەیە:

گۆشتی قەڵەو حُقّە بە چواردە پارە
وەقتێ گوتت حُقّە ضەمیر دیارە

لە میسالەکەی عەرەبیدا ضەمیرێک قرتاوە کە دەبوو بگوترێ «... الکر منە»، دیارە لە بەیتەکەی نالیش بە پێی ڕوون کردنەوەی مەصرەعی دووەم دەبوو بگوترێ «... حقەی بە چواردە پارە» کە لەوێشدا ضەمیرێک قرتاوە.

وا پێ دەچێ ئەم سیپارەیە لە ناودا نەمابێت، وەیاخود ئەگەر مابێت لە پەناو پەسێوی قوژبنە تاریکەکانی مزگەوت و مەدرەساندا لە ژێر تۆزدا خنکابێت. بەڕاستی حەیفە ئەسەری وەها نایاب لەبەر

کەمتەرخەمی وەیا بێ هەستی تێ بچێت. بەڵکو لە لایێکەوە دەنگوباسێکی وەیا شوێن و ڕێگایەکی بەسەر بکرێتەوە. بە هەمە حاڵ ئەم سەرگوزشتە پەرۆشی نالی بە زمانی کوردییەوە نیشان دەدات، وێڕای پایەی لە زمان و ئەدەبدا، تا ڕادەیەکیش وەرامی ئەو کەسانە دەداتەوە کە نالی بە کەمتەرخەم دادەنێن لە ئاست کوردایەتی چونکە بەم خەبەرە دەردەکەوێت نالی یەکێک بوە لە ناو چەند کەسێک کەوا ڕەنگە بە پەنجەی یەک دەست بژمێردرێن، لەوانەی خۆیان بە زمانی کوردییەوە خەریک کردبێ لە دەرەوەی جغزی شیعری عاتفی. بزر بوونی سیپارەکە ئەوەش لە قەناعەت نێزیکتر دەخاتەوە کەوا بەشێکی هەڵبەستەکانی عاتیفی فۆتابن بە دووریشی نازانم نالی زۆروکەم لەو سیپارەیەدا چاوێکی بڕیبێتە مەعرووفی نۆدەهی لەودا کە پێشتر فەرهەنگۆکی ئەحمەدییەی بە کوردی دانا بوو.

مەرحووم «دلاوەر» ئەوەشی لە باسی نالی دەگێڕایەوە کە کاتێک هاتۆتە کۆیێ بۆ خوێندن ویستوەتی لە مزگەوتی «بایزاغا» دامەزرێ، بەڵام مەلای ئەوساکەی مزگەوتەکە لەبەر شۆرەتی شاعیریەتی نالی لەوە ترساوە مەلایەتیەکەشی وەها بەهێز بێت و لە کاتی دەرس گوتنەوەدا زۆری ماندوو بکات ئیتر بە بەهانەی نەبوونی جێگە دای نەکردوە. لەوە بەلاوە نازانم ئایا چۆتە مزگەوتێکی تر ویا هەر بە جارێ لە کۆیێ دەرچووە.

بەر لەوە خوێنەر لە پێشەکیەکەوە بۆ ناوەڕۆکی کتێبەکە بڕوات، بە شکڵی پێش دەستی، یەک دوو تێبینی دەهێنمە پێش نیگای: لەبارەی خێرایی کردنی نالی لە حەج ڕایەکم دەربڕیوە، ئەوەی ڕاستی بێ، لەسەر بنیچەی ساڵی ١٨٣٠ هەڵستاوە کە بە پێی قسەی نووسەری لەمن بە پێشەوەتر حەجەکە لەو ساڵەدا بوە هەرچەند لە کاتی دەربڕینی ئەو ڕایەدا باسی ساڵەکەی ١٨٣٠ نەشکراوە.

لەم پێشەکیەدا، بە تۆژینەوە و ساغ کردنەوە، گەیشتم بەو ئەنجامە کە سەفەرەکەی حەجی پاش ساڵی ١٢٥٤ (١٨٣٨، ١٨٣٩) ڕووی داوە، پتریش بۆ ئەوە چووم کە نابێ لە ساڵێک زیاتر پێش بەسەرچوونی حاکمایەتی بابان لە ١٢٦١ سەفەرەکەی حەجی کردبێ. ئەم لێکدانەوەیەم بە لای کەمەوە حەجەکە ١٢ ساڵان بەم لاوەی ١٨٣٠ دێنێ. بەو پێیە خێرایی کردنی نالی لە حەج دەبێ بدرێتە بەر دەلالەتی تەمەنی ٤٥ ساڵی نەک ٣٣ ساڵی.

لە شوێنێکی تردا گوتومە مەشرەبی نالی لە تەصەوفدا قادریی بووە نەک نەقشبەندیی. لە ئاست ئەم بیروڕایەدا دەبێ فەرامۆش نەکەین نالی لە تەکیەی مەولانا خالید خوێندوویەتی کە دەزانین مەلانا سەرۆکی تەریقەتی نەقشبەندیی بووە لە سەردەمی خۆییدا. لەمەوە دەشێ بیر بۆ ئەوە بڕوا کە وا نالی نەقشبەندیی بووبێ نەک قادریی. بەڵام بەر لەوەی ڕایەکەی من هەڵوەشێتەوە، دەبێ ئەوە بزانین کە خوێندنی نالی لە تەکەییەی مەولانا دوای دەرچوونی مەولانا بوە لە سلێمانی. کەواتە لێکدانەوەکە و بڕیاری قادریی بوون و نەقشبەندیی بوونی نالی بە هۆی زانینی مەشرەبی ئەو مامۆستایانەوە ساغ دەکرێتەوە کە نالی دەرسی خوێندوە لەلایان.

خوێنەری بەڕێز دەبینێ سەرلەبەری نووسینەکە پەلەی لێ کراوە. بە عادەت تۆژینەوە لە ئەدەب و ژیانی شاعیرێکی وەک نالی کاری چەند ساڵ خەریک بوون و کەرستە کۆکردنەوە و پرسین و لێکدانەوە و بەیەکترگرتن و بەراوردکردن و ئەوان تەرزە چالاکییانەیە، لە حاڵێکدا ئەم نووسینە لە سەرەتاوە زەنەی عەفویی «نالیدۆستی» بوە لە ویژدانی خاوەنەکەیەوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا زەنەی ویژدان لە پاشخانێکی بەرین و قووڵەوە تەرەشقۆی کردووە و بەسەر دیوانی شیعر و مێژووی بەردەستدا خۆی بڵاو کردۆتەوە.

لەم ڕووەوە عەیبی پەلەکردنەکە ئەو عەیبە ڕووت و قووتە نیە کە لە کاری سەرپێییدا بەدەر دەکەوێت. پەلە کردن شتێکە و سەرپێی (ارتجال)یش شتێکی ترە. هەموو جارانیش مرۆڤ ئەو کات و دەرفەتەی چەند ساڵە شک نابات کاری ئەمرۆکەی بۆ بخاتە ساڵێکی تر، لەو حاڵوبارەی منیشی تێدام، کە وا پەیتا پەیتا بە پێی بەرپرسیارییێکی ڕووی تێ کردووم، بەرەنگاری واجبی یەک لەسەر یەک دەبم هەر بە جارێ ماوەم نابێ خۆتەرخان کردووی تاکە یەک ئەرک بکەم بۆ چەند ساڵێک، بگرە یەک دوو مانگیش. لەگەڵ ئەم تێبینیانەشدا ئەو ڕاستییە هەر باقییە کە بەرهەم، بەری عەفویەت بێ یا کورک بوونی چەند ساڵان بێ، نرخی زاتی خۆی دەدرێتێ نەک ئەو کاتەی خاوەنەکەی پێوەی خەریک بووە، چی هەیشە وا لە پێش چاوی خوێنەر و ڕۆشنبیرانی کورددایە نە زەڕرەیێکی لێ شاردوونەوە و نە ڕێی دەرخستنی هیچ ڕاستیی و نهێنییێکی لەبەر هەنگاوی کەسدا کوێر کردۆتەوە، تەنانەت ئاشکراییەکەی لە ڕادەیێکدایە هەر دەڵێی شتێکە لەو شتانەی بەر مەفهوومی ئەم دێرە شیعرەی نالی دەکەون:

ئەعمالمان لەگەڵ هەموو ئەوزاعی حاڵمان
مەخشووش و جەمع و حازرە گەر خێر ئەگەر شەڕە

لە کۆتایی ئەم پێشەکییەدا، پەیڕەوی شاکارێکی نالی دەکەم کە لە ئاکامی مەهارەتی بێسنووردا سەر و بنی بەیتەکە گەیشتۆتەوە یەکتر بە جۆرێک ئەو کۆتایی هێنانەی کە لە ڕواڵەتدا داخوازیی بەیتەکەیە، دەبێتە دەستپێکردنەوە و تێهەڵچوونەوەیێکی سەرلەنوێ و بێبڕانەوە، وەک کارەکەی من لەم نووسینەدا، کە ئەگەر غەدری لێ نەکەم دەبێ بیکەم بە یەکەم پێپلیکەی پەیژەیێکی لێکۆڵینەوە لە ئەدەب و شیعر و بەسەرهاتی نالی، ئەگەر لەویان سەرکەوتم هەنگاوم بگاتە هی دواتر و دواتر... لەگەڵ منیشدا خوێنەرانی ئەدەبی کوردیی و نالیدۆستان:

نیشانەی پوختەگی بێدەنگییە نالی ئەگەر پوختەی
بە حوججەت / «حجة» / طەی بکە نامە بە حیددەت پەی بکە خامە

«بە حجة نامە طەی کردن» هەروەک لە زاهیردا بە توندی پێچانەوەی نامە ڕادەگەیەنێ، لە ڕاستیدا ئەوەی مەبەستە کە وا نامەکەت وەها بگەیەنە سەر کە ببێتە «حجة» و بەڵگە بە هۆی تەواویی و بێ عەیبییەوە.

«بە حیددەت پەی کردنی خامە» ئەویش لە زاهیردا بە هەژمەت شکاندنی قەڵەمەکەی ڕادەگەیەنێ، بەڵام واتاکەی ڕاست و دروستی هەڵبەست پێچەوانەی ئەمەیە، چونکە لە ڕێی تەوریەوە دەیەوێ بڵێ قەڵەمەکەت بۆ تیژکردنەوە دادە تاکو باشتر بنووسیت:

«بە حیددەت پەی بکە خامە-بە تیژی ببڕە قەڵەمەکەت». نامە طەی کردنەکە و خامە پەی کردنەکەش هەردووکیان خامۆشن، دەنگیان لەبەرەوە نایێ، بەڵام بە برشتن کە ئەمە ئەوپەڕی پوختە بوون و پێگەییشتنە.

چ دەرسێکی بەنرخە ئەم پەندەی «بەخشینی بێ دەنگ»!!

تێبینی:

خوێنەر بم بەخشێ لەوەدا وابووە یەک بەیت بە دوو شکل نووسراوە کە هەریەکەیان لە دەسنووسێکەوە هاتوە و هیچیشیان تا ئێستا ساغ نەکراوەتەوە.

ئومێد دەکەم ئەم پێویستەی ساغ کردنەوەی شیعرەکانی نالی لە دوارۆژێکی مەیلە و نێزیکدا لە لایەن کۆڕی زانیاری کوردەوە ئەنجام بدرێت.

## بەشی یەکەم

ئەرکێکی پڕ تام و شامی سەر شانی لیژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کورد لێکۆڵینەوە و تۆژینەوەی دیوانی «نالی»یە. پرۆگرامی لیژنە لەم مەیدانەدا، وەک لێی چاوەڕوان دەکرێت، ئەوەیە دوا بە دوای بژارکردن و ساغ کردنەوەی دیوانی حاجی قادر، کات و چالاکیی خۆی تەرخان بکا بۆ ڕاست کردنەوە و شی کردنەوەی شیعرەکانی نالی لە گوێرەی دەسەڵات و تێ بڕکردنی هۆش. دیارە بە دەم ئەم کارەوە، لیژنە چی دەستی کەوێ لە شیعری بڵاونەکراوی نالی ئەویش دەخاتەوە سەر خەرمانی دیوانەکەی.

لەنێوانی ئەندامانی کارای کۆڕدا ئەم فەرمانە ڕووی لە مامۆستا هەژار و لە من کرد کە هەردوومان ئەندامیشین لە لیژنەی ئەدەب. بەم بۆنەوە هەڵکەوت و ڕێکەوت لە جاران پتر خۆ بە دەستمانەوە دەدا بۆ تەڕکردنەوەی دەماغ و زاخاودانی مێشک و ڕەواندنەوەی کەسەر لە ڕێی خەریک بوون و یەکتر خەریک کردن بە دۆزینەوە و هەڵهێنانی گەوهەرە شراوەکان و مەتەڵاویەکان و ئەفسووناوییەکانی تاک تاکە بەیت و دوو بەیتی ئەم غەزەلە و ئەو قەسیدەیەی کەوا دەماودەم لە نێوان شیعردۆستاندا ناوبانگی شراوەیی و نەزانراوییان گەیشتۆتە ڕادەی «یقین» و سەلماندن. وا دەبێ کە بەختی لەبار یارمەتیمان دەدا و بەسەر یەکێک لەو گەوهەرانەدا دەکەوین و ڕواڵەتێکی واتا نهێنێکەی لە زیهنماندا دەتریسکێتەوە، سمێڵە خنکەی شادمانی دەمانگەشێنێتەوە، هەر دەڵێی شیری مووسامان دۆزیوەتەوە خۆشمان لەوەدا لەسەر هەق دەزانین چونکە باوەڕمان هەیە بەوە کە «نالی» شاهکاری ئەوتۆی بە میرات بۆ گەنجینەی ئەدەبی کوردیی بەجێ هێشتووە هاوتای نرخدارترین گەوهەری ئەدەبی ڕۆژهەڵاتە کە پسپۆڕ و دوورناسان بژاردەی بکەن، ئەگەر نەڵێم ژوورووی هەموانە.

بەم جۆرە، پێشدەستی دەکەین لەو کاتە چاوەڕوان کراوەی خەریک بوونی «رسمی»مان بە دیوانی نالییەوە و هەر لە ئێستاوە گەڵاڵەی کەشکۆڵێکی دەروێشانە دەست تێ وەردەدەین بەڵکو ناوناوە ئازووقە و تووشەیێکی دواڕۆژی تێ بکەوێت. لێرەدا نموونەیێکی بەرهەمی پێشدەستی کردن دەخەمە ڕوو.

لەم چەند ڕۆژانەی پێش دەست پێکردنم بەم نووسینە، لە دوای ساڵەهای حیرەتەوە، بۆرە ماناییکم بۆ لێک درایەوە لەم بەیتەی سەرەتای قەسیدەیێکی:

دڵ دەڵێ سەیری چەمەن خۆشە جەوابی نادەم
مودەتێکە لە قەفەسدایە عەزابی نادەم

بەیتەکە لە خۆوە هاوار دەکا تەڵەی ناوەتەوە بۆ تێکڕای ئەدیب و شیعردۆستان. بەڕاستی ئەم بەیتە یەکێکە لەوانەی نالی، خۆی، لەچەند جێگایەکدا سرنجی خەڵقی ڕاکێشاوە بۆ وردیی و قووڵییان تاکوو جارێکیان پاتەوپات پێمان دەڵێ:

نالی بە داوە شەعری دەقیقی خەیاڵی شیعر
بۆ ئەو کەسەی کە شاعیرە سەد داوی نایەوە

هەتا بشڵێی ڕاستی فەرموە: دڵ کە بەینێک بێ لە قەفەسدا بێ و ئارەزۆی سەیری چەمەن بکا، چۆن دێتە باوەڕەوە کە عەزاب نەدانی بە جەواب نەدانەوەی دەبێ؟ وا چاوەنۆڕ دەکرێ بیگوتبا چیتر درێژە بە عەزابی نادەم و بە قسەی دەکەم و لە قەفەس دەری دێنم بۆ سەیری چەمەن.

ڕواڵەتی شیعرەکە یەکجار «صریح»ە لەوەدا کە «تناقض»ێکی بێ فێڵی تێدایە، نیوەی یەکەمی بە زاهیر چ خزمایەتییێکی نیە لەگەڵ هی دوەمیدا مەگەر دژایەتی و نەگونجان و لەیەکتر تۆران بێ.
نارەحەتی مرۆڤ بە دەست ئەم هەموو ڕێک نەکەوتنەی «صدر و عجز»ی بەیتەکە وای لێ دەکا لە لاوە واتای بۆ بخوازیتەوە و خۆی نەختێک پێ دابین کا. لەم ڕووەوە بە دڵی خۆمدا هاتووە و لە خەڵقی تریشم بیستوە ئاخۆ دەبێ مەبەستی نالی ئەوە نەبێ کەوا دڵەکەی بە ژیانی ناو قەفەس ڕاهاتوە و فێری وەزعی بەندیخانە بوە. ئیتر بردنی بۆ سەیری چەمەن دەبێتە هۆی عەزاب بۆی چونکی هەر دەبێ لە چەمەنەوە بگەڕێتەوە بۆ ناو قەفەسەکە ئەوساش هەستی بە عەزاب پتر دەبێ. ئەمەم بە دڵدا هات، بەڵام خۆم بە خۆمم دەگوت نالی ئەو شاعیرە نیە سواڵ و سەدەقەی واتا بکا لە من و غەیری من لە لاوە بۆی بخوازینەوە. ئەو لەوپەڕی بەخۆنازین و دەسەڵاتی شاعیرییەوە «تناقض»ێکی وای داناوە لە ناو بەیتەکەدا کە لە چاوی نووستووش بچەقێ، دەبێ لە ناو وشە و تێکهەڵکێشانی بەیتەکە خۆیدا چاری ئەو «تناقض»ە و هۆی ڕەواندنەوەی هەبێ، هەر لەمەشدا زێدە دەسەڵات پەیدا دەبێ، ئەو دەسەڵاتە کەماڵی حەڵاڵی بێ دەمەتەقەی «نالی»یە.

لە نکاو تارمایی واتایێکم بۆ کەوتە ناو لێڵایی پشت پەردەیێکی تەنکەوە. لە کوردییدا ڕستەی «جەوابی نادەم» دوو مەبەست ڕادەگەیەنێ، یەکەمیان وەرام نەدانەوەیە، دوەمیان لەوەوە دێت کە «جەوابی دا» بە واتای «قسەی ڕەت کردەوە، لێی نەسەلماند» دەگوترێت، لەم بەیتەشدا «جەوابی نادەم» زیاتر بۆ واتای دوەم «قسەی ڕەت ناکەمەوە» دەڕوات چونکە کە مەبەستی «صریح» وەرام نەدانەوە بێ دەگوترێ «جەوابی نادەمەوە – نەک نادەم». کەواتە ڕستەی «جەوابی نادەم» لێرەدا دەبێتە «ڕەتی ناکەمەوە». بەم جۆرە نیوە بەیتەکەی یەکەم لە ڕووی واتاوە وای لێ بەسەر دێت: دڵ دەڵێ سەیری چەمەن خۆشە، ڕەتی ناکەمەوە و

لێی دەسەلمێنم. بەمەدا هەندێک ڕێگەی سەخت دەبڕین لەو هەڵدێر و بەردەڵانە زیهنیە کەوا نالی لە خەیاڵاتی شیعر ناسیماندا هەڵی ناوە.

واتای نیوە دێڕی دووەمی بەیتەکە ئەگەر وەک ڕواڵەتی خۆیشی بمێنێتەوە و هیچ شێوەی ونی لێ بەدیار نەخەین و چ سەرپۆشی تازەی لەسەر هەڵنەدەینەوە دەشێ ببێتە تەواوکەری نیوەی دووەم: مودەتێکە لە قەفەسدایە عەزابی نادەم بە ڕەت کردنەوەی داخوازیەکەی و نەبردنی بۆ سەیری چەمەن.

بەڵام نیوە بەیتەکە لەو جغزە تەسکەدا ناوەستێ، واتای نهێنی ئەوتۆی تێدایە مەودای بەرفرەوانتری پێ بوێ. نالی خۆی بەوەندە ڕێککەوتنە سادەیە لە میانی نیوەی یەکەم و دووەمی بەیتەکە ڕازی نابێ. نالی کە هات و ئەم «تناقض»ە زلەی خستە ڕواڵەتی واتای نیوەی یەکەمی بەیتەکەوە، هەر نەبێ بۆ خاتری پێکهێنانی «توازن» و ڕاگرتنی لەنگەر، دەبێ تەڵەیێکی زلیشی لە نیوەی دووەمی بەیتەکە نابێتەوە.

من تەڵەیێکم دۆزیەوە ئەگەر دوو سێ تەڵەی تێدا نەبێ. کە دەشلێم «تەڵە»، ئەوەی ڕاستی بێ، بە دۆزینەوەی تەڵەکە بەرەو ڕەهایی دەڕۆین لە سەرسوڕمان بەرامبەر وردەکاریی و سیحر و دارشتنی بەیتەکە. بابزانین چۆن!

نیوە بەیتی دووەم لەوانەیە بەم جۆرە بنووسرێت وەک لێرە بە پێشەوە نووسیم: «مودەتێکە لە قەفەسدایە عەزابی نادەم» لەوانەیشە بەم جۆرە بنووسرێت و بخوێنرێتەوە: «مودەتێکە لە قەفەس دایە عەزابی نادەم».

وشەی «دایە» لێرە بە واتای«ملی نایە...» وەک ئەوەی کە بڵێی «دایە بێ عاری – ملی نایە بێ عاری».

کە ئەمە وای لێ بەسەر هات ڕستەی «عەزابی نادەم» ئەویش خوێندنەوە و واتایێکی تازە پەیدا دەکات و دەبێتە «عەزابی ناکات... عەزابی بێ کات و سەعات – واتە عەزابی هەمیشەیی». بەم جۆرە واتای نیوە بەیتەکە بە تەواویی دەگۆڕێت: دڵەکەم موددەتێکە لە قەفەس داویەتە عەزابێکی نادەم – بێ کات و سەعات و دائیمی. کەواتە جێی خۆیەتی لە نیوە بەیتی یەکەمدا نالی گوتبێتی «دڵ دڵێ سەیری چەمەن خۆشە، ڕەتی ناکەمەوە و قسەی ناشکێنم».

ئەم واتایە هەر خۆی دەبێتە پێشەکی بۆ بەیتی دووەمی قەسیدەکە:

مەجلیسێکی چەمەن و بولبول و بەزمی گوڵ و موڵ
بە دوو صەد مەدرەسە و دەرسی کیتابی نادەم

باوەڕم هەیە بەم واتا لێدانەوە و دەرخستنی شێوەیێکی نهێنی مەبەستی نالی لە بەیتەکەدا چ سامانێکم بۆ دەسەڵاتی نالی پێکنەهێناوە و لەوانەیە نەختێکم لە سامانی حەقیقەتی نالی کەم کردبێتەوە چونکە دەشێ ئەم واتا لێکدانەوەیەی من پەردەی خستبێتە سەر واتای تری لە خۆی جوانتر و لەبارتر و لە چاوی سرنجدەری شاردبێتەوە لەو ڕووەوە کەوا زۆر جاران وا دەبێ خەریک کردنی زیهن بە شتێکەوە ڕێی شتی تری لێ دادەخات.

بە خەیاڵ گوێم لێیە هەندێ خوێنەرانی ئەم نووسینە دەڵێن ئایا واتای وەک ئەمەی تازە لە خوێندنەوەی بووینەوە هێندە پێداهەڵگوتنە دێنێ؟ چ فەرقێکی دەکرد ئەگەر نالی «تناقض»ەکەی نەخستبا ناو شیعرەکەوە و پێویستیش نەبا بە هۆی وشەسازییەوە بی ڕەوێنێتەوە؟ گۆیا زیهن خافڵاندن بە واتای وەها سەرپۆشکراو چ سوودێکی مادی وناماديمان پێ دەگەیەنێ، چ مایەیێک لە سامانی ڕۆشنبیرییمان زیاد

دەکا؟ ئەم واتای وا تەجریدی چ دادێکی گەلەکەمان دەدا؟ چ دەردێکمان بە شیعری وەها تیمار دەکرێ؟ چی؟ کوا؟ کام؟ کەی؟ کوێ؟ بۆ؟ و هەرچی پرسەک (علامة استفهام) هەیە خۆ دەخەنە بیری خوێنەرانەوە و بە دوا واتای ئەم بەیتەدا دێن و دەبنە نارەزامەندی لەو و لە منیش.

من بۆ ڕەت کردنەوەی ئەم ئیعتیرازانە هانا نابەمە بەر شیعری شاعیرە تازەکانمان تا نموونەی نامەفهووم لەوان بێنمەوە و بیکەم بە عەیبپۆشی وردەکاریی و «تجرید» لە شیعری نالیدا چونکە بۆ خۆم چ ئیعتیرازم نیە دژی ئەو شیعرە نەوباوانە هەرچەند گەلێک لە شیعری نالی نامەفهومترن و هی وایان تێدایە هێندە هێمایی و دەروونی و «تجرید»ین لەوانەن بەلای خاوەنەکانیشیانەوە واتایێکی یەکجارەکی «نهائی»یان نەبێ و بەپێی گۆڕانی باری نەفسی و زیهنی و دەوروبەری خۆیانەوە «تصور»یان بۆ واتای ئەو تاک تاکانە بگۆڕێت. من کە ئەم نموونە نامەفهوومانە ناکەم بە ڕەتکەرەوەی ئیعتیرازان لەوەدا ڕووم هەر لە تێکڕاییێکی ئەو نارازییانە نیە، بەڵکو گەردەنی خاوەن نموونەکانیش ئازاد دەکەم و پێیان نالێم ئێوە کە شیعری توێکلاوی کەس تێنەگەییشتوو بلێن هەقی ڕەخنەتان نامێنێ لە شیعری خەلقی تر. من لە بارێکدا نیم باوەڕی خۆم وەیا شیعری نالی بە زەعیف بزانم تاکوو بەسەر بەلگە و پردی زەعیفدا لە ڕووباری ڕەخنان بپەڕمەوە. نە شیعری نالی و نە فکرەکەی خۆم ئەوە نین داروەکازی خۆ پێ دەربازکردن لە نموونەی شیعری تازە داهاتووی کورد و غەیری کورد بخوازمەوە بە شەفاعەتکاریان. هەرچی شاعیری ڕەمزی توێکلاوی کورد و غەیری کورد هەیە لێم بە دەنگ بێن و بلێن:

ئیلتیقای پۆلا و ئاسن هەر نیزاعە و گیر و دار
جەمعی «ماء و نار» و مردە و زیندە و «مرخ و عفار»

تەقە لەسەرمانەوە دێنێ و بە زیادەوە ماندوومان دەکا، من نایەم بابەتی ئەوتۆ لە شیعری ئەو شاعیرانە خۆیان بێنمەوە کەوا تەقە لەسەری هەموو دنیا بێنێ و لەوانە بێت چەند جاران چاوی تێنەگەییشتن بە خۆشیان بتروکێنێ و بەر لەوە بۆ ڕۆناکایی واتای بچن، ڕەنگ بێ هەر بۆشی نەچن. من ئەو نموونانە بە عەیبدار نازانم تاکو عەیبێکی ڕواڵەتی شیعری نالی وەیا کەلەبەرێکی باوەڕی خۆمیان پێ داپۆشم. سەختیی واتا و ناوەڕۆک لە هەرچی بەرهەمی ئادەمزاددا هەیە بەدی دەکرێ بە مەرجێک لەو بەرهەمانە بێ خۆ پێوە خەریک کردن و تێوەڕامان و لێکۆڵینەوە بێنێ.

هەرچەند مەیلی خۆم لە شیعردا پتر بۆ «سهل ممتنع – ئاسانی سەرکەش» دەچێ تا جۆرێکی تر، لەگەڵ ئەمەشدا شیعری سەرکەش و سەخت کە لە قووڵایی دەروون و ناخی هونەر و نازکیی هەست و تۆفانی دەسەڵاتەوە هاتبێ بە قەدەر «ئاسانی سەرکەش» و لەویش پتر دەمهەژێنێ و دڵم دەکولێنێ. گەلێک جاران وا دەبێ بەرامبەر پارچەیێک هەڵبەست وایا پەیکەرێک تەزوو و کەف و کوڵی توانەوە لە ناو «گەورەیی غەیب... نەزانراو... مطلق... جوانیی بێ سنوور... تاریکستانی نەست... فرەوانیی سروشت» لە سەرچاوە نهێنیەکانی دەروونمەوە هەڵدەچێ بێ ئەوە لە گفتوگۆی پارچەکان بگەم وەیا بتوانم پەنجە بۆ مەبەستیان درێژ کەم ئەو تێگەییشتنە کەڕ و لاڵە نەبێ کەوا زۆر بە لێلی و تەماویی لە بریقەی «عبقریە»تی پارچەکانەوە پڕاوپڕ دەرژێتە شکەفتی مەوهوومی متمانی و قەناعەت لە نەفسدا.

بە دەست من نیە و خەتای تۆش نیە، ئارەزۆی شتی ئاسان و حەز کردن لە ساکاریی و سادەیی

خووی منداڵە، پیشەی هەرزەکارە. تەنانەت لە جیهانی منداڵانیشدا گەپی تەمەنی ٥ساڵی بە لای تەمەنی ١٥ ساڵییەوە پڕوپووچ دەردەچێ... تازە ئاشنای دامە هەر ئۆینی «یەک بە دوو» دەزانێ... گەنجی تازە خوێندەوار چیرۆکی چەتە و بۆکس وەشاندن و جینس دەپەرستێ... سواری نابەڵەد هەر لە سەرەو هەورازان وڵاغەکەی تاو دەدات، لە شێوانیش لێی دادەبەزێ... ئەم کارانە هەموویان پلەی هەڵکشاوتر و سەختتریان هەیە، سووچی ئەوان نیە ناشارەزا تێیان ناگا و کەم دەسەڵات پێیان ناوێرێ. شیعریش وەک ئەوانە و لەوانیش زیاتر ئەمپەڕ و ئەوپەڕی ئاسان و سەختی لە یەکتر دووری هەن.

شاعیر لە دوو رووی گرنگەوە دەرفەتی خۆ روونکردنەوەی لە نووسەری پەخشان کەمترە:

یەکەمیان لەوەدا کە شاعیر تەرجومانی جۆشی عاتیفەیە نەک لێکدانەوەی هۆش. دەروون کە کوڵا بڵق و قوڵپی بورکانی هێندە وەحی دەردەپەڕێنێ و تیشکی هێندە خێرا بە ئاسۆیدا تێدەپەڕێ، ئەگەر خاوەنەکەی زیهنێکی وەک جادووی نەبێ و دەسەڵاتێکی ئەفسووناوی لە خۆیدا شک نەبا ناتوانێ وێنەی کرۆکیشیان بشکێنێ چ جایی بیانکا بە تابلۆی پڕ لە هونەر.

دووەمیان لەوەڕا کە شاعیر ئەو مەودایەی درێژە پێدانی گوتەی لە پێشدا نیە کە نووسەری پەخشان هەیەتی. شێوازی عەرووزی بێ یا هی ڕەها «مرسل» ی تازە داهاتوو بێ، ڕستەی شاعیر نابێ ئەوەندە درێژ بێتەوە پەراوێزی «تفعیل»ەکانی ببەزێنێ.

لەم دوو تایبەتییە «بنجی»یەدا کە خەتی جوداوازی دەکێشن لە میانی شیعر و پەخشاندا، شیعر جۆرێک بەندیخانە هەڵ دەنێ بە دەوری خامەی شاعیردا کەوا بە زەحمەت جێی خۆی و خەیاڵات و تەقینەوە و وتووێژەکانی تێیدا دەبێتەوە. هەرچەند بتوانێ ئەندازە بەکاربێنێ لە ڕیزکردن و ڕێکخستنی هەست و بیری خۆی لەم بەندیخانەیەدا دیسانەوە تەنگ بە خامەی هەڵچنراوە و تەنگەتاو کراوە. دەبێ لەم سەغڵەتییەدا لێی بسەلمێنین وشەیێکی ئەو بە هەموو واتای «صریح و حقیقی و مجازی و تضمنی»یەوە لە ناو شیعردا پەیام بەخش دەبێ، ئیشارەییێکی ئەو بایی گوتەی پاتەوپاتی من و تۆ لە ناو دڵ و دەروونی گوێگردا دەنگ بداتەوە. کە حاڵ وا بێ دیارە لێ حاڵی بوونی شیعر زەحمەتترە لە پەخشان با جارێ شاعیر هیچ خۆ نیشاندانیشی نەکردبێ کە خۆ نیشاندانەکەی بە زیادەوە واتای هەڵبەستەکەی زەحمەت کردبێ.

سەرەڕای مەودا کورتی کە کاری شیعر وەزەحمەت دەیەخێ، پێویستی بوونی مۆسیقا و تاو و تەئسیری وشە و شێوازی هۆندنەوە لە شیعردا ئەویش سەر لە نوێ فەرمانی شاعیر سەختتر و ئەرکی گرانتر دەکەن. شیعری بێ مۆسیقا و کەم تەئسیر نرخی هونەری نابێ ئەگەر لە رووی خەیاڵەوە پەروازی بۆ ئاسمانیش بچێ. بۆ ئەم مەبەستە شاعیر دەبێ وشەی مناسبی جێگە و هاوئاهەنگ لەگەڵ وشە دراوسێکانی دەست بژێر بکا لە فەرهەنگی زماندا. وا هەیە وشەی مۆسیقایی دەدۆزێتەوە بەڵام بۆ «تفعیل»ەکانی دەست نادا.

لە نموونەی چاوەدێریی کردنی مۆسیقای وشە بەیتێکی نالی دێنمەوە مەبەستمان بۆ روون بکاتەوە:

جامی تاقی مەیکەدە میشکاتی «قندیل»ی دڵە
شیشە پڕ قەرقەف لە ڕەفرەف شاهی عالی ڕەفرەفە

لەم بەیتەدا کارمان بە وشەی «قندیل»ەوە هەیە. بەیتەکە ئیشارەی بۆ ئایەتێکی قورئان :«مثل نوره کمشکاة فیها مصباح». دەبینی لە ئایەتەکەدا قورئان وشەی «مصباح»ی بەکار هێناوە، کەچی نالی وشەی «قندیل»ی لە جێ داناوە. بۆ دۆزینەوەی مۆسیقا دۆستیی نالی لە هەڵبژاردنی وشەدا، بێنە وشەی «قندیل» لە بەیتەکەدا بگۆڕە بە «مصباح» و بیکە:

جامی تاقی مەیکەدە میشکاتی «مصباح» ی دڵە

تەماشای، بە دوا یەکدی داهاتنی دوو وشەی درێژی یەک کێشی وەک دوو وشەی «کمشکاة و مصباح» چەند ناقۆڵا دەردەچێ و مۆسیقای بەیتەکە دەمرێنێ؟ وشەی «قندیل» کە هاتە جێگەی «مصباح» سەرەوژوور چوونەوەی «کمشکاة»ی شکاندووە بۆ خوارەوە و نەفەس سواریی خوێنەری کردە پشووی حەسانەوە بەوەدا بزوێنی «ا »ی وشەی «مصباح» کە بزوێنێکی سەرەژووری ستوونییە، کردی بە بزوێنی «ی»ی وشەی «قندیل» کە سەرەوژێرێکی ستوونییە. وشەی «قندیل» جگە لەوەی «ا »ی وشەی «مصباح»ی گۆڕی بە «ی»، سەرەتاکەشی لە سەرەتای «کمشکاة» دوور کەوتۆتەوە، لەوەدا جارێکی تریش لە عەبدایەتی «کمشکاة» ڕزگار بوو:

مشکاتی مصباحی دڵە

مشکاتی قندیلی دڵە

لەم تێبینیانەوە بۆ هێندێ دەچم کە وا مەودای تەعبیر و دەرفەتی خۆ ئاشکرا کردن بۆ شاعیرێک گەلێک تەسکتر و تەنگترە تا نووسەری پەخشان.

هەموو ئەو تێبینییانە بەلاوە بنێ: شاعیر نابێ قسەی عادەتی بکا و خواردەمەنی بازاڕ و لۆقنتەی گوفتار کاوێژ بکاتەوە. لە شاعیر چاوەڕوان دەکرێ تەجروبەیێکی خۆی بخاتە ناو چارچێوەی هەڵبەستییەوە. مەرج نیە تەجروبەکە ڕووی دابێ، با زادەی «تجرید»ی تەجروبە کۆنەکانی بێ کە ئەوسا بەوەڵەد هێنانی سەختتریش دەبێ. لە هەموو حاڵاندا فکری ڕەسەنی بێ پێشینە «سابقە» کە لە قووڵایی دەروونی هەستیارەوە هەڵقوڵێ و بەسەر زمان و خامەی هونەرکاردا هەڵڕژێ هێندە کێویی و بێگانە دێتە بەر گوێی گوێگرەوە لەوانەیە وەک گوتەی زمانێکی غەریب خۆ بنوێنێ و لێ تێگەیشتنی گەلێک بەولای زەحمەتەوە بێ. ئەم قسەیە دەمانگەیەنێ بە «ناوەڕۆک» و حیکایەتە پڕ تەقە و ڕەقەکەی.

نەختێک بە درێژی لەم مەوزوعەوە دواوم و لەسەریم نووسیوە، زەروورەت وای کرد جارێ بڵاو کردنەوەی بوەخرێ چونکە بەر بەشی دووەمی باسە درێژەکەی «حاجی قادری کۆیی» کەوت. لێرەدا یەکجار بە کورتی لێی بە کۆتایی دەگەم.

سنوور کێشان بە دەوری ناوەڕۆکی قەراردادەکراو و سەپاندنی بەسەر نووسەر و شاعیر و هونەرمەنددا وشکایی بە بەرهەمی بایەخدار دێنێ لە سەرانسەری مەیدانەکانی شیعر و نووسین و هونەر. کە ڕەوا بێ ناوڕۆک بسەپێ بەسەر خەڵقدا دیارە بیر و باوەڕی دەستەی دەسەڵاتداری کۆمەڵ دەبێتە ناوەڕۆک، حکومەتی هەر شوێنێک خۆی دەکاتە سەرچاوەی فەلسەفە و بیروباوەڕ. بۆ خۆت

بەراوردێک بکە لە میانی وەزعی شیعر و نووسین و هونەر لە دوو جێگەی بەیەکتر نەچووی وەک ڤاتیکان و چینی میللی. بێگومان لەم گوتەیەمدا پەیڕەوی کەرانی هەر دوو شوێنەکانم لە خۆم تۆراندووە چونکە هیچ لایان بەوە ڕازیی نین ناوی لەتەک ناوی لایەکەی تردا بێت، کە ڕازیی نەبن بە دراوسییەتی لە میانی ناویان دیارە هیچ لایێکیشیان ڕێگە نادا بیروباوەڕ و فەلسەفەی لایەکی تر هەناسە هڵبێنێ.

من هەقم نیە بەسەر ئەوەوە ئاخۆ تۆ حەز بە کام لایان دەکەی وەیا لە کامیانەوە نێزیکتری، لەمەدا هەر ئەوەندەم مەبەستە بە میسالێکی زۆر ئاشکرا کەوا پەکی لەسەر ڕوونکردنەوە نەکەوتبێ بیخەمە بەرچاوت سەپاندنی بیروباوەڕ چ ئەنجامێک دەبەخشێ لە ڕووی وشک بوونی سەرچاوە جۆر جۆرەکانی بەرهەمی فەلسەفی و فکری و هونەرییەوە. لە تەجروبەدا دەشبینین، ئەو ناوەڕۆکانەی لە نێوان یەک کۆمەڵدا دۆستی بە هێزیان هەیە و هیچیان ناتوانن ئەوانی تر نابوود و قومارباز بکەن چالاکانە دەستە و یەخەی یەکتر دەبن و بینەقاقای یەکتر دەگرن بە نیازی پەکخستن و لەناوبردن، هەر کامێکی لێشیان بگریت دەڵێ خۆم ڕاست دەکەم و پاسەوانی میللەتم.

خوێنەر لە عاست ئەم گوتەیەمدا هەر هەڵوستێک دەوەستێ با بوەستێ، من لەسەر هێندێ پێ دادەگرم کە وا دەبێ نووسەر و شاعیر و هونەرمەند ئازاد بن لەوەی دەیکەن و دەیڵێن، چ مەترسیش لەوەدا نیە ئەم ئازادییە ببێتە هۆی لادان و دوورکەوتنەوەیان لە شەقامەڕێی بەرژەوەندی گشتی. سەیرە لە هونەرمەند و نووسەر بترسێین کە هیچ چەکی ترسێنەر و کوشندەی بە دەستەوە نیە، بەڵام ترسمان نەبێ لەو کەسە کە دەسەڵاتی سەپاندن و یاساغ کردن و تۆقاندنی بە دەستەوەیە. شاعیر و هونەرمەند چ تیر و شیریان هەڵنەکێشاوە میللەتی پێ بترسێنن، کوتاڵ و مایەی نووسەر و هونەرمەند و شاعیر کە شیعر و نووسین و پەیکەر و گۆرانی و ڕەسم و مۆسیقا... یە لە خۆوە ناتوانن هەنگاوی منداڵێک خوار کەنەوە مەگەر دەسەڵاتدارێک بێ و بیانکا بە کوتەکی خەڵق تۆقاندن. نووسەر و شاعیر و هونەرمەندیش ئیفلاس بە خۆی دەکا و باوەڕەکەی دەپلیشێنێتەوە کە بێ و داوای دەم کوت کردنی فلانە جۆر و فیسارە ناوەڕۆک بکا بە توهمە تێگرتنی دژایەتی گەل و نازانم چی، چونکی ڕۆژەک دێ هەمان نووسەر و شاعیر و هونەرمەند دەمکوت بکرێن لە لایەن دەسەڵاتێکی ترەوە کە باوەڕی لە هی ئەوان جودایە، هەر بە توهمەی دژایەتی گەلیش نەک تاوانێکی تر.

ناوەڕۆک زادەی هەناوی بەرهەمهێنیەتی، کە ترسی توهمە و تاوانبارکردن ئەو ناوەڕۆکەی گۆڕاند لە دەروونی خاوەنەکەیدا ئەوا بێگومان بەرهەمێکی بیژوو لەو هەناوەدا دەڕسکێ. نووسەر و شاعیر و هونەرمەند قەرزاری ئازادیی گوتەی زمان و کردەوەی دەست و خامەیانن، چ سەرمایەیێکی تریان نیە لە کۆمەڵدا دەوڵەمەندیان بکا و حورمەتیان بۆ پێکەوە بنێ، چ ڕێگەیێکی تریشیان لە بەردا نیە تێیرا بڕۆن بۆ خزمەتی گەل و بیروباوەڕی خۆشیان جگە لەو تاکە ڕێبازەی نووسین و هونەر. کە بێن و ئەوەش لە خۆیان یاساغ کەن دێنە سەر ساجی عەلی و لە هەموو ڕوویێکەوە نابوود دەبن. تێدەگەم و دێتە قەناعەتمەوە شاعیر و نووسەر و هونەرمەند<٣> چاو لە هەندێ ڕاستیی بپۆشن و بە زاهیر لە ڕێگەی پشتگیری کردن لە سوودی گەلەوە داوا بکەن دەستی بازرگان و بەقاڵ و عەتار و خوردەمالیک ببەسترێ چونکە هەر نەبێ ئەم کارەیان ڕاستەوخۆ زەرەر لە خودی خۆیان نادا. بەڵام خۆشئامەدی کردنیان لە یاساغ کردنی بیروباوەڕ ماڵ کاولی بێ دەمەتەقەی خۆیانە. چ دوکانی عەتار بپێچیەوە و چ ئازادی تەعبیر لە شاعیر و هونەرمەند بسێنیەوە هەمان کاری ئیفلاس هێنت بە هەردوویان کردووە. ئەگەر شاعیرێک و

هونەرمەندێک بە هۆی خۆدانەپاڵ دەسەڵاتدارەوە توانیشیان دوکان بکەنەوە و بەرهەمی بێژوو باوێنە کۆشی میللەتەوە، هەزاران شاعیر و هونەرمەندی تر کە توانای خۆ لە قاڵب دانیان نیە دەبنە هەریسەی قوڵپ و جۆشی مەنجەڵی «یاساغ کردن و تەنگ پێ هەڵچنین».

لەم ڕێگە دانە بە سەرپاکی نووسەر و شاعیر و هونەرمەندان بۆ ئازادیی بیروباوەڕ و کردەوە، تاکە یەک مەترسی لەوەدا دەکرێ کەوا ئەو کەسەی بەتەمایە خەڵق دەم کوت کا و ڕێگەی ئازادیی تەعبیریان لێ ببەستێ ئەویش وەک ئازادیخوازەکان سوود وەردەگرێ لەم ڕێگە بەرەڵڵا کردنەدا. سوودەکەش هەر بە نیازی گەیشتنە دەسەڵات و خەڵق تۆقاندن لە کار دێنێ. واتە بە نیسبەت هەندێ دڵکرمێ و ناحەزی ئازادییەوە،

ڕێگەدان و ئازادیی تەعبیر هەر ئەوەندە چاکەی تێدایە کە مەودای پێ دەدا بۆ ئەوەی ڕۆژەک لە ڕۆژان هەموو ڕێگایان ببەستێ و هەموو دەرگایان داخا... قەفەس دروست کا بە دەوری غەیری خۆیەوە. لەگەڵ ئەم مەترسییەش دیسانەوە ڕێگە دان و دەرگە کردنەوە تاکە ڕەفتارێکە لە ئازادیخواز بوەشێتەوە، یاخود با بڵێم سروشتی ئازادیی ئەمەی بە بەرەوەیە و خۆ لێ قوتارکردنی ئاسان نیە. ئەوەندە هەیە دەتوانم بڵێم تێکڕای میللەت و نووسەران و شاعیران و هونەرمەندان و ئازادیخوازان کە نەیانتوانی کەمایەتیی ئەوان دڵ کرمێیانە پەک بخەن و بەوەدا ئازادیخوازیی خۆیان دۆڕاند و ئەوانی لێ بوونە جەللاد، چ لزوم نامێنێ بۆیان بگریەین و خەفەتیان بۆ بخۆین، دیارە بە لایانەوە ئازادی ئەوە ناهێنێ بپارێزرێت. خۆ پێی ناوێ من بڵێم، کە حاڵی ئازادییخوازەکان ئەوە بێ ئەوسا لە هەموو حاڵاندا ناتوانن ئازادییان بپارێزن.

بە هەمەحاڵ ئیمکان نیە یەک جۆر ناوەڕۆک لە شیعر و هونەر و ئەدەبدا بسەپێندرێ بێ ئەوەی یەک ئاهەنگییێکی ئێسک قورسی ناقوڵای بێ زەوق لەو بەرهەمانەدا ببێتە ئەو زڕە ڕەنگە کە ڕەنگ کراوەکە عەیبدار دەکا و چاو لێی هەڵدەبەزێتەوە. بۆ خۆت ئەو وەزعە بێنە بەرچاوت کە لە تاکە یەک کولانەوە سەیری جیهان بکەیت و پێشت نەکرێ جیهانەکە بە بەر کولانەکەدا بخولێنیتەوە تاکو هەر نەبێ لەو تەنگژەیەدا دیمەن گۆڕیی بکەیت.

لە گۆشەی نیگای نرخاندن و سەنگاندنی ناوەڕۆکەوە ڕاستییێکی تر هەیە خۆ لێ بە سەهوو بردنی دەبێتە شەڕی ڕووبەڕوو (جبهوی) لەگەڵ ئادەمزاددا هەرچەند ئەو شەڕە بەرگی مرۆڤدۆستی و چاکەخوازیش لە خۆی بئاڵێنێ تا بەقەدەر گۆڕی چاک و پیران پەڕۆیان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە. ڕاستییەکە ئەمەیە: هەر ناوەڕۆکێک پەسەند بکەیت مافی ئەوەت نیە بەرهەمی ڕۆژگارێکی ڕابردوو بە گەزوگرێی سەردەمی خۆت بپێوی. تۆ جارێکیان خۆت کردە سەرپشک لە بەرهەمی هاوچەرخەکانت، بە تەمای لە مردوانیش ببیتە سەر پشک! ئەم کارەت سەرەڕای نارەوایی، زەرەر لە خۆشت دەدا چونکە لە دوارۆژدا دێن و بەرهەمەکەی تۆ بە گەزوگرێی خۆیان دەپێون و ئیفلاست پێ دەکەن.

ئەم وتووێژە پتر ڕوو لە مرۆڤی سیاسی و «ملتزم» بە باوەڕێکی ڕەسمی دەکات، چونکە ئەوان بۆ مەبەسی خزمەتی ئامانجە ڕامیارییەکانیان دەیانەوێ ناوەڕۆکی هەموو جیهان ڕام بکەن و بیکەنە نۆکەری ئەو ئامانجانە. مرۆڤی سەربەخۆ لە بیروباوەڕیدا پێویستی بەم ڕامکردن و بگرە ببستە نیە. ئەو هەر ئەوەی دەوێ لە خۆی و لە خەڵقیش گەڕێن بە ئازادیی بنووسن و بڵێن و بکەن.

لێرەدا قسەیێک خۆ دێنێتە پێش: سیاسەت پتر و خێراتر لە گۆڕاندایە تا بیر و باوەڕ و ناوەڕۆکی تر. لەوانەیە بەرژەوەندی سیاسی لە ڕۆژێکەوە بۆ ڕۆژێکی تر تەقلە لێ بدا و بەرەو پشت هەڵگەڕێتەوە، ئەدەب

و شیعر و هونەریش کە خزمەتی ئەو بکەن دەبێ لەگەڵیدا بگۆڕێن... لە ڕاستیدا دەشگۆڕێن، بەرەو پشتیش دەبنەوە. لەبەر ئەمە ئەدەبی سیاسی، بە زۆری، تەمەنی کورتە و جوانەمەرگە، واتە خێرا باوی نامێنێ و دەمرێ، گەلێک جاران ئیعدامیش دەکرێ و گوتنەوەی یاساغ دەکرێ. خۆمان دیومانە وابوە حکومەتێک کتێبێکی سیاسی بڵاوکردۆتەوە و هەر خۆی دوای ساڵێک پۆلیسی بە دوادا گێڕاوە کۆی کاتەوە و بیشارێتەوە. لەم حاڵانە «ناوەڕۆک» گاڵتە بە خۆی دەکا بەر لەوە بە غەیری خۆی بکا. بۆ بەراوردیی کردن ئەم چەند بەیتە بخوێنەوە:

«امرء القیس» لە هەڵواسراوەکەیدا دەڵێ:

قفا نبک من ذکری حبیب و منزل
بسقط اللوی بین الدخول فحومل

وەفایی ئەمەی گوتوە:

بەس عومری من بە با دە
ڕووت بێنە زوڵفت لادە
دڵ بۆیە نامرادە
بەم شەوە ڕۆژ گیراوە

«کلیم»ی هەمەدانی گوتوەتی:

شد دامن الوند کنارم زگلی اشک
کردیم دوا داغ فراق همدانرا

ئەم شیعرانە لە خۆوە دەژین، کەس پارەی بۆ خەرج نەکردوون و هەڕەشەشی لە خەڵق نەکردووە ئەگەر نەیانلێنەوە سزا بدرێن، کەچی هەموو شیعرە سیاسیەکانی سەردەمی هیتلەر و مۆسۆلینی و کەریم قاسم کە گەورەیی و «وحدانیە»ی ئەوانی دەگوتەوە، وەک مردوویان لێ هات. بشزانە هەرچی شیعری ئەوتۆیی هەیە ڕۆژەک دێ و دەمرێت. ئەدەب و هونەر، ئەوەی ڕاستی بێ هەموو بەرهەمێک، تا وتووێژی لەگەڵ سەرچاوە قوڵەکانی نەفسی مرۆڤدا بێ نەمرتر دەبێ، چونکە بە درێژایی مانەوەی ئەو سەرچاوانە لە نەفسی مرۆڤدا ئەویش دەمێنێ و گوێگری دەبێ. سەرچاوە قووڵەکانی نەفەسیش، بە پێچەوانەی چاوەڕوان کردنی فەیلەسووفە مادییەکان، یەکجار ڕەگ داکوتاوترە لە سروشتی مرۆڤدا لەوەی بەرژەوەندی سیاسی وەیا ماددی کەم عومر حەزی لێ دەکا. ئەو کەسانەی لە ڕێی فەلسەفەوە «گۆڕانی کۆمەڵایەتی»یان لێ دەبێتە مەراق و ماخولیا وایان پێ خۆشە دەروونی مرۆڤیش بە پێی ئەو گۆڕانە بگۆڕێت، کەچی حیسابەکە وا دەرناچێت. سوودی مرۆڤیش لەو دەرنەچوونەدایە چونکە ئەگەر نەفسی مرۆڤ وەک مۆدێلی جلک و پێڵاو و ئۆتۆمۆبێل خێرا گۆڕابا لە مرۆڤایەتی دەشۆرا و دەبوە گیانلەبەرێک کە ناتوانین ناوی بۆ دانێین.

شیرازەی کۆمەڵایەتی و بە یەکەوە بەسترانەوەی تاکەکانی مرۆڤ گەلێک بەهێزترە لەو پەیوەندییەی کەوا بەرژەوەندێکی سیاسی وەیا ئابووری چەند مانگیی و چەند ساڵیی پێکی دێنێ. بە نموونە دەڵێم

«ملحد»ێک کە مردووی لێ دەمرێ هێندی ئیمانداریک ڕووەو مزگەوت دەڕوا بۆ پەیدا کردنی مردوشۆر و قورئانخوێن و گۆڕهەڵکەن و نازانم چی. زوربەی هۆی بایی بوونی مرۆڤی لووتبەرز و لە خەڵق ناڕازیی و بایەخ نەدەر بە غەیری خۆی لە گۆری گەنجایەتی و کاردروستی و بێ موشکیلییەوە دێت. دوو ڕۆژی لەرزوتا لە تۆقەڵەی بایی بوونەوە دەیهێنێتە سەر خاکی پاڕانەوە. گوتم نابێ ڕابردوو بە گەز و گرێی دوا ڕۆژ بپێورێ، هەر ڕۆژگارە گەز و گرێی خۆی هەیە نەک هەر لە شیعر و ئەدەب، بەڵکو لە هەموو مەیدانێکی کۆمەڵایەتییدا. جلوبەرگی تۆ بەبەر باپیرتەوە سەیری خەڵقی سەردەمی ئەوی دەهێنایەوە. کچێکی ١٠٠ساڵ پێش ئیمرۆی کورد ئەگەر قژی کورت کردبایەوە بە شوو نە دەچوو با نەڵێم شار بەدەر دەکرا.

بە پێی سەردەمی خۆی، شیعری نالی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە تا بڵێی دەوڵەمەندە. بێ ئەوە لایەنگیریم کردبێ لە موقارەنەدا نالی بەر لە شاعیرەکانی سەدەی نۆزدەممانەوە دێ، مەیدانێکی فرەوانیش لێیان پێشکەوتووە. کە بێی و دیوانەکەی بە دیوانی شاعیرەکانی ترمان بگری دەبینی گەلێک پتر لە هی وان هەڵبەستی تێدایە کە وا لە «تجرید»ی ڕووت ڕەها بووە و بەرەو گوتنەوەی واتای ئەوتۆ چوە لایەنی کۆمەڵایەتی بداتەوە. بێگومان ئەم نووسینە هێندەی بە بەرەوە نیە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم مەبەستە گەشت بکا بە ناو هەموو یاخود بەشی زۆری دیوانەکەی «نالی»دا، لەوە زیاتر کە چەند نموونەیێک بێنمەوە مەودای درێژە پێدانم نیە بە نووسینەکەم. کەسێک بیەوێ سرنج بگرێ دەتوانێ نموونەکانی ئێرە بکاتە «محک»ی نرخاندنی شیعری تریش بۆ دەرخستنی لایەنی کۆمەڵایەتی تێیدا، یاخود لە لای خۆیەوە، بێ ئەم «محک»ەش، دەسبژاری ئەو لایەنە کۆمەڵایەتییە بکا.

سەیرێکی ئەم بەیتە بکە کە وا ڕەنگە لەبەرچاوێکی درشتبین گرۆگاڵێکی دەروونی شاعیر بێ و بەس، کەچی ئەوەندە پڕە لە «کۆمەڵایەتی» هەر دەڵێی پێی ئاوسە:

یا توربەتی یا غوربەتی «باری» بشکێن
هەر مونتەزیرە نالی ئەگەر مرد و ئەگەر ما

با جارێ واز لە جوانکاریی بێنین و بلکێین بە لایەنی کۆمەڵایەتی بەیتەکەوە. نالی لەم بەیتەدا دەستە و دامانی دوو نەرێتی کۆمەڵایەتی کۆن و ڕێز لێگیراوی میللەتی کورد، هی غەیری کوردیش، بوە بۆ سکاڵاکردن و پاڕانەوەی حاڵ لای خۆشەویستەکەی: داوا دەکا یەک لە دوو شتانی لەگەڵدا بکرێت، یا بێنە سەر «توربەتی – قەبرەکەی» کە بە مردووی حیساب بکەن لەبەر شیدەتی پەژارەیی، خۆ کە ئێستاش نەبێ کاتێک بەڕاستی مرد بێنە سەر قەبری، یاخود بە سەردانێک «غوربەتی» بشکێن ئەگەر دەڵێن زیندوە و نەمردوە. واتا کە دەڵێن مردوە «یاخود کە مرد» با توربەتی بشکێن کە دەشڵێن زیندووە غوربەتی بشکێن. لە غوربەت و لە توربەتی یەکێکیان بشکێن وەلەو جارێکیش بێ. نالی هەر مونتەزیرە ئەگەر مرد و ئەگەر ما.

وشەی «باری» بە ڕێنووسی کۆن دوو جۆرە خوێندنەوە و دوو جۆرە واتای هەیە. یەکێکیان «بارێ» بە واتای «جارێ، جارێک»ە. لەم حاڵەدا بەیتەکە ئەم واتایە دەبەخشێ: جارێکیان توربەتی یا غوربەتی بشکێن دیارە نالی ناوێرێ لە جارێک پتر سەردان داوا بکا.

جۆری دووەمی خوێندنەوەی «بارێ» ئەوەیە بیکەیتە «با رێ بشکێنن». ئەوسا «با» بۆ هاندانە وەک بڵێی «با بێت، با بڕوات، با ئاو بخواتەوە». وشەی «رێ» ئەویش بە واتای «رێگە» دەبێ. بەمەدا مانای بەیتەکە وای لێ بەسەر دێ «یا قەبری یا غوربەتی نالی، با رێگەی هاتنی یار بشکێنن بۆ لای»

دەبینی واتایێکی کۆمەڵایەتی زۆر بە نرخ هەیە لە بەیتەکەدا، بە جۆرێکیش ئوستادانە لە شیعرەکەدا گونجاوە هیچ سەری رێی بە وردەکاریی و هونەری ئەدەبییەوە نەگرتووە و مەودای لێ تەسک نەکردۆتەوە. دوو وشەی توربەت و غوربەت سەرەڕای سازانی هاو ئاهەنگییان لە تەک یەکتردا جارێکی تریش هەستی گوێگر دەبزێون بەوەدا کە هەردوویان وەزعی سۆزناک دەڵێنەوە. غەریبی و مەرگ. کە مروەتێک هەبێ لە نێوان خەڵقدا دەبێ سەر لە غەریب بدرێ. کە غەریبی بایی ئەوە نەکا ڕەحمی ئەم یارە بێ ڕەحمە ببزێوێ ئەوا مەرگ لە بەیندایە و سەردانی قەبران چ عوزران قبووڵ ناکا. نالی بێچارە هەقیەتی لە ژیان و مردندا چاوەڕوانی سەردانێک بکات.

بە دوا ئەم پێشەکییە پڕ لە سۆز و پرووزی بەیتەکەدا، خوێنەر کە دەگاتە کۆتایی و ڕوو بە ڕووی «مردن و مان» دەوەستێ و هەردووکیشیان بە دیار سەردانێکەوە لە چاوی بەیتەکەدا قەتیس ماون، هەر بە جارێ دڵی دەبێتە ئاو. دەک ماڵت شێوێ نالی بۆ کام مەڵبەندی بێسنووری غەم و تەمی عیشقمان دەبەی لەم چاوەنۆڕکردنەی دوای مەرگت بۆ قەدەم ڕەنجەیێکی ئەم بێڕەحمەی یارەت؟

یا توربەتی یا غوربەتی بارێ بشکێنن
هەر مونتەزیرە نالی ئەگەر مرد و ئەگەر ما

رێ شکاندنەکەش لە لای خۆیەوە ئاوری سۆزی گوێگر پتر بەرز دەکاتەوە چونکە وا ڕادەگەیەنێ چ کەسێک بە سەرلێدان ڕێی ئەم بێ چارە عاشقەی نەشکاندوە. سەرەڕای سۆز بزاوتنەوە، وشەی ڕێ شکاندن لە فەرهەنگی زمانی کوردییدا زاراوەیێکی زرینگەداریشمان دێنێتە بەر گوێ، ئەو دیمەنەشمان نیشان دەدا لە ژیانی دەشت و دەر و شاخ و هەڵەت و پەڵەت کە ڕێگە دەبەسترێ بە هۆی بەفر وەیا زەبەند و نوغوردەوە و خەڵق تێ دەئاڵێن و دەیشکێنن.

سرنجێکیش لە هەندێ بگرە نالی وشەی «صریح»ی سەرلێدان و هاتوچۆکردنی هەر بە کارنەهێناوە بەڵام داخوازیەکەی و سکاڵا و ئازار و شکایەتەکەی بەولای «صریح»ەوەیە بەهێی هێزی بەکارهێنانی ڕستە و تەعبیری ئاخاوتن.

لە هەر ڕوویێکەوە سەیری بەیتەکە دەکەی هێند دەوڵەمەندە حیکایەتی ناوەڕۆک و وشەسازیی و ئەو بەند و باوەت لە بیر دەباتەوە، ئەگەر بە بیریشت بێتەوە خاوەنی حیکایەتەکە قەرزار دەکات و شەرمی دێنێتەوە. بۆ خۆت لە لایەنی جوانکاریی و ئارایشتی «بدیع»یشەوە لە بەیتەکە ڕامێنێ و سرنج بدە هاومۆسیقایی توربەت و غوربەت و «طباق»ی مردن و مان و دوو واتایی «باری» و ئەوان هەق و حیسابانەی هونەری شاعیریی کە وا لە بەیتەکەدا کۆمەڵ بوون و بیانخەوە سەر تێکڕایی سامانی.

با ئەو تێبینیە گرنگەش بخەمە بەرچاو هەرچەند درێژەش دەدا بە شیکردنەوەی بەیتەکە. لە هەردوو ڕووی کێش و واتاوە دەست دەدا بەیتەکە بخوێنرێتەوە: «یا توربەتی یا غوربەتی باری بشکێنن» وەیاخود غوربەت پێش کەوێت و بگوترێت: «یا غوربەتی یا توربەتی...» بەڵام لە ڕووی فەنی شاعیریەوە هەر جارەیان جۆرێکی تایبەتی هونەری «بدیع» پەیدا دەبێ.

دەزانین «توربەت و غوربەت» لە سەرەتای نیوەی یەکەمی بەیتەکەدا بەرامبەر «ئەگەر مرد و ئەگەر ما»ی کۆتایی نیوەی دووەمی بەیتەکە دەوەستن، توربەت بۆ مردنەکە و غوربەتیش بۆ مانەکە دەبێ. ئەم وەزعە پێی دەڵێن «لف و نشر». کە وشەی «توربەت» لە پێشەوە بێ لە ڕیزدا دەکەوێتە بەرامبەری «مردن»ەکە، ئەوسا غوربەتیش دەچێتە بەرامبەر مان. ئەم جۆرە پێی دەڵێن «لف و نشر مرتب»، چونکە هەر وشەیە لە بەرامبەر وشەی مناسبی خۆیدا وەستاوە. بەڵام کە «غوربەت» پێش کەوت ئەوسا «لف و نشر»ەکە دەبێتە «مشوش».

لە حاڵێکدا بڵێین «یا توربەتی یا غوربەتی» و بەمەدا «لف و نشر»ەکە بکەین بە «مرتب» دیسانەوە لە ڕووی واتاوە هەر «مشوش»ە، چونکە دیارە لە واقیعدا «مردن» دوای «مان» دێت هەرچەند وشەکەیشی لە بەیتەکەدا پێش کەوتوە. کە هاتین و لە نیوە بەیتی یەکەمدا غوربەتمان پێشخست و ویستمان وشەکان لە ڕووی واتاوە «مرتب» بکەین ئەوسا بە نیسبەت نیوەی دوەمەوە سەرلەبەری «لف و نشر»ەکە دەبێتە «مشوش» چونکە وشەی غوربەت دەوەستێتەوە بەرانبەر مردن و وشەی توربەتیش بەرامبەر مان کە هیچ جێێ خۆیان نین. لە لای واتاشەوە هەر دەبێتەوە «مشوش» چونکە لە نیوەی دووەمی بەیتەکەدا ئیمکان نیە جێی «ئەگەر مرد و ئەگەر ما» بە یەکتر بگۆڕینەوە، جێ گۆڕکێیەکە هەر لە نیوەی یەکەمدا دەکرێ، لە نیوەی دووەمدا قافیە لەو جێگۆڕکێیەدا لەناو دەچێ. «ئەگەر مرد و ئەگەر ما» بە هەمە حاڵ پێشە و پاشن، هەر ئەم وەزعەیشە ڕێ خۆش دەکا کە لە نیوە بەیتی یەکەمدا «توربەت» پێش «غوربەت» بکەوێتەوە. لەم خستنە پێشە ناچارییەی «مردن»ەکەوە تێ دەگەین نالی زیاتر بە ئومێدی سەردانی دوای مەرگ...

نالی لە واتای ئەم بەیتە هی تریشی هەیە بەڵام بەرەو زیادیی هێز و بەلاغەت و ئەفسوونەوە پتر تێیدا هەڵکشیوە. من کە ماناکەم بۆ ڕوون بۆوە بە دەست خۆم نەبوو لێوم لەسەر بەیتەکە دانا و ماچم کرد. دەسەڵاتی مرۆڤ لە ئاخنینی هەڵبەست بە جوانی و نوکتە و گەوهەر لەوە تێپەڕ ناکا. فەرموو لەگەڵ مندا سەیرێکی بکە:

سەر خاتیمەیی حوسنی عیادەت کە نەهاتی
بارێ بگەرە فاتیحە وو دەئبی زیارەت

خاتیمە «خاتمة» – کۆتایی
عیادەت «عیادة» – سەردانی نەخۆش، ئەحواڵ پرسینی.
فاتیحە «فاتحة» – سورەتێکی قورئان، یاخود سەرەتا و دەستپێکردنی کار.
دەئب «دأب» عادەت، نەریت

واتایەک لە واتاکانی بەیتەکە ئەمەیە:

سەرم بوو بە کۆتایی عادەتە شیرینەکەی ئەحواڵ پرسین لە نەخۆشیدا، کە تۆ نەش هاتی بۆ لێپرسینم، واتە لە کۆتاییدا سەرەکەم تێچوو و مردم.

کەواتە جارێکیان وەرە بۆ سەر «فاتحە» و زیارەتی قەبران. واتای دوەمی بەیتەکە بە تەواویی

پێچەوانەی ئەمەیانە: سرنجێک بگرە دوو وشەی «خاتمە و فاتحە» یەکەمیان کۆتایی، ئەوتریان دەست پێکردنە. مومکینە «فاتحە» سورەی قورئان نەبێ و دەست پێکردن بێ چونکە لە بەرامبەر «خاتمە»دا هەر بۆ ئەم واتایە دەڕوا.

نەخۆشی مومکینە بە دوو جۆر کۆتایی بێت: یا مردن یا چاک بوونەوە. جارێکیان مردنەکەمان لە بەیتەکەدا دۆزیەوە و باسمان کرد، ئەم جارەیان بەرەنگاری واتای دوەمی بەیتەکە دەبین کە دژی مردنە چونکە چاک بوونەوە ڕادەگەیەنێ:

تۆ کەوا تا کۆتایی ئەم عادەتە شیرنەی سەر لێدانی نەخۆش نەهاتیە سەرم (وشەی «کە نەهاتی» لە کۆتایی بەیتەکەوە ڕاگوێزە بۆ سەرەتای، واتاکەی وای لێ بەسەر دێ: کە نەهاتیە سەر خاتیمەیی حوسنی عیادەت...) وا چاک بوومەوە هەر نەبێ جارێکیان بگرە «فاتحە – سەرەتا، دەست پێکردن»ی عادەتی زیارەتی نەخۆش دوای چاک بوونەوەی.

«فاتیحە وو دەئبی زیارەت» ئەگەر بکرێتە «فاتیحەیی دەئبی زیارەت» یا نەکرێت لە هەردوو حاڵاندا عەینی واتا ڕادەگەیەنێ. کە بڵێی «فاتیحە و دەئبی زیارەت» ئەوسا هەر دوو ووشەی «فاتیحە و دەئب» دەبنە «مضاف» واتە «سەرەتای زیارەت و عادەتی زیارەت».

واتای نیوەی بەیتی یەکەم بە هەردوو جۆریەوە دەست دەدات بۆ حاڵەتی مردن، بەڵام دیارە هەر یەکێکیان لەگەڵ «چاک بوونەوەدا» دەگونجێت.

کلیلی کردنەوەی قفڵی ئەم بەیتە ئەو «طباق»یە کە لە میانی «خاتمە و فاتحە»دا دەدیترێت، بە هۆی طباقەکەوە کە زانیت «فاتحە» هەر سوورەی قورئان نیە بیرت دەڕوا بۆ دوو جۆرە «خاتمە»ی نەخۆشی کە مردن و چاک بوونەوەیە، ئەوساش وشەی «سەر» لە خۆوە بۆت ئاشکرا دەبێ کە مومکینە ناو بێت بە واتای «راس»، مومکینیشە «ظرف» ئاوەڵ کار بێت بە واتای «علی، فوق». بە هەمە حاڵ ڕوون بوونەوەی بۆ من بەم جۆرە بوو...

لە بیرت نەچێ، ئەو کەسەی بە هەموو جوانی و کۆمەڵایەتی و هێزی دارشتن و فنونی شاعیریی بەیتەکە ڕازیی نابێ و شێرگیرە دەبێ لەسەر ڕەخنەی ناسەلمێنانە، بۆ خۆی لە هەڵبەستدا زێڕ و ئەڵماس و خۆراک و پۆشاک و خانوبەرە پێشکەشی میللەت ناکا. ئەویش لە باشترین حاڵدا چەند قسەیێکی ڕێکوپێک ڕیز دەکا و هەندێک واتای کۆمەڵایەتی، کە خۆی پێی ڕازییە، تێداوێ و ڕەنگە خەڵقی تر هەر پێشی ڕازیی نەبێ لەوانەیشە نەگەیشتبێ بە نیوەی ئەو مەودایە کە بەیتەکەی نالی تێی هەڵکشیوە لە هەموو ڕوێکەوە، واتە کۆمەڵایەتی و هونەرەوە.

با بەناو ئەم بەیتەشدا گەشتێ بکەین:

حەلقە دەرگۆشی کەفی ڕەنگینی تۆیە ئەم دەفە
با نەناڵێ لێی مەدە «عن لطمە كُف الكَف»

بیستووتە لە سەرگوزشتە و حیکایەتی ئەفسانە «عەبدی حەلقە بە گۆش»؟ ئەم حەلقە دەرگۆشەکەی ناو بەیتەکە هەرچی بیرەوەریی حیکایەتی ڕاست و ئەفسانەی سەردەمی منداڵیمان هەیە دێنێتەوە سەر پەردەی مێشکمان. لە بەیتەکەدا «حلقە دەرگۆش» هەستی مرۆڤایەتیشمان بریندار ناکا چونکە مرۆڤ تێیدا نەبووە بە بەندە، نالی دەفەی بێگیانی هێناوە و ئاڵقەکانی لێ کردوە بە ئارایشت و هۆی

زرینگانەوەش. جارێکی تریش «حەلقە دەرگۆش» دەفەکە خۆشەویستتر دەکا چونکە سکاڵای بەیتەکە بۆی دەپارێتەوە. دوای خۆشەویست کردنی دەیکا بە جێی حەسوودی پێ بردنیش کە دێ و دەیخاتە ناو ئەو دەست و پەنجە ڕەنگینانەوە.

دەفە حەلقە بە گۆشی دەستە ڕەنگینەکانی خۆتە با نەناڵێ و لێی مەدە، دەست بگرەوە لە مست لێدانی.

چ پاڕانەوەییێکی ناسکە لەم دەستە ڕەنگینانە، لە موناسەبەییێکی وا پڕ جۆش و جەزبەی دەفە لێدان و لەرزین و زرینگانەوەی ئاڵقەکانی؟ «کف الکف» چەند ڕێک هاتوون لە تەک یەکتردا! وشەی «الکف» لە کۆتایی بەیتەکەدا کە عەرەبییە پیتی «ف»ەکەی گوشراوە، واتە «شدە»ی بە سەرەوەیە. نالی کوردانە بۆ ڕاست هێنانی کێشی شیعر، گوشینەکی لاداوە و «ف»ەکەی بەرەڵڵا کردوە و وشەکەی هێناوەتە سەر زەوقی خۆمان. چەند لێی شیرینە ئەم ڕەفتارە کورتیلەی کوردایەتی؟ ناڵەی دەفی ئەڵقە بەگوێ لەبەر دەست و پەنجەی ڕەنگین چ هەستێکی نەرم و ناسک لە دەروونی گوێگردا دەبزێوێ؟ دەفە لێدانەکە خۆی چ دیمەنێکی زۆر بەرچاوی ناو ئەم تابلۆیە هونەرییەیە. «کف»، واتە «لەپ»ی ڕەنگین، عادەتی خەنە تێگرتنی دەستی ئافرەتانیش دەکاتەوە بە ئاڕایشتێکی بەیتەکە ئەو لایەنەش ڕادەگەیەنێ کەوا مەبەس لە «دەس ڕەنگینی» نەک هەر خەنە تێگرتن، بەڵکو شیرینکاری و مەهارەتی دەستەکە بێت، ئەوساش دەفە لێدانەکە لەو دەستە ڕەنگینەوە دەبێتە کارێکی پڕ هونەر و جوان. «کف و دەف»، «کف الکف» لە ڕووی مۆسیقای دەنگەوە چەند وشەی هاوئاهەنگن. وردەکاریی، کۆمەڵایەتی، تینوتاو، ئاڕایشت و مۆسیقا پڕاوپڕی بەیتەکەن. سەیرە بۆ ئەدیبی واتادۆست لەبەر خاتری باوبوونی بیرێکی سیاسی عومر کورت ئەم گەوهەرانە لە کیس خۆی بدا و بە شیعرێکدا هەڵ بلێ کە واتاکەی نەک هەر کوتراوەتەوە دە گاسنیش کراوە، بۆ خۆشی ساڵەهایە دەیکاتە بابەتی گوتار و دوان و بزووتنەوە و دروشمی نمایش، ناوناوەش ئیفلاسی کردوە و سەر لە نوێ بەرەییێک لە چەند کژ و وەرزێکی سیاسیدا کردوەتی بە سەرمایەی بازاڕێکی کاتی.

ئەمەش بەیتێکی تری نالی لەوانەی بە لێ وردبوونەوەی لانی کۆمەڵایەتی تێدا دەردەکەوێ:

دامەنی پاکی مەداری دائیرەی خامەک نیە
خوێنی مەقتوولانە وا دامێنی یاری گرتوە

جاران عادەت بوو، ڕەنگە ئێستاش هەر مابێ، پەراوێزی خامەکی مۆر بە دەور و دامەنی کەوای ئافرەتانەوە دەدوورا. نالی لێرەدا ئەم عادەتەی پۆشاکی ئافرەتی کورد دەکاتە ماکی خەیاڵبازیی و «تجرید» لە شیعردا. لەوەڕا دیارە خەیاڵ و «تجرید»ەکە زادەی واقیعێکی زیندوون نەک ڕەهەوا کەوتنی وەهم.

لە گوتەی «دامەنی پاک»ەوە ڕاستەوخۆ بیری مرۆڤ دەڕوا بۆ لایەنی «پاک دامەنی» و ڕووسووری ئافرەت کە لە کۆمەڵگەی کورددا ستوونێکی ئایین و ناموسە. تۆ سەیرێکی ورد و قووڵی ئەم کۆکردنەوەی «دامەن پاکیە»یە بکە لەگەڵ سووربوونی دامەنەکە بە خوێن... هەر دەڵێی ئاو و ئاگری لەیەک زەرفدا کۆکردۆتەوە و بەر یەکیش ناکەونەوە... دامەنی بە خوێنە بەڵام هەتا بڵێی دامەنی پاکە.

ئنجا سەیری ڕستەی «دامێنی یاری گرتووە» بکە کە ئەمیش ئیشارەیە بۆ نەریتێکی کۆمەڵایەتی ڕێز لێگیراوی «دەستە و دامەن بوون و هانا بردنە بەر». لە لایەن سۆز و هەستی شاعیرییەوە بە درەنگەوە دەگەیە پایانی جوانیی ئەم وێنەیەی ئالوودە بوونی دامێنی یار بە خوێنی عاشقان و پاڕانەوەی خوێنەکە لێی، بەوەدا کە دامەنی دەگرن و هانای دێننە بەر... کەی؟ دوای کوشتن.

نالی بەم تەعبیرانەی، بەولای دەربڕینی واتای شاعیرانەی تەڕ و پاراو و پڕسۆز و هونەرەوە، هاموشۆیەکی شارەزایانەش دەکا لە مەیدانەکانی دەستووراتی کۆمەڵایەتییدا. نالی وشکەمەلە لە هەوایێکی ژووروویی کۆمەڵدا ناکا، گەلێک پتر لە پسپۆڕێکی کۆمەڵایەتی مووچەخۆری ئیمڕۆ بە ناو پەند و نەریت و گفتوگۆ و دڵ و دەروونی کۆمەڵدا دەگەڕێ و دەستەگوڵی ڕەنگاوڕەنگی هەڵبەست دەهۆنێتەوە. کە سەیری هەموو دیوانەکەی بکەی فەرهەنگێکی کۆمەڵایەتی لێ پێک دێنێت کە دەست بدا پشتاوپشت بکرێتە دیاری و یادگار.

با لەگەڵ بەیتێکی تریدا مامڵەتێکی گەوهەر و هونەر و ئەفسوون بکەین:

زولفی دووتایی تەرازوو مەسەلی دڵ کێشت
ڕوح دەکێشن بە دووسەر ئەم بە سەرێ ئەو بە سەرێ

زولفەکان دوو تان واتە هەر یەکەیان بەقەدەر تایێکن لە زۆرییدا. وشەی «تا» بە واتای «تای مو» دێت کە زولف خۆی موە. زولفەکان دووتان، وەک یەکترن.

کە دووتان وەک تەرازوون چونکە زولف و تەرازوو هەردوویان دووتان و هەر تایەیان بەقەدەر ئەوی تر هاوکێشی یەکترن... هەر دوو زوڵفەکەش تەرازووی یەکترن.

زولفەکان کە تەرازوو مەسەلن، دڵ کێش ... دڵ دەکێشن لەبەر نازدارییان. زولفەکان کە تەرازوومەسەل بن، وشەی «کێش» خزمی تەرازووە و جێی خۆیەتی دڵ بکێشن چونکە تەرازوو ئالەتی کێشانە. بابزانین بەولای دڵ کێشانەوە ئەم تەرازووە زولفانە چ دەکێشن؟ ڕوح دەکێشن؟

تەرازووی عادەتی لەوە تێناپەڕێنێ زێڕ و ئەڵماس و گەوهەری پێ بکێشرێت، کەچی تەرازووی زولفی یار ڕوح دەکێشن. ڕوح کێشان هەر لە ڕووی وشەوە خزمە لەگەڵ تەرازوو، ڕاستە حیسابەکەی لە شوێنێکی ترە...

تەرازوو کە بابەتی کڕین و فرۆشتنی پێ هەڵکێشرێ تەنها یەک دەستەی تەرازووە کە ماڵە نرخدارەکەی تێ دەکرێ، دەستەکەی تری پارسەنگێکی تێداوێژرێ، هەر کاتێک ماڵە نرخدارەکە گەیشتە سەنگی ئەو پارسەنگەوە وە لەگەڵی جووت بوو مامڵەتەکە کۆتایی دێت. بەڵام تەرازووی دوو تای زولفی ئەو نازدارە بە هەردوو سەران ڕوح دەکێشن. واتە هەتا لە سەرێکیان وەزنی ڕوح زیاد کەی دەبێ وەزنی سەرەکەی تریشی زیاد کرێ، ئیتر ئەم کارەی ڕوح کێشان لە دوو سەرەوە کۆتایی نایێ... تەرازووی زولفی دووتای یار هەتا هەتایێ بە دوو سەران ڕوح دەکێشێ. دەستی خۆش بێ...

جگە لەم کێشانە دولانە تەرازووکارانە، ڕستەی «ڕوح دەکێشن بە دوو سەر» واتایێکی تریشی هەیە بۆ کوشتنی پاتەوپات کە لە ڕوح کێشان دەفامرێتەوە بێ «توریە» بەڵام زولفەکان لەو ڕوح کێشانەدا دوو هێندی فرشتەی مەرگ «عەزرائیل» چالاک و خێران چونکە کاری عەزرائیل لە سەرێکەوەیە کەچی

زولفەکان لە دوو سەرەوە ڕوح دەکێشن هەتا یەکێک بە مردنی خۆی دەمرێ دوو عاشق بە دەست زولفەکانەوە گیان دەسپێرن.

پێم بڵێ لێرەدا نالی چۆن بەقاڵێک و چۆن «صراف» و جەوهەر فرۆشێک بوو؟ هیچ بە بیراندا هاتوە تەرازووێک هەبێ هەتا هەتایێ لە کار نەکەوێ؟ چ شاعیرت دیوە هێندە تەرازووناس؟

ئەم هەموو بار و تاو کێش و تەرازوە بەم شێوە سیحرکارانە، خولانەوەی فکرێکی «عبقری» بە ناو کۆمەڵ و واقیع و هونەردا هێناوەتیە ناو هەڵبەستەوە.

نالی زیهنێکی وەها هەستیاری هەبوە هەر دەڵێی جامی کامێرایە لە تروکەیەکدا وێنەی جیهانێکی بەرینی تێدا نەقش بەستوو دەبێ، بە ڕواڵەتی دیمەنیش دانامەزرێ، وێنەی دەروون و وردیلەکانیشی دەکێشێ. بێگومان هونەرکار لە نەخشەکێشانی ورد و قووڵدا، مەبەستی تایبەتیشی نەبێ، وێنەکەی پڕ دەبێ لە ناوەڕۆک:

یا عەکسی ئاسمانە لە ئاوێنەدا کە وا

ئەستێرەکانی ڕادەکشێ وەک شیهابی نور

ئەمەی لە وەسفی سەرچاوەی سەرچنار گوتوە. نەخشەکێشانەکەی کەمتر نیە لە کاری کامێرا، بەڵام کامێراییێکی زیندووی زیرەکی هەستیار.

ئاوێنە بەرامبەر ئاسمان ڕاگرە لە شەودا، ئەویش وەک ئاسمان ئەستێرەی تێدا ڕادەکشێ چونکە وێنەی ئاسمان دەداتەوە بە خۆی و ئەستێرەکانیەوە. بەڵام کە بتەوێ بەمەندە ڕازیی بیت نەگونجانێک دێتە بەر، لە شیعرەکەدا دەبێتە عەیب. چۆن دەبێ بگوترێ ئەستێرەکانی ئاسمان ڕادەکشێن وەک شیهابی نور، ئەی ئەستێرەکان هەر خۆیان شیهابی نور نین؟ ئەم مەعنا لێدانەوە دەبێتە «تفسیر الماء بالماء» گەلێک کەسیش تێیدا خلیسکاوە. تەگەرەکە بەم جۆرە دەرەوێتەوە:

وشەی «ئەستێرە» دوو واتای هەیە. ئەستێرەی ئاسمان و «ئەستێر»ی ئاوی سەر زەوی کە لە فارسیدا «استخر» و لە زمانەکانی ڕۆژاوادا «cistern» ی پێ دەڵێن. مەبەستی ڕاستەقینەی ئەو دیو ڕواڵەتی بەیتەکە لە وشەی «ئەستێرەکانی»دا واتای «ئەستێر»ەکانی ئاوە لە سەرچاوەی سەرچناردا:

یا عەکسی ئاسمانە لە ئاوێنەکەدا کەوا ئەستێرەکانی ئاوی سەرچنار بە خۆی و ڕاکشانی ڕیزەی ئەستێراوەکانی هەر دەڵێی ئاسمانە و شیهابی نوری ڕادەکشێن. سەرچنار وەک ئاوێنەیێکی لێ بەسەر دێ بەرامبەر ئاسمان ڕاگیرابێ لە شەودا.

وشەی «ئاوینە» لە ڕێنووسی کۆندا دەگونجا بە «ئاوێنە» بخوێنرێتەوە بە واتای «مرآة – نەینۆک» دەشگونجا بە «ئاوینە» بخوێنرێتەوە کە وشەیێکی «وصفی»یە لە «ئاو» داتاشراوە وەک کە دەڵێی «گڵینە، مسینە، زێڕینە» بە واتای لە گڵ و مس و زێڕ دارژاراو، دروستکراو، کە بڵێی «ئاوینە» بە واتای «لە ئاو دارژراو، دروستکراو» ئەوسا دەبێتەوە سەرچنار خۆی کە بریتیە لە ئاو.

وشەی «ئەستێرەکانی» هەر وەک مومکینە «جمع، کۆ»ی ئەستێرە بێ مومکینە هەڵی وەشێنی و بیکەیەوە «ئەستێرە – کانی» کە هەردوویان حەوزی ئاون...

بشزانە لە کوردییدا دەگوترێ «ئەستێرە ڕاکشا» بە واتای «ڕاخزینی شیهابی ئاسمان».

لەم بەیتەدا نالی ئەوەی کردوە کە پێی دەڵێن «تشابک» واتە تێک ئاڵقان، بەڵام تێکئاڵقانی وشە و واتا نەک هەر وشە یاخود هەر واتا: ئەستێرەیێکی لە زاهیردا هی ئاسمان بێ، داویەتە سەرچاوەیێکی زەویی. ڕاکشانی ئەستێرەکەشی کردۆتە ڕەنگدانەوەی ئاسمان لە ئاوێنەدا کەچی لە ڕاستیدا ڕاکشانەکە هی ئەستێراوەکانی سەرزەوییە. نالی هاتوچۆ بە زیهنت دەکا لە میانی ئاسمان و زەوییدا. کە هاتی بڵێی بە ئاسمانەوە گیر بوو خێرا دەتهاوێتەوە ناو ئاوی سەرچنار، کە دڵنیاش بووی لەوە مەلە لە سەرچنار بکەی هەڵت دەداتەوە بۆ تاقی ئاسمان. شاعیرێکی عەرەب لە دوو بەیتدا «تشابک»ێکی جوانی دروست کردوە بەڵام نیو هێندەی بەیتەکەی نالی نابێ:

تشابه دمعي اذ جرى و مدامتي<br>
فمن مثل ما في الكأس عيني تَسكُب<br>
فوالله ما أدري أبالخمر أسبلت<br>
جفوني أم من عبرتي كنت اشربُ

دەڵێ فرمێسک و شەرابەکەم وەها لە یەکتر دەچن نازانم چاوم شەراب دەڕێژن یا لە فرمێسکم دەخۆمەوە. شەراب و فرمێسکی تێک ئاڵقاندوە و زۆریش تێیدا سەرکەوتوە بەڵام نە لە «تشابک»ەکەدا نیوەی ڕێی نالی بڕیوە نە ئەو هەموو ئارایشت و وردەکاریی وشە و واتای بەیتەکەی نالی لە هی عەرەبییەکەدا هەیە. لێرەدا چ مەبەستم نیە شاعیرێکی عەرەب بۆ یەکێکی کورد بشکێنمەوە، ئەگەر پێچەوانەی ئەم وەزعە هاتبا پێش و نموونەیێکی عەرەبی زاڵ بە با سەر یەکێکی کوردییدا چاوشارکێم نەدەکرد و چۆنەتیەکەم وەک خۆی دەنووسی. ئێستا موناسەبە لێی داوا کردم جارێکی تریش بەراوردی بەیتێکی نالی بکەم لەگەڵ یەکێکی وەک ئەو بەیتە لە شیعری شاعیرێکی «متصوف»ی زۆر بە ناوبانگی عەرەب و ئیسلام. «ابن الفارض» دەڵێ:

فلولا زفيري أغرقتني ادمعي<br>
و لولا دموعي أحرقتني زفرتي

نالی ئەم واتایەی هێناوە و گوێزاوەتیەوە بۆ ناو بەیتێکی خۆی:

ناری سینەم گەر نەبێ غەرقم ئەمن<br>
ئاوی چاوم گەر نەبێ سووتاوم ئەز

گومان نیە لەوەدا نالی واتاکەی «ابن الفارض»ی دەست بەسەردا گرتووە، بەڵام هونەرێکی خۆی لە داڕشتندا خستۆتە پاڵ واتا دەست بەسەر داگیراوەکەوە کارەکەی بردۆتە پایەی هاڤڕکێ «منافسە» و گرەو بردنەوە.، گرەوەکەشی بردۆتەوە. «ابن الفارض» دەڵێ هەناسەم نەبێ فرمێسکم دەمخنکێنێ، فرمێسکیشم نەبێ هەناسەم دەمسوتێنێ. «نالی»ش هەر ئەمەی گوتوە، بەڵام لە نیوە بەیتی یەکەمدا کە

دەڵێ ئاگری سینەم نەبێ غەرق دەبم پێت ناڵێ بە چی غەرق دەبێ، ناچارت دەکا برۆی بۆ نیوە بەیتی دوەم لەوێدا هۆی غەرق بوونەکەی بۆ داناوی کە فرمێسکیەتی. کە دەڵێ ئاوی چاوم گەر نەبێ دەسووتێم دیسانەوە هۆی سووتانەکەت لە هەمان نیوە بەیتدا بە دەستەوە نادا، سەرەوژێریش بیتەوە بۆ بەیتێکی تر هەر نایدۆزیتەوە. دەبێ سەرەژوور بیتەوە بۆ نیوە بەیتی یەکەم لەوێدا ئاگری سینەی بۆ هەڵگرتووی بە هۆی سووتان. ئەم هاتوچۆ کردنەت، سەرەوژێر و سەرەژوور، لە بەیتەکەی «ابن الفارض»دا نیە چونکە واتای سەرلەبەری «هۆ و ئەنجام – سبب و نتیجە»ی لە هەمان نیوە بەیتدا بە دەستەوە داوە و خۆی بەتاڵ کردەوە. نالی دوو جاران تینووت دەکا و هەر دوو جارانیش دوای گەشتێکی فکری تینوەتیت دەشکێنێ.

ئەم گوتارە بایی ئەوە ناکا، جێشی بۆ ناکرێتەوە لە گۆڤارەکەدا، کۆتایی بە قسە بێنێ لە بارەی «ناوەرۆک و ڕوخسار» چ بە جۆرێکی تێکرایی بێ چ بە نیسبەت شیعری نالی خۆیەوە بێ، ئەنجام دانی ئەم کارە دەکەوێتە گوتارێکی تر لە ژمارەیێکی تری گۆڤارەکەدا، کە هیچ بەرهەڵست ڕێم لێ نەگرێ و دەستم نەبستێ.

لەم چەند نموونەیەی ناو گوتارەکەدا هەر لایەنی کۆمەڵایەتی و وردەکاریی واتا و ئارایشتی وشە و داڕشتنی بەیتەکان مەبەستی نووسین بوە، گەلێک ڕاگەیاندنی تری مێژوویی و ئەدەبی و بەراوردیی هەن تێیاندا، درێژەیان مەودای بەرفرەوانتری پێ دەوێ لە گوتار. بە نموونەی ڕوون کردنەوەی مەبەست دەڵێم «حەلقە دەرکۆشی کەفی ڕەنگین...» لە زۆر ڕووەوە وا دێتە زیهنەوە کە نالی بەر لە جێ هێشتنی کوردستان گوتبێتی چونکە دیمەنەکە لەم بەیتە و سەرپاکی غەزەلەکەدا دیمەنێکی کورد و کوردستانە، یاخود هەر نەبێ بە نیسبەت نالییەوە لە کوردستاندا زیاتر لواوە خۆ بە دڵسۆزێکی دەستی ڕەنگین و دەفەی ئاڵقەدار بزانێ، ڕەخنەی دواتریشی لە «شێخی سەر لینگە دەستار» هەر یەکێکە لەو ڕەخنانەی پەیتا پەیتا لە شێخەکانی ناو کوردەواریی گرتوە هێز و نەفەسی شیعرەکانیش دەیانباتەوە بۆ تەمەنێکی گەنجایەتی کە «تا فەلەک دەورەی نەدا» و «ئەم تاقمە مومتازە»ی تێدا گوتوون.

سەرەڕای ئەمانە کە دەشڵێ «ڕەندم و دەستاری کەللەی من دەفە نەک مەندەفە» ئاشکرایە لە خۆڕایی ناڵێ «ڕەندم»، دیارە لە تەمەنێکدا بووە ڕەندایەتی لێ بوەشێتەوە... لەم بابەتە تێبینییانە زۆرن کە نەمهێناونەتە ناو نووسینەوە، تێکڕاشیان لە پێکهێنانی سامانی بەیتەکان بەشدارن و نرخی نووسین زیاد دەکەن. لە شیکردنەوەشدا هەر ئەوەندەم کردوە کە خۆم تێی گەیشتووم و پێویستی ڕوونکردنەوەی مەبەست داخوازیی کردوە. بێگومان زۆر واتای نهێنی تر لەو بەیتانەدا هەن کە من بۆیان نەچووم، هەندێ وردەکاریشیان تێدایە بە ئانقەست لێیان نەدوام.

دەست بژارکردنی شاگوڵ و شابەیت لە دیوانی «نالی»دا ئەرکێکی بێ کۆتاییە چونکە ئەوەندە شاکاری بێ مانەندی تێدان و شی کردنەوەشیان هێندەی بە بەرەوەیە لە ڕێی دیراسەیێکی قوڵ و بەرفرەوان نەبێ جێیان بۆ ناکرێتەوە جگە لەوە کە گەیشتن بە تەختی بنی دەریای بەیتەکانی کارێک نیە بە تاکە کەس بکرێ. ئەوەی ڕاستی بێ واتا لێدانەوەی زوربەی شیعرەکانی پێویستی بە هاریکاریی تێکڕایی ئەدیبان هەیە کە هەر یەکە چی بۆ ڕوون بۆتەوە لە نهێنیەکانی بەیت و دوو بەیتی، یا بۆی ڕوون دەبێتەوە لە دواڕۆژدا، بیخاتەوە سەر گەنجینەی مەعلووم کراوی واتای هۆنراوەکان لە هەمان کاتیشدا هەموویان یاریدەی یەکتر بدەن بۆ کردنەوەی ئەو گرێکۆرانە کە کردنەوەیان لە دەسەڵاتی تاکدا نیە و هەر گرێیەش بە لای کەمەوە دانە گەوهەرێکی لەناو خۆیدا شاردۆتەوە.

لە کۆتای ئەم بەشەی یەکەمی گوتارەکەدا دەستەو یەخەی غەزەلێکی دیوانەکەی دەبم، لە پێشەوەش دەزانم هەر هێندە واتایە لە دەریاکەیان هەڵ دێنجم کە لە زەرفی دەسەڵاتمدا جێی دەبێتەوە، دوای لێ بوونەوەی من و پڕ بوونی زەرفەکەم لەو واتایانە کەشکۆڵی چەندین «غواص»یش پڕ دەبێ لە دانە گەوهەری ژێری دەریاکە.

ئەم برە شیعرەی لێرە بە دواوە خەریکی شیکردنەوەیان دەبم نموونەی نایابترین شیعری کلاسیکی رۆژهەلاتن، کە دەڵێم «کلاسیک» چ رێگەیێک لەو شیعرانە نابڕمەوە بۆ بەراوردیی کردنیان لەگەڵ شیعری نوێدا، حەز دەکەی بیانهێنە و بە پێشکەوتووترین شیعری نوێیان بگرە. تا ئەو رۆژە شاعیری نوێی کورد دەتوانێ لەم نموونەیەی نالی پێش کەوێتەوە، کات و سەقافەت و خۆ پێ گەیاندنی گەلێک پتری پێ دەوێ لەوەندەی لەو چەند ساڵانەدا بۆی لواوە.

سەرجوملەی شیعرەکان شەش بەیتن بە پێی ئەوە کە لە دیوانە چاپکراوەکاندا بلاوکراوەتەوە. لەمەڕا وا پێ دەچێ هەندێکی لێ فۆتابێ چونکە بە عادەت، شاعیر ژمارەی بەیتەکانی لەیەک هەڵبەستدا تاک دەبوون نەک جووت.

زۆر شیعردۆستی نالیدۆستم دیوە وایزانیوە بەیتەکان هەر یەکە بۆ خۆی لە واتادا سەربەخۆیە و پەیوەندیی بەوانی ترەوە نیە. بەلام ئەم هەڵبەستەیان وەک چەندێکی تر لە دیوانەکەدا «وحدە»ی تێدایە و تەجرەبەیێکی سەردەمی گەنجایەتی نالی دەگێڕێتەوە کە گومان نیە لە ڕوودانی. فرکەی دەمار و گەرمی نەفەسی نالی لە هەڵبەستەکەدا ئەو ئیحتیماله پاشگەز دەکەنەوە کە زادەی خەیاڵ بێ. با شیعرەکان خۆیان بەدەنگ بێن و پەیامی ڕاست بوونی ڕووداوەکە ڕاگەیەنن:

سەری زوڵفت کە ڕشتەی عومری «خضر»ی نیوە هەودایە
چ هەودایێ کە هەر حەلقێکی صەد زنجیری سەودایە
بڕۆت تیغێکە وەسمەی، «صیقل»ی مەسلوول و مووکارە
کە عیشوەی جەوهەرە، ڕەمز و ئیشارەی ئاو و مەودایە
بە نەشئەی سستی و مەستی وەها مەستوور و مەخموورە
نەزانم خەو لە چاوتدایە یا چاوت لە خەودایە
لە سایەی کفری زولفت دڵ «فنا فی النور»ی ئیمانە
مەڵێن زولمەت خراپە وەسلی پەروانە لە شەودایە
هەناسەم زولفەکەی لادا و مەیلێکی نەکرد چاوی
نەسیم ئەنگووت و شەو ڕابرد و نەرگس هەر لە خەودایە
لە «دور»ی تۆیە ئەی خورشیدی پرتەو بەخشی شەوگەردان
کە نالی وا لە حالاتی مەحاقی ماهی نەودایە

نالی لەم هەڵبەستەدا پاتەوپات بزۆزییێکی دڵدارانەی کاتی گەنجایەتی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە. لە تاریکی شەودا پارێزی بردوە بۆ بالینی خۆشەویستەکەی و گەیشتۆتە تەنیشت و رۆخی تا ئەو ڕادەیە هەناسەی زولفەکەی لاداوە لە سەر ڕووی، نەک هەر لەرزاندوەتیەوە، بەلام نەوێراوە یاخود لە دەرفەتی

ڕانەدیوە ئەوەندە لەو وەزعەدا دەوام بکا یارەکەی بە خەبەر بێنێ. دزانە چوە و دزانە گەڕاوەتەوە، هێندەش تینوو و کەسەر لە دڵ بوە دوا دڵۆپی لەززەتی لەم چەند لەحزە کورتیلەیە هەڵگوشیوە و پڕ بە دڵ دەمی بردوە بۆ لای زولف و ڕومەتی تێر و پڕ سەیری ئەم ڕوخسارە پەرستراوەی کردوە و وێنەی هەڵگرتوە.

لە سەرپاکی بەیتەکاندا تارمایی نالی بە دەوری یارە نوستوەکەیەوە هەندەی دیمەنی شەوەکە ئاشکرایە. گرنگی موناسەبەکەش، بەلای باوەڕی منەوە، هۆی ئەو هەموو «اعجاز»ەیە کەوا لە سەرانسەری بەیتەکانەوە هەڵدەڕژێن. کە بە تەواوی لێیان ورد بینەوە بەسەر وشەی وادا دەکەوین لە بەیتەکاندا بە تەنها خۆی بەسە پێی بگوترێ «معجز». گڕ و سۆزی عاشق و تام و لەززەتی هەڵوەستەکەش وایان کردووە «اعجاز» و فسوون و وردەکاری ناو بەیتەکان وەک ئاو ڕەوان بن بێ قورت و گرفت، لە هەندێ شوێندا ڕەوانی ئەو فەندانە گەیشتۆتە پلەیێک هەست و زیهنی مرۆڤ لێیان هەڵدەزەلێ و بەسەریاندا تێپەڕ دەبێ.

خوێنەر دەبێ لەگەڵ من و بەیتەکانیشدا باخەڵ فرەوان بێ و پەلەم لێ نەکا. سەرەڕای پەلە نەکردن دەبێ لە لای خۆیەوە یارمەتیشم بدا لە تەواو کردنی ئەو واتایانەی بۆم تەواو نەکراون وەیاخود ترسی درێژەکێشان هەندێکی پێ بەجێهێشتووم.

با بەیتەکان بە دەنگ بێنین و من لە گوتەی خۆم بوەستم:

سەری زولفت کە ڕشتەی عومری «خضر»ی نیوە هەودایە
چ هەودایێ کە هەر حەلقێکی صەد زنجیری سەودایە

لە دیوانەکەی نالی – چاپی هەولێر – لە جیاتی «سەودایە»ی کۆتایی بەیتەکە «تێدایە» نووسراوە، ڕاستییەکەی ئەوەیە لێرەدا نووسیومە کە «تێدایە» ببێتە قافیە دوو جاران بەیتەکە دەشکێنێتەوە. جارێکیان لەوەدا کە «التزام» ناهێڵێ بە نیسبەت قافیەی ئەم بەیتەوە، قافیەکانی تر سەر لەبەریان «ملتزم»ن. «هەودا، مەودا، خەودا، شەودا، نەودا – تێدا» دەبینی لەگەڵیاندا ناگونجێ. جارێکی تریشیان لەوەدا کە واتای بەیتەکە زۆر بێهێز دەبێ و بەشێکی زلی شێوە داڕشتن و واتابازیی نالی لەناو دەچێ. بەدەم شیکردنەوەی بەیتەکە ئەم لایەنەت بۆ ڕونتر دەبێتەوە:

هەودا – موو، داو.

خضر – خدری زیندە وەیا نالی خۆی کە ناوی «خضر»ە.

سەودا – شەیدایی عیشق، شێتی.

سەودا «سوداء» – ڕەش، کە بۆ واتای عەرەبی ببەیتەوە.

واتە سەرەتای زولفت، کەوا کەمێکی یەکجار کەمە لە تێکڕای زولفەکە، نیوە هەودایێکی «نەک هەودای تەواو» بەقەدەر ڕشتەی عومری «خضر» درێژە، ئەو «خضر»ە خدری زیندە بێ کە مەشوورە لە «ئاوی حەیات»ی خواردۆتەوە و قەت نامرێ، یاخود نالی خۆی بێ. دیارە کە مەبەس خدری زیندە بێ ئیشارەی بەهێز بۆ درێژیی داوە موەکەیە، کە مەبەسیش نالی بێ خۆ بە قوربانی زولف کردن و عومر بە هیچ

دەرچواندنە لەتەک ئەو داوە مودا. هەر دوو مەبەسیش بە جووت لە بەیتەکەدا کۆبوونەتەوە چونکە وشەکانی هەر دوو واتا ڕادەگەیەنن.

هەودایەکەش چۆن هەوداییکە؟ هەر ئاڵقێکی صەد زنجیری سەودایە. واتە هەر یەکە لەو ئاڵقانەی نیوە هەودای سەری زولفی یار بەستوونی، بەرانبەر صەد زنجیری سەودایە.

دەزانین زنجیر بۆ خۆی سەراپای ئاڵقەکەیە، کەچی تاکە ئاڵقەیێکی نیوە مووی سەری زولفی، کاری صەد زنجیر دەکات.

زنجیری سەودا مومکینە «زنجیری سوداء» بێ واتە زنجیری ڕەش کە موناسیبی ڕەنگی زولفەکەیە. مومکینیشە «زنجیری سەودا» بێ کە دەکا ئەو زنجیرەی شێت و شەیدای پێ دەبەستنەوە. کەواتە لە جوانیدا ئاڵقەی نیوە هەوداییکی زولفەکە ئەوەندە کاریگەرە بەقەدەر صەد زنجیر عاشق و شەیدایان دەبەستێتەوە.

برۆت تیغێکە وەسمەی، «صیقل»ی مەسلوول و مووکارە
کە عیشوەی جەوهەرە ڕەمز و ئیشارەی ئاو و مەودایە

نالی لە تێوەڕامانی ڕووی یارەکەی بە دوا وەسفیدا دێتە سەر وەسفی برۆی.

وەسمە – دەرمانێکی ڕەشە بۆ ڕەنگ کردنی موو.

صیقل – تیژکەرەوە (بنوارە فەرهەنگی المنجد).

مسلول – دەرکێشراو لە کالان.

عیشوە – نەشوەی برۆ.

جەوهەر – نەقشی سروشتی لە تیغدا.

ئاو – زێدە سافی و ڕوونی تیغ.

مەودا – خەنجەر، تیغ، شمشێر.

وەسمەی تیغی برۆت بۆتە تیژکەرەوەی شمشێرێکی دەرکێشراو و «مووکار». برۆکەی قەوسە وەک شمشێر. وشەی «مووکار» لەوانەیە بۆ شمشێر و تیغەکە بێ بە واتای زێدە تیژی، لەوانەیشە بگەڕێتەوە بۆ برۆکەی خۆی «کە مووکار»ە و لە موو پێک هاتووە. برۆکە «مسلول»ە وەک شمشێر و تیغ چونکە لە ژێر پەردە و لەناو کالاندا نیە. برۆ بەلای «نالی»یەوە لە تیژییدا وەک تیغ وایە چونکە هێندەی تیغ جەرگ برە.

وشەییێکی قرتاو هەیە لە پێش دوو وشەی «مسلول و مووکار» کە دەبێتە «موصوف» بۆیان :«وەسمەی تیغی برۆت، صەیقەلی شمشێرێکی مەسلول و مووکارە». نەشوە و عیشوەی برۆکەی وەک جەوهەری تیغ وایە کە شەپۆل بدا لەسەر ڕووی تیغەکە. هێما و ئیشارەی برۆکان هێندە بڕندەن کاری «ئاو»ی شمشێر و خەنجەر دەکەن... تیغ کە زۆر ساف و پەسەند بوو پێی دەڵێن «ئابدار – ئاودار». ڕەمز و ئیشارەکە لە «ئاوی تیغ»یش زیاترن، هەر خۆیان وا دەبڕن دەڵێی «مەودا – تیغ»ن. وشەی «صیقل» واتای تریشی هەیە جگە لە «تیژکەرەوە»، بەڵام پێم نەکرا بەتەواوی ساغی کەمەوە و واتاکەی تری بهێنمە ناو ئەم شیکردنەوەیە.

تۆ سەیری چۆن ناونیشانی تیغ و هەموو سەروبەرێکی پەسەندیی و بڕندەیی لەو بەیتەدا کۆمەڵ کردوە

که هەمووشی خزمەتکاری برۆکانن. لە بەیتەکەدا تاکە یەک وشە پەیدا نابێ کە خزمی برۆ و تیغ نەبێ: «برۆ – تیغ – وەسمە – صقیل – مسلول – مووکارە – عیشوە – جەوهەر – ڕەمز – ئیشارە – ئاو – مەودا». کە بڵێین بەیتەکە «ظرف»ە و برۆکە «مظروف»ە هەردووویان مشتی یەکترن. کەم وا هەیە قاڵب و واتای بەیتی شیعر تا ئەم ڕادەیە بە بەر یەکتر گیرابن و یەکیان لەوی تردا غەرق بووبێ.

بە نەشئەی سستی و مەستی وەها «مستور» و «مخمور»ە
نەزانم خەو لە چاوتدایە یا چاوت لە خەودایە

ئەم بەیتە لە برۆوە دەمانگەیەنێ بە چاو...
«مستور» – داپۆشراو، پەنهان بە عەرەبی.
«مەستوور» – زۆر مەست، مەند و مەستوور بە کوردیی.
«مخمور» – سەرخۆش کە لە «خمر»ەوە وەرگیرابێ.
«مخمور» – داپۆشراو کە لە «خمار»ەوە وەرگیرابێ بە واتای ڕووپۆش. چاوەکان نوستوون، لە نوستندا شرایەوەن. سستن و مەستن... چاو کە زۆر جوان و فرشتەیی و پەری کار بوو پێی دەڵێن سست، نەخۆش، بیمار. ئەم تەشبیهەی چاوی زۆر جوان و فتنەجۆ لە ناو ئەدیبانی هەموو ڕۆژهەڵاتی ئیسلامدا باوە. نالی خۆی لە چەند شوێنی تردا چاوی یاری بە نەخۆش داناوە.

–١–

وەک «طرە»یی پیچیدەیی تۆ ساغ و شکستم
وەک دیدەیی نادیدەیی تۆ خۆش و نەخۆشم

–٢–

ابروان تو طبیبان دل افکارانند
هر دو پیوستە ازان بر سر بیمارانند

جگە لە سستی بەهۆی «نەخۆشی»یەوە، چاوەکان لێرەدا لەبەر خەویش سست بوون. چاوەکان نەک هەر سست، مەستیشن. چاو کە لەخۆوە مەست بوو دەگاتە ئەوپەڕی جوانی.

نالی چەند جاران لە وشەی «مەست» سوودی بۆ بەیتەکەی وەرگرتوە. دوای ڕاگەیاندنی «جوانی» یاریدەیێکی سستیەکەش دەدات چونکە لەمەستیدا سستی پەیدا دەبێ. لە نیوەی دوەمی بەیتەکە مەعلووم دەکرێ چەندمان کار بە سستی و بێ هێزیی هەیە. جگە لەمانە، وشەی «مەست» بە لەفز و واتاوە خزمی «مەستور»ەو لەگەڵ «مخمور»یش هاو واتایە.

بە نەشئەی ئەم سستی و مەستییە، چاوەکە «مستور و مخمور» بوە. وشەی «مستور» کە عەرەبی بێ بە واتای داپۆشراو دێت و لە «ستر»ەوە هاتوە. کە «مەستور»ی کوردیش بێ بە واتای زێدە مەست دێت.

مەستوور وشەیێکە لە مەست وەردەگیرێ وەک «ڕەنج، ڕەنجور – گەنج، گەنجور...» دەشگوترێ «مەند و مەستوور».

وشەی «مخمور» ئەویش دوو واتای هەیە یەکیان «سەرخۆش» کە لە «خمر –شەراب»ەوە وەرگیرابێت، ئەوی تریشیان «ڕووپۆش کراو» کە لە «خمار»ەوە هاتبێ، لەمەڕا جارێکیان دەبێتە خزم و هاودەنگی «مەست» و جارێکیشیان هی «مستور».

واتە مەستیی چاوەکان لەگەڵ سستی نەخۆشییان و هی خەو لێ کەوتن و وەزعی کەوتنە سەر یەکتری برژۆڵە و پێڵوەکانیان وەها پەنهان و ژێر پەردەی کردوون هەر دەڵێی «ستار و خمار»یان بەسەردا هاتووە... چاوەکە پەنهانە، سستە، مەستە... بەرەو ئەوە دەچێ وەک خەوی لێ بەسەر بێ کە ئەویش پەنهانە لە چاوەکەدا. خەو بۆ خۆیشی «سستیی مطلق»ە.

کە ئەم هەموو سستی و مەستی و پەنهانییە لەو چاوە خەو لێ کەوتوانەدا کۆبۆوە نالی هەقیەتی بشێوێ و بڵێ:

نەزانم خەو لە چاوتدایە یا چاوت لە خەودایە

لەم نیوە بەیتەدا نالی گەیشتۆتە پایەیێک لە هونەر و هەستیارییدا کە بەڕاستی پێی دەگوترێ «اعجاز». بە تین و هۆندنەوەییێکی ساحیرانە وشەی «مادی و معنوی» وەها تێکهەڵکێشاون و تێکەڵ بە یەکتری کردوون کە خەوی «موهوم» لەگەڵ چاوی «موجود» وەک ئەصل و وێنەیان لێ هاتووە... لە یەکتر جودا ناکرێنەوە و نازانرێ کامیان لە کامیاندایە.

لە سایەی کفری زولفت دڵ «فنا فی النور»ی ئیمانە
مەڵێن «ظلمة» خراپە وەصلی پەروانە لە شەودایە

وشەی «ظلمة» دوا پیتەکەی دەبێ بخوێنرێتەوە و نەکرێتە «هاء السکته» واتە ببێتە «ظولەت – زولەت» بە شێوەی خوێندنەوەی کوردی، تاکو کێشی تێک نەچێ.

لە سایە – لەبەر خاتر.

لە سایە – لە سێبەردا.

کفر – پێچەوانەی «ایمان». شاردنەوەی حەقیقەت.

فنا «فناء» فی النور – نەمان و توانەوە لە ڕووناکاییدا، وەک «فناء فی الله» بە مەزهەبی صۆفییان.

پەروانە – ئەو پەپوولەیەیە کەوا شەو بە دەوری ڕوناکیدا دەخولێتەوە.

لەم نیمچە ڕستەیەی «لە سایەی کفری زولفت» نالی چوار تاریکایی کۆکردۆتەوە.

١– سایە: بە واتای سێبەر.

٢– کفر: کە داپۆشینی ڕاستییە و بە لای موسڵمانەوە شەوەزەنگ خۆیەتی.

٣– زولف: کە ڕەنگەکەی ڕەشە و وەک شەو بەسەر ڕوناکایی ڕوویدا هاتووە.

٤–شەوەکە خۆی کە لە تێکڕای بەیتەکاندا هەیە.

لە سایەی کفری زولفت دەشێ «بەهۆی کفری زولفت وەیا خود لە سێبەری کفری زولفت»ەوە بێ.

زولفەکەی داناوە بە «کفر» لەبەر سەختی و خەستی ڕەشایی ڕەنگەکەی. کفریش «شاردنەوەی ڕاستییە» لەوەڕا زولفەکە و کفر هەردوویان وەک یەکترن چونکە زولفەکەش ڕۆناکایی ڕووی داپۆشیوە. ڕوەکەش وەک «نوری ئیمان» وایە لەبەر زێدە پاکی و سپیەتی و بێ گەردیی.

دڵەکەی «فنا فی النور» بوە، لە ناو ڕۆناکایی «فانی» بوە و تواوەتەوە.

لە سایەی کفری زولفت یاخود لەبن سێبەری کفری زولفتدا، کەوا ڕەش ڕەش کەوتۆتە سەر سپیەتی ڕوخسارت وەک کفری بەسەر ئیماندا بێ، دڵەکەم فانی بوە لەو نورەدا کەوا لە بن سایەی کفری زولفتەوەیە. یاخود شیدەتی کفری زولفت هێندەی لە جوانی ڕووی تۆ زیاد کردوە دڵم بۆی فانی بوە... تاریکی و کفر و سێبەر دەوری ئەو نوری ئیمانەیان داوە کە ڕووی تۆیە. نالی هەرچەند ناوی «ڕوو» ناهێنێ بەڵام بەهۆی تێکڕای مانای بەیتەکە بە تایبەتی لە وشەی زولفەوە، لزوم بەوە نەماوە ناوی بێنێ.

مەڵێن «ظولمەت – زولمەت» خراپە وەصلی پەروانە لە شەودایە تازە کێ ڕێی هەیە باسی تاریکایی بکا بە خراپە.

ئەم شەوەی کۆتایی بەیتەکە چ شەوی ڕاستەقینە بێ کە نالی تێیدا چوە بۆ پارێزی یارەکەی، چ سێبەر و کفری زولف بێ کە ڕووی یاریان لەناو خۆیاندا گرتوە و بەناو واندا نالی لێوی بۆ دێنێ، لە هەردوو حاڵدا نالی وەک ئەو پەروانەیە وایە کە لە تاریکایی شەودا دەوری شەوقی مۆم یا ئاگر هەڵدێ و بە وەصلی دەگا هەرچەند لەو وەصلەشدا دەسووتێ... دڵی نالیش کە «فنا فی النور» بوە پەروانەیە و بە ئاوری وەصل سووتاوە لە شەودا، کە شەوی ڕاستەقینە یا مووی زولف بێ.

هەناسەم زولفەکەی لا دا و مەیلێکی نەکرد چاوی
نەسیم ئەنگووت و شەو ڕابرد و نەرگس هەر لە خەودایە

ئەم بەیتەیان هەم لەبەر ئاشکرایی واتاکەی هەم لەبەر ناوبانگی زۆری، لەوە دەرچووە پێویستی بە شیکردنەوە هەبێ. هێندەش نازکە لە ڕووی داڕشتن و واتا و وێنەکێشان و تەشبیهەوە دەستی لێ نەدرێ چاترە. وەک بەلوورێکی پاک و ساف و بێ گەرد وایە هەموو شوێن پەنجەیێکی لێ دەبێتە عەیب. لەمەوپێش بۆ زمانی بێگانەش تەرجەمە کراوە.

برا نالی ئەگەر ڕاستت کردبێ کە دەڵێی «نەرگس هەر لە خەودایە» سوێند بە شاعیریی و خولیا و دڵداریت دەخۆم نەتوێراوە هێندە لێو لە لێو و ڕوومەتی توندکەی بەخەبەری بێنی.

دیتومە بەیتەکە وەها نووسراوە وەک من نووسیومە، لە هەندێ نوسخەی تردا «چ مەیلێکی نەکرد چاوی» نووسراوە.

من کاری زۆرم بە بەیتی کۆتایی غەزەلەکەوە هەیە.

لە «دوری» تۆیە ئەی خورشیدی پرتە و بەخشی شەو گەردان
کە نالی وا لە حالاتی محاقی ماهی نەودایە

ئەوەندەی گوێم لێ بووبێ یەکێک ئەم بەیتەی خوێندبێتەوە یاخود واتاکەی لێکدابێتەوە وشەی «دور»ی سەرەتای بەیتەکەی بە «دوور، دوور –بعید» خوێندۆتەوە. بەو پێیە دەبێ لە نووسیندا بەم شێوەیە بنووسرێت «لە دووریی تۆیە». کە بیخەینە سەر رێنووسی زوربەی نووسەرانی ئەم رۆژانەمان دەبێ وەک ئەمە بێ: «لە دووری تۆیە». لە نوسخەی دیوانەکانیشدا چ دەسخەت چ چاپکراو هەروەها نووسراوە. کە ئەمە قبووڵ کەین واتاکەی وەک رواڵەتی وشەکان رای دەگەیەنن وەها دەبێ:

لە دووری تۆیە ئەی رۆژی رۆناکایی بەخش بۆ ئەوانەی بەشەو دەگەڕێن کەوا نالی کەوتۆتە حاڵەتی هیلالی نوێ لە محاقدا. واتە بەهۆی دوورییەوە لە تۆ نالی وەک هیلالی نوێ کەوتۆتە حاڵەتی محاق و نەمانەوە.

ئەم واتایە کە هەموو ئەو ئەدیبانەی من دیومن پێی رازین تەڵەیێکە و نالی بۆی ناونەوە، بەتەڵەوەش بوون.

نالی لە هەر پێنج بەیتی پێشووتردا باسی نێزیکی خۆی دەکا لە یارەکەی تا دیتمان لێوی گەیاندە دەم و لێوی، ئەم دورکەوتنەوە لە کوێوە هەڵقووڵی؟

ئەوەی راستی بێ کە بێی و لە تەڵەکە رەها بیت دەبینی هەرچی دورییە لە بەیتەکەدا نیە، بە پێچەوانە، ئەنجامێکی ئاسایی و یەکجار شاعیرانە و دڵدارانەی هەر پێنج بەیتی پێش خۆیەتی. ئەم بەیتەیان لە هەمووان پتر نێزیکی نالی لە یارەکەی نیشان دەدا تاکو دەتوانین بڵێین غەزەلەکە مشت بوە لە وەصل و نێزیکی. با بزانین چۆن!

وشەی «دور» لە رێنوسی کۆندا دوو جۆر خوێندنەوە هەڵدەگرێ، یەکێکیان ئەو تەڵەیە بوو باسمان کرد «دوور – دوور بە واتای بعیدی عەرەبی». جۆری دوەمی «دەور»ە کە بەواتای تەنیشت و رۆخە.

واتە ئەی خورشیدی رووناکی بەخش بۆ ئەوانەی بەشەو دەگەڕێن کە نالی خۆی یەکێکە لەوان و بەشەو چۆتە بالینی یارەکەی، لەبەر نێزیکی لە دەور و تەنیشتی تۆدا نالی کەوتۆتە حاڵاتی محاقی مانگی نوێ. مانگ کاتێک دەکەوێتە حاڵەتی «محاق» کە یەکجار لە رۆژەوە نێزیک بێ نەک لێی دوور بێ... کە لێی دوور کەوتەوە دەبێتە «بدر». مانگ هەتا لە رۆژەوە نێزیک بێ جورمی نامێنێ. بەو پێیە هەرچەند لە رواڵەتدا «محاق» نەمان و فەوتان رادەگەیەنێ لە راستییدا ئەوپەڕی نێزیکی و گەیشتن بە یار لەو محاقەدایە. نالی هەرگیز لەو حاڵەی خۆشتر نەبووە و نابێ کە هێندە لە یاری نێزیک بۆتەوە وەک هیلالی کاتی محاقی لێ هاتوە و لەگەڵ رۆژدا جووت بوە.

وشەی «شەوگەردان» واتای «شەوگێڕەوە»یشی هەیە. شەوگەرد جانەوەرێکیشە وەک ماناکەی بەشەو دەگەڕێت.

نالی رێی هەیە خۆی بە هیلالی حاڵەتی محاق دابنێ چونکە یارەکەی دانا بە خورشید و خۆیشی لە نوری ئەودا غەرق بوو بوو.

سرنجێکی ورد بگرە لە «ماهی نەو». ئەم وشەیەی «نەو» پێویستی قافیە داخوازیی نەکردوە، واتای شیعر و هەڵوەستی نالی خۆی بە «ماهی نەو» نەبێ راست نایێ، با بڵێم زێدە جوانیی بەیتەکە بە هۆی ئەم وشەیەی «نەو» پەیدا بوە.

هیلال لە دوو حاڵدا خۆی لە محاقدا دەبینێ: یەکەمیان لە کۆتایی مانگ، واتە رۆژی ٢٩ وەیا ٣٠ مانگی عەرەبی. لەم حاڵەدا هەڵاتنی لەگەڵ رۆژ لە سبەینەدا دەبێ. دوەمیان ئەو محاقەیە کەوا بەر

سەرەتای مانگ دەکەوێ واتە هیلالەکە لە محاقی سبەینەوە کەم کەمە بەرەو دوای قورسی ڕۆژ دەبێتەوە تا وای لێ دێ ئاوا بوونی مانگەکە لە ئێوارەدا دەکەوێتە سەر حیسابی شەو.

لەمەڕا مەعلووم دەکەیت هیلالی محاقی مانگی کۆن بەسەر ڕۆژی ڕووندا دێت کە ئەمە هیچ لەگەڵ وەزعی نالیدا ڕێک ناکەوێت، بەڵام محاقی «ماهی نەو» ئەو محاقەیە کە هیلالەکە تێیدا بەرەو شەو دەبێتەوە، کە ئەمەیش حاڵی ڕاستەقینەی «نال»یە. کە دەشڵێ «حالاتی محاقی ماهی نەو» هەموو سەروبەرێکی ئەو محاقە و ئەنجامەکەی دەگرێتەوە چونکە «حالات» کە جەمعە بە بەریەوە هەیە حاڵی ئێستاکە و دواییش ڕابگەیەنێ لەو ڕووەوە کەوا هیلالەکە وردە وردە لە محاق دەردەچێت و دەبێتە یەک شەوە و دوو شەوە و... هتاد. نالیش وەک ئەو هیلالە وایە لە کۆتایی شەودا لە یارەکەی دوور دەکەوێتەوە «وجود» پەیدا دەکاتەوە... چ سەیر نیە دوای ئەو خۆشییە زلەی گەییشتن بە یار و وەدەست هێنانی پیرۆزیی و سەرکەوتنی وەها گەورە، نالی وەک مانگ لە زیاد کردناد بێ.

وەک گوتم شیعرەکان تەجرەبەیێکی زیندووی سەردەمی گەنجایەتی نالی دەگێڕنەوە، دەمودووی هەڵبەست ئەوەندە نەفەس گەرمە ڕێ نادا خەیاڵ بۆ هێندێ بڕوا کەوا نالی بە زیهنکاریی و وشەسازیی و دەسەڵاتی شاعیریی خۆی ئەم وێنە ئەفسووناوییەی لە وەهمەوە هێنابێ. سەیر کە، چونکە حیکایەتەکە ڕاستە، نالی چەند زمانی گرتوە لە وشەی پاتەوپات «صریح»: ئەگەر «مەڵێن زوڵمەت خراپە» و هەناسەم زولفەکەی لا دا» و ڕستەی وەها سەرپۆش کراو نەبان لەوانە بوو بیریشمان لەوە نەکردباوە کە نالی ڕووداوێکی ڕاست دەگێڕێتەوە. لەو هێرشی کە بۆ سەر «مەستوورە»ی بردوە چونکە هەموو قسەکانی زادەی خەیاڵن وهەڵبەستراون جڵەوی بۆ قەڵەمی شۆڕکردۆتەوە بێ پەروا زار شڕی خۆی دەکا. وا دەزانم لە ڕووی تەمەنەوە ئەم برِە شیعرە و هێرشەکەی سەر مەستوورە هاوچەرخ بن. گوتەی بەرامبەر «مەستوورە» و کردەوەی ناو ئەم بەیتانە لە تەمەنی گەنجایەتی دەوەشێتەوە، گەنجایەتیش جارێکە و نابێ بە دوو.

## بەشی دووهەم

لە بەشی یەکەمی ئەم گوتارەدا بە خوێنەرم ڕاگەیاند باسی «ناوەڕۆک» بە گشتی و بە جۆرێکی لێی بوەشێتەوە لەوێدا جێی نابێتەوە، ئەوەشم خستە سەر قسەکانم کە درێژەی باسی ناوەڕۆک بە ناچاری کەوتە ناو بەشی دوەمی کتێب «حاجی قادری کۆیی»یەوە چونکی لە بەشی یەکەمدا جێی نەبۆوە هەرچەند دەمێکیشە لە نووسینی بوومەتەوە. بە داخەوە ئەم باسە بەدبەختە لە بەشی دوەمی «حاجی قادر»یشدا بێ مراد بوو، دەبێ چاوەنۆڕی بەشی سێیەمی بێت.

لە بەشی یەکەمی ئەم گوتارەمدا کورتەیێکی بیروباوەڕی خۆم لە بارەی ناوەڕۆکەوە نووسی و بە دوا ئەودا کەوتمە سەر دۆزینەوەی واتای سەر بە کۆمەڵایەتییەوە لە هەڵبەستەکانی نالیدا. مەنتیقی نووسینەکەم لێم داخوازیی دەکات، کە من ڕێم نەبێ بە درێژیی لەسەر «ناوەڕۆک» بنووسم، دەبێ دەورێکی سەرەباسی «ناوەڕۆک لە شیعری نالی» بدەم کە خۆی یەکێکە لە سەرەباسە بنجییەکانی ئەم گوتارە و قەرزێکە بەسەرمەوەیە بەڵام لە نووسینمدا نامەوێ پێشبڕکێ لە خۆم بکەم بۆ مەبەسی زووتر گەیشتن بە شیکردنەوەی ئەو سەرەباسە. من جڵەوی قەڵەمەکەم ناوەتە دەست هەڵبەستی نالییەوە، بۆ چ لایێکی ببات بەدجڵەویی لەگەڵدا ناکەم. بە پێی باوەڕی خۆم لە هەر شوێنێکی گوڵزار و چەمەنزاری ئەدەبی نالی گەشتی دڵ و زیهن بکەین خۆشییێک دەدۆزینەوە کەوا لەوێدا نەبێ نادۆزرێتەوە، لەکیسدانیشی جێی پڕ نابێتەوە.

بێگومان باسی ناوەڕۆک لە شیعرەکانی هەر بەوەندە تەواو نابێ بڵێین لایەنی کۆمەڵایەتی و نەریت و داب و دەستووری بەیەکەوە ژیان لە نوکتە و وردەکاریەکانی دەدرەوشێنەوە و بەوەدا نالی لە توهمەی وشکەمەلەی خەیاڵبازیی ڕووت و ڕەهەوا کەوتنی هونەری سەراویی و بێ بنجی مادی بپەڕێنینەوە، ڕاستی گوتە ئەمەیە ئەوەندە دوانە کورتە سەرەتاییێکە لە باسی پڕ دەنگ و صەدای ناوەڕۆک لە شیعری «نالی»دا.

بەڵام بەر لەوەی هیچ بڵێم لەبارەی ئەو ناوەڕۆکەوە پێویستە تێبینیەکی گرنگ دەربڕم وەک پێپلکە بێ لەبەر هەنگاومان بەرەوژوور و سەرەوهەوراز بۆ ناو واتا و ناوەڕۆک لە باغ و ڕاغ و گوڵ و گوڵزاری نالی کە خۆی زۆر ڕاستگۆیانە و بە ئینسافەوە بانگهێشتنمان دەکا بۆی بەم دێرە شیعرەی وەک کارت بانگهێشتن:

وەرە سەیری خیابانی بەیازی دەفتەری «نالی»
کە صەفصەف مصرعی بەرجەستە ڕیزی سەروی مەوزوونە

تێبینیەکەم بریتیە لەمە: مرۆڤێک کە گەیشتە پایەی نالی لە بوێژییدا، هێندەی بەدیهیە دیارە مەیدانەکانی پڕ دەمەتەقەی وەک بەهرەی خۆرسک و هەست و نەست پڕبوون لە دیمەنەکانی ژیانی کۆمەلایەتی و شارەزابوون لە زانست و هونەری باوی ڕۆژگاری خۆی و پەیدا کردنی قەناعەتی تایبەتی لە سەرجوملەی بوون و مردن و ژین و چاکە و خراپەدا... ئا ئەم مەیدانانەی هەموو پێچاوەتەوە و کردوونی بە یەکێک لە گۆڕەپانە مەعنەویەکانی ناو جیهانی فرەوانی دەروونی خۆی ئەوسا گەیشتووە بەو دەسەڵاتە کە شیعری وەها بهۆنێتەوە خەریک بێ لەبەر پڕ مەعنایی و نوکتە و نازکی بتەقێتەوە.

هەڵاخنینی شیعر بە واتا و هونەر کارێکە نە هی بەهرەی تەنها نە هی پێگەیشتنی تەنهایە. دەبێ بەهرە و پێگەیشتن، واتە زات و بابەت – دەروون و دەرەوە، لە هەڵاخنیندا بەشدار بووبن لەم بەشداریەشدا بە ڕادەی لەنگەرڕاگرتن و پارسەنگ کردنی هەردوو لایان دەسەڵاتی شاعیر خۆ دەنوێنێ. فەرموو سەیرێکی ئەم یەک دوو نموونەیە بکە لە شیعری نالی کە پارسەنگ بوون و لەنگەربەستنی باس کراویان تێدا بەدی دەکرێت. نموونەی یەکەم:

«طرە»ت وەکو تووماری شکستە و سەری کوڵمت
بۆ نووری سەودام بوەتە شەمعی موتاڵا

نموونەی دووەم:

لەم «پارچە لۆکە» هەورە بەقەد ڕووی هەموو زەمین
بەم ڕایەڵە قەدیفەیی سەوزی عەجەب تەنی

لە نموونەی یەکەمدا چی لە توانای ئادەمیزاد بێ کۆبۆتەوە لە واتای سەر بە نووسین و خوێندنەوە و تاریکی و ڕووناکی و ڕاگرتنی هەر چشتە بەرامبەر هەم جینسی خۆی و دارشتنی قاڵبی جوانی لە ناو بۆتەی عیشق و تێک ئاڵاندنی حەقیقەت و مەجاز و تێوەرپێچانی تەوریە بە دەوریانەوە... هەمووش لە دوازدە وشەدا. تۆ سرنج بگرە لە تاکە وشەی کۆتایی بەیتەکە کە «موتاڵا – مطالعه»یە چۆن بەتەنها لەلای خۆیەوە بوەتە ئاوێنەی قودرەت هەموو تیشکێک دەداتەوە کە لە وشەکانی «طرە، توومار، شکستە، کوڵم، نوری، سەودا، شەمع» هەڵبستێتەوە.

وشەی شکستە بە هەردوو واتای بەسەر یەکدا شکانەوەی مووی طرە – خەتی شکستەی فارسی کە طرە و توومارەکەی پێ نووسرابێ لە ئاوێنەکەدا دووبارە دەبێتەوە، هەروەها وشەی «سەواد» ئەویش بە هەرسێ واتای «ڕەشایی شەو – ڕەشکێنەی چاو – خوێندەواریی». خۆشت دەزانیت شەمع لە شەودا پێ دەکرێت تاکو چاو شتی لەبەر بخوێنینەوە با ئەو شتە تووماری شکستە بێ. بەڵێ وشەی «موتالا» ئەمانە بە تێکڕایی عەکس دەکاتەوە بێ ئەوە یەک زەرەر لە تیشکی هیچ کامێککیان بەخەسار بدات. کە بێیین و لە ناو هەموو وشەکاندا بێ دەسبژارکردن وشەی «تومار» هەڵبژێرین بۆ دۆزینەوەی دەسەلات و بلیمەتی شاعیریەت تێیدا، شەپۆل شەپۆل، ئاورینگی ئەو دەسەلات و بلیمەتیە بە ڕووماندا دەپژێ.

توومار لە لایێکەوە شتێکی نووسراوە هەم لەگەڵ «طرە»دا دەگونجێ کە نووسینی تێدایە و لەو ڕێگەیەوە بە یەکتر تەشبیهـ کراون، هەم دەبێتە ئەو پێشەکیەش کە لە ئەنجامی بەیتەکەدا موتالا دەکرێ هەرچەند لە بەیتەکەدا پەیوەندیی ڕاستەوخۆی موتالا بە وشەی «سەری کوڵم»ەوەیە کە وا بۆتە «شەمعی موتالا» کە لە شەودا هەڵدەکرێت،. ڕەشایی و درێژیی شەوەکەش بەهۆی وشەی توومارەوە لە بەیتەکەدا لەوەڕا دێت کە توومار لە لایێکەوە مەشوورە بە درێژیی لە لایێکی تریشەوە موی ڕەشی «طرە»ی یاری پێ تەشبیهـ کراوە. توومارەکە سەرەڕای بە دەستەوەدانی «ڕەشایی و درێژیی» کە هەم جینسی مووی «طرە» و شەون، جارێکی تریش وەسفی جوانی موەکە دەکات بەهۆی وشەی «شکستە»وە کە ڕادەگەیەنێ داوە ڕەشە درێژەکانی موەکە چین چین بەسەر خۆیاندا شکاونەوە. لە لایێکی تریشەوە ئەم توومارە کە بە وێنەی بەرچاو «شکستە» و بەسەرخۆیدا شکایەوە بوو لە هەمان کاتدا تووماڕێکی نووسراوە بە خەتی «شکستە» کە جۆرێکە لە ڕێنۆس و زۆر باو بوو لەو سەردەمە ڕابردوەی ڕۆژگاری نالیدا، بەوەشدا «طرە»ی یار بە تەواویی دەبێتە بابەتی موتالاکەی کۆتایی بەیتەکە. لەمانە هەمووی گەڕێ و بە چاوێکی دڵ و دەروونت سەیرێکی ئەم دیمەنە ئەفسووناوییەی دەورەدانی تورڕە و توومارەکە لە کوڵمی یار بکە کە بۆتە شەمعی موتالا، لێت دەشێوێ و نازاینت موتالای تۆمارەکە بکەیت لەبەر شەوقی مۆمی سەری کوڵمی یاخود لە ناو شەوەزەنگی موەکاندا موتالای مۆمەکە خۆی بکەیت کە سەری کوڵمیەتی.

لە نموونەی دوەمدا نالی شارەزایی بە سروشت و بە کۆمەڵایەتی وێکڕا کۆ دەکاتەوە و دەستڕەنگینانە تابلۆییێکی هونەریی ئەفسووناویی ئەوتۆ لە کۆکردنەوەی هەردوان پێک دێنێ و بە چەشنێک لە تابلۆکەدا تێکیان هەڵدەکێشێت و دەیانهۆنێتەوە مرۆڤ نازانێ کامیان کامن.

«پارچەلۆکە»ی هەورەکە دەشێ بە واتای پارچە پەمۆ بێ یاخود بە واتای پارچەی بچووک بێ کە بڵێین قالبە دارشتنی «تصغیر»ی پارچەیە وەک دەڵێی «تەشبیلۆکە، جۆگەلۆکە...»، ئا ئەم پارچە لۆکەیەی هەور لە بەرزایی ئاسمانەوە بە ڕایەڵەی داوی باران دەبێتە قەدیفەی سەوز و ڕووی زەمین دەتەنێ بە سەوزایی بەهار چەند سنعەتکارێکی شارەزایە کە دەتوانێ ئەم کارگەیەی تەنینی قەدیفە لە هەور و باران پێک بێنێ و لە لۆکەی هەور «یاخود لە هەوری کەم» قوماشی سەوزی بەرین بچنێ بە قەد ڕووی هەموو زەمین. سەنعەتکاریی و وەستایی بەهار لەم چنین و تەنینەدا دوو جاران موعجیزە پێک دێنن یەکەمیان لەوەدا کە هەوری کەم دەکاتە قەدیفەی زۆر دوەمیان کە ڕەنگی هەورەکە لە سپیەوە دەگۆڕێ بە سەوز چ دەرمانێک و ئەجزاییێکی کیمیاویشی بەکارنەهێناوە. گەلێک جار لە وەسفی ئەم بەیتەدا گوتومە کاری تەنینی قەدیفە لە کارگەی ڕاستەقینەدا هەر بە قەد بەیتەکەی نالی ڕێکوپێکە و هەر هێندەی ویش زەحمەتی تێدایە

چونکە بەڕاستی هونەرەکەی نالی لەم بەیتەدا هەموو سنوورێکی بەرچاوی هونەر و شیرنکاریی و شۆخی و دەستڕەنگینی تێپەڕاندوە.

خواجە «کلیم همدانی» لە وەسفێکی بەهاردا ئەم بەیتەی گوتوە کە ئەویش بەڕاستی شاکارێکە یەکجار کەم مانەندە:

از بهر سبقت بیرون شدن شکوف برگ
در تنگنائی شاخ درخت میکنند جدال

واتە «بۆ پێشبڕکێی زووکردن لە هاتنە دەرەوە، گوڵ و گەڵا لە تەنگژەی لکەداردا زۆرە ملێیانە» بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو جوانی و هونەرەشدا بەیتەکەی «خواجە کلیم» لە تەک هینەکەی نالیدا ئەوەندە محدوود دێتە بەرچاو دەشێ ببێتە نەقشێکی ئەو قەدیفەیەی ناو بەیتەکەی نالی.

نامەوێ غەدر لە کەلیم بکەم بە شکاندنی بەیتەکەی لە ڕێی هێنانەوەی هەموو واتای بەیتەکەی نالی کە لە سروشتی بەهاری تێپەڕاندوە و بەولای بەهارەوە باوەشی بە کۆمەڵایەتیدا گرتوە و هەردوکیانی پێکەوە کردووە بە کەرستەی ملکەچ بۆ هونەر و جوانی لە حاڵێکدا بەیتە نازدارەکەی کەلیم وەک بووکی جوان لە ناو کەژاوەی سروشتدا خەملێوە و ئاورینگەکانی لە پەردەی دەوری کەژاوەکەوە ئاودیو نابن بۆ کۆمەڵایەتی. بەڵێ نە بەیتەکەی کەلیم دەشکێنم بە خنکاندنی لە ناو تۆفانی واتای شیعرەکەی نالی نە لێرەشدا چ ئیشێکی زۆرمان هەیە بە قووڵ بوونەوە بۆ تەختی بنی گۆمی بەیتەکە چونکە لەو نموونانەدا تاکە مەبەس ئەوە بوو ڕاستییێکی گرنگی ئەدەب ڕوون کەینەوە کە بریتییە لەوە هەڵاخنینی شیعر بە واتا و جوانی تا ڕادەی مشت بوون و لێ ڕژان کاری تاکە هۆی هونەر وەیا تاکە هۆی پێگەیشتن نیە. هەردوو هۆ دەبێ کۆببنەوە تا بتوانن ئەفسوونی بەهرە وەرگێڕنە سەر گوتەی زمان، لە کۆبوونەوەشیاندا بە ڕادەی لەنگەر بەستن و پارسەنگ بوونی هەردوویان لە دوو دەستەی تەرازووی بەیتی هەڵبەستدا دەسەڵات و هێز و دەستڕەنگینی شاعیر خۆ دەنوێنێ.

کە سرنجت بدەیتە دوو نموونەی سەرەوە دەبینی ئەم لەنگەربەستن و پارسەنگ بوونە لە هەردوو بەیتەکاندا بە چەشنێک لە سەرانسەری داڕشتنی ڕستەکانیان داوەستاوە و هێندەیان وەستایی تێدایە لە لای خۆیانەوە بە زیادەوە لە شیرین و ئارایشتی هەردوان زیاد دەکەن. من لێرەدا مەسەلەیێکی کوردیم بە بیر دەکەوێتەوە کە دەڵێ «خوا بدا پێغەمبەریش نەختێکی دەخاتە سەر». تۆ سەیری «پارچەلۆکە» بکە کە گوتم دەشێ «پارچە لۆکە، پەمۆ» بێت و دەشێ «پارچەلۆکە، پارچەی بچووک» بێت کە قاڵبە داڕشتنی چووک کردنەوەی «لۆکە»یە، چۆن بەم دوو واتایە لەنگەری خۆی ڕاگرتووە هەم لەگەڵ کەرستەی دروست کردنی قەدیفە کە لۆکەکەیە، هەم لەگەڵ مەهارەت و ئیعجازکاریی بەهار کە لە پارچەیێکی بچووکی هەور بە پانایی ڕووی زەمین سەرپۆشی قەدیفە دەتەنێ. لە بیریشت بێ نالی ئەم هەڵسووڕ و داسووڕە هونەرکارانەی بێ سەروبن لە ناو تەنگژەی پێداویستی کێش و قافیەدا دەکات کەچی هەر دەڵێی سواری قالیچەی سلێمان پێغەمبەر بوە و لە ئاسمانی بەربەڕەڵڵای بێ سنووردا پێی دەفڕێ.

کە وتووێژمان سەری کێشایە سەر لەنگەربەستن و پارسەنگ بوون، لەو ناوەشدا نموونەی

بەراوردکردنمان لە شیعری شاعیرێکی فارس هێنایەوە کە «خواجە کلیم همدانی» بوو، وا بە چاک دەزانم نموونەیێکی پێشکەوتوو لە شیعری شاعیرێکی بەناوبانگی کوردیش بێنینەوە بۆ مەبەسی بەراوردکردنی بێ تەرەفانە لەو ڕووەوە کە ئەم جارەیان هەردوو شاعیر کوردن و خەڵقی ناوچەیێکیشن. پیرەمێرد ئەم بەیتەی بە سەر زاری «زین»دا هێناوە:

خەنجەر بۆ دڵە گەر ڕاستت دەوێ
ئاخ مەمی تیایە نەک بەری کەوێ

نالی ٧٠ ساڵ پتر بەر لە پیرەمێرد دەوری واتای ئەوتۆیی هەڵاتوە و بوونی خەیاڵی یاری لە دڵدا بەم بەیتە جوان و نازدارە نەخشە کێشاوە:

تۆ کە حۆری وەرە نێو جەننەتی دیدەم چ دەکەی
لەم دڵەی پڕ شەرەر و سینەیی سووزانمدا

گەلێک لە شاعیرانی کورد و غەیری کورد ئەم واتایەیان کردوە بە بنگەی هەڵبەست و هەر یەکەیان بە پێی دەسەڵات وێنەی ئەم هەڵکەوتە خەیاڵییان کێشاوە. چەندێکی شاعیر بێن و واتاکەی دووبارە بکەنەوە من بێزار نابم بەڵام تاکە مەرجێکم لە دووبارە کردنەوەکەدا هەیە. شاعیر دەبێ لە کوتانەوەی واتای تەقلیدییدا شەقڵێکی تایبەتی خۆی بەکاربێنێ کە هەڵبەستەکەی لە نۆکەریی و خزمەتکاریی هەڵبەستی لە خۆی بە پێشەوە ڕزگار بکات.

لێرەدا قسەمان لەگەڵ چەند و چۆنی سەر جوملەی بەکارهێنانی ئەم واتایە نیە، کات و دەرفەتیشمان چەنگ ناکەوێ نموونەی دەیان شاعیری کورد و میللەتانی تر بێنینەوە و بە یەکتریان بگرین و پایەی لێوەشاوەییان بۆ دەست نیشان کەین، تەنانەت ڕێمان نیە لە شیعری نالی خۆی نموونەی تر شیکەینەوە کە ئەویش وەک ئەم بیتە دەوروپشتی واتای تێخزانی وێنەی یاری لە چاو و دڵ و مێشکی عاشق داوە وەک غەزەلی:

جەنانی وەک جینان کردم بە ماوا
حەبیبەی «ماڵییاوا» ماڵی ئاوا

هەر لەم غەزەلەشدا پەردەی بووکێنی لەناو چاوەکانیدا جێ دەکاتەوە کە دەڵێ:

زەفافەتگاهی پەردەی ئاڵی چاوم
موبارەک حیجلە بێ بۆ بووک و زاوا

لێرەشدا بووک و زاوا و پەردە و زەفافەتگاه هەموویان لە وصالێکی بە چاودیتندا کۆبوونەتەوە نەک بە گەیشتنەیەکتری دوو لەش.

من لە خەریک بوونم بە دوو نموونەی یەک واتا لە هەڵبەستی نالی و پیرەمێرد کە بەشێکە لە ناوەڕۆکی

گوتارەکەم، ئا لەوێشدا هەر لە ڕووی ڕەچاوکردنی لەنگەربەستن و پارسەنگ بوونی لایەنەکانی جوانی و هونەر و ئارایشت و واتا لە ناو نموونەکاندا بیروباوەڕم دەردەبڕم دەخلم بەسەر قووڵبوونەوە بۆ بنی گۆم و گەشت کردن لە بەرینایی هەڵبەست نیە. لەم دوو نموونەیەشدا نامەوێ دوو شاعیر، پیرەمێرد و نالی، بەرامبەر یەکتر ڕاگرم چونکە دیارە تاکە بەیتێکی ئەم و ئەویان نابێتە تەرازووی هەڵسەنگاندنی هەموو ئەدەب و هونەر و دەسەڵاتیان. لەوە زیاتر کە دەسەڵاتی نالی لە یەکێک لە هونەرەکانی بوێژییدا ڕاگرین لە ئاوێنەی بەراووردکردن لەگەڵ نموونەی هاوبابەتی خۆی چیترم مەبەس نیە.

لەم ڕێچکۆلە تەسکەوە بۆ سەر خوانی بەرواوردکردن دەڕۆم و دەڵێم پیرەمێرد وێنەی خەیاڵی مەمی لە ناو دڵی زیندا داناوە بەرامبەر خەنجەرێکی مادی و بەمەدا خەیاڵ و مادەی بەرەنگاری یەکتر کردوون وەک دوو شتی یەک چوون و هاوتا، لە وشەکانی هەڵبەستیشدا نە تاکە وشە نە کۆمەڵە وشەی ناو ڕستە هیچ تەوجیە و وەرامێک بە دەستەوە نادەن لە عاست ئیعترازی کەسێکدا کە بڵێ تارمایی و خەیاڵی ناو دڵ مەترسی لێ ناکرێ بەر خەنجەر بکەوێ، ئەم دەست پاراستنەی زین بۆچی؟ بەڵێ ئێمە لەلای خۆمانەوە و لە دەرەوەی هەڵبەستەوە دەتوانین وەرام بدەینەوە و بڵێین هەست کردنی زین بە بوونی مەم لە ناو دڵیدا هێندە بەهێزە وەک ئەوەیە کە بەڕاستی لە ناو ئەو دڵەدا بێ نەک بە تارمایی، بەڵام ئەمە یارمەتی دانە بۆ بەیتەکە لە لاوە و لە دەرەوەی ڕا کە نابێتە دەربازبوونی ڕاستەوخۆ لە ئیعتیراز. ئەمە ڕاستییێکە چ دەمەتەقە هەڵناگرێ، لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بڵێین یارمەتی دانەکە ناگاتە پایەی خێر و سەدەقە پێ کردن چونکە بە بەر سۆز و تاسەی عیشقەوە هەیە پریشکی ئاگری خۆی لە دڵێکی زامدارەوە بۆ دڵێکی تری هەستیار باوێژێ و سفت و سۆ و ورێنەی خۆی لەوێشدا بەخەبەر بێنێ و خەیاڵی مەعشوقی خۆی بە هەموو سفت و سۆ و ورێنەکانی عیشقەوە بێنێتە بەر هەستی ئەو دڵە هەستیارەشەوە. کەواتە یاریدە دانەکە شتێکە لە داخوازییەکانی عیشقی سوتێنەر کە لە بەیتەکە دایە نەک لە عیشقی «مطلق»دا بەڵام هەرچۆنێک بێ، ڕەواندنەوەی ڕەخنەکە کاری من و تۆیە کە لە سەر بنگەی بەیتەکەوە هەڵیدەستێنین، زەنەی ئاسایی خودی بەیتەکە نیە.... ڕاگەیاندنی یەکسەرەی وشە و داڕشتنی نیە. ئەگەر شاعیر هاتبا و بیگوتبا خەنجەر لێدانەکە خانە لە مەم دەشێونێ ئەوسا هیچ ڕەخنەیێک نەدەهاتە بەر بەیتەکە چونکە کە ئێمە قبووڵمان بێ وێنەی مەم لە دڵی زیندا هەبێ قبووڵیش دەکەین بریندار کردنی دڵەکە ئەو خانەیە بشێوێنێ، کەوابێ هەق دەدەینە زین دەست بپارێزێ لە شێواندنی خانەی مەم، کە دڵی زینە.

ڕەنگە خوێنەر لێم بە دەنگ بێ و بڵێ کەی بوە لەگەڵ شیعردا ئەم «منطق» کاریە؟ ئەوەی ڕاستی بێ لە شیعردا ڕێ بە ڕەخنەگر نادرێ لە دەرەوەی شیعرەوە «منطق» و فەلسەفە بێنێ و بیکا بە ڕەخنە لە شیعر، بەڵام «منطق» ێک لە ناوەڕۆکی شیعرەکەوە هەڵستێ و خۆی بەسەر واتاکەیدا بسەپێنێ دەشێ و دەبێ بکرێتە ئەمرازی پێوانەی شیعرەکە. لە بەیتەکەی پیرەمێردیشدا لایەنی بەرامبەر یەکتر وەستانی خەنجەر «کە مادەیە» لەگەڵ وێنەی مەم «کە نامادییە» دیمەنێکە بەقەدەر سەرلەبەری بەیتەکە بەرچاو و چ پێویستێک نیە بۆ دیتنی بە خواستنەوەی چاویلکە لە «منطق»ی دەرەوەی هەڵبەستەکە. لە داڕشتنی بەیتەکەدا لەنگەرنەبەستن هەیە لەم بەجووتەهاتنی «مادی و نامادی» لە حاڵێکدا لێیان داوا دەکرێ یەکتر پارسەنگ بکەن. «خەنجەری ئاسن بۆ دڵە کە گۆشتە، بەڵام خەیاڵی مەمی بەردەکەوێ کە تارماییە...»

هێنانەوەی ئەم تەرزە ڕەخنەیە هەروەک لە واتای بەیتەکەوە سەرهەڵدەدا، جارێکی تریش سواری

زیهنی ڕەخنەگر دەبێ بەوەدا کە شیعری تر هەن وەک ئەمیان مادە و نامادەی کۆکردۆتەوە و هیچ ڕەخنانیش ناسەلمێنێ بە هۆی داڕشتن و هێنانەوەی وشە و تەعبیری ئەوتۆ لە خۆیانەوە گرێ و گاڵیان هەڵدەوەشێن بەر لەوە ڕەخنە بە دەستەوە بدەن. نموونەیێکی ئەم شێوە داڕشتنە بەیتەکەی «نالی»یە، کە بەرامبەر نموونەکەی پیرەمێردم ڕاگرت. لەم بەیتەدا لەنگەربەستنی وشە و واتا لە سەرانسەری داڕشتنی، کوردی گوتەنی، فرتەنەییکە بۆ خۆی:

بەهەشتی چاو بە هەموو نەخش و نیگار و پەرژین و سەرچاوەیەوە ڕاگیراوە بەرامبەر دڵ و سینە بە هەموو بڵێسە و ئاگر و سووتانیانەوە ناوی جەهەنەمیش نەهاتوە چونکە عاشق دڵی نایێ بڵێ یار لە جەهەنەمدایە… ئاگرستانێک کە تارمایی و خەیاڵی یاری تێدایە جێگەیێکی پیرۆزە بە سۆز و گەرمایی عەشق. حۆریی خەڵقی بەهەشتە و لەسەریەتیی بچێتە بەهەشتی چاوەوە، دڵ و سینە کە مەڵبەندی ئاگری عیشقن بە ڕواڵەت لەگەڵ حۆریی ڕێک ناکەون. گوتم «بە ڕواڵەت» چونکی نالی کە بانگهێشتنی یاری دەکا بۆ هاتنە ناو بەهەشتی چاوی و بەمەدا بە زاهیر پێی دەڵێ لە دڵی دوور کەوێتەوە لە حەقیقەتدا بانگهێشتنەکە بۆ نزیکتربوونەوەیە لێی، لەو ڕووەوە کە دیتنی یاری تێدایە. خۆ دیاریشە دیتنی یار بە چاو دە جاران و صەد جاران پتر حەسانەوەی عاشقی تێدایە لە تلانەوە بە دەست تارمایی و خەیاڵەوە کە هەر عەزابێکی ڕووتە بۆ عاشق. سەیری شاعیر چەند سیحرکارانە مەبەسی خۆی، کە داواکردنی وەصلە، دەشارێتەوە لە نێو مەبەسێکی چەشم بەندانەی حەسانەوەی یار لە بەهەشتدا.

لە مانە گەڕێ. پارسەنگ بوون و لەنگەربەستنێکی تر هەیە کە لە بەیتەکەی پیرەمێردا نەبوو. دەزانین بوونی یار لە نێو ئاگرستانی دڵ و سینەی عاشقدا بوونێکی خەیاڵییە نەک «بە لەش»، کەچی چوونی یار بۆ ناو بەهەشتی چاو بە خەیاڵ نییە بە هەموو لەشە، کەواتە کوا لەنگەربەستن؟ بۆ لێرەشدا ئەو ڕەخنەیە نەگرین کە لە بەیتەکەی پیرەمێردمان گرت خۆ نالیش خەیاڵ و مادەی لەتەک یەکتردا داناوە؟ ئا لێرەدا نالی دەسەڵاتێکی ئەفسووناویی بەکارهێناوە بایی فلسێکیش ئەرکی بۆ بە خەرج نەبردوە، هەر هەمان خواهشتی چوونی یار بۆ ناو بەهەشتی چاو کە جێی ڕەخنەیە و گومانی لەنگەرنەبەستنی لێ دەکرێ بە خۆی و واتاکەی حەقیقییەوە دەبێتە هۆی ڕاستەقینەی لەنگەربەستن و پارسەنگ بوون!! چوونی یار بۆ ناو بەهەشتی چاو هەر ئەوەندە بە لەشە کە چاوەکە دەیبینی، ئەوەی بەڕاستی دەچێتە ناو چاوەکەوە وێنە و صورەتی یارە کە ئەویش هەر هێندەی خەیاڵەکە و تارماییەکەی ناو دڵ و سینە مادەیە.

وێنەی ناو چاو و خەیاڵی ناو دڵ پارسەنگی یەکترن و لەگەڵ یەکتردا لەنگەریان بەستوە وەک دوو تای تەرازووی یەک سەنگ… لەمەڕا دەسەڵاتە بێ سنوور و یەکجار مەشوور و لێ سەلمێنراوەکەی نالی دەردەکەوێ کە ئەو سەرەڕای ئاخنینی هەڵبەست بە واتا و هونەر و جوانی و بەولای لەنگەر ڕاگرتن و پارسەنگ کردنی لایەنەکانی وشە و واتا، هەر لە هەمان هۆی گومان لێکردنی ڕەخنە بەدەستەوە دان و بێ ئەوە لە وشە وەیا ڕستەییکی تری هەڵبەستەکەوە ڕەخنەکە بڕەوێنێتەوە، هەر لەوێدا جوانی و بێ عەیبی و بێ ڕەخنەیی و هونەر و واتا هەڵدەڕێژێ. لەمانە بترازێ جارێ گەلێک ئیعجازی تر لە هەناوی بەیتەکەدا پەنهانە، یەکێک لەوان ئیعجازانە ئەمەیە:

نالی کە دەڵێ «چ دەکەی لەم دڵەی پڕ شەرەر و سینەی سووزانمدا» و بەمەدا لە زاهیر ڕێی ڕەخنەگر دەدا کە پێی بڵێ چۆن ڕەوا دەبینی داوا بکەی خۆشەویستەکەت لە دڵ و سینەت دەرچێ؟ جگە لەوە کە دەتوانێ ڕەخنەکە بەوە بڕەوێنێتەوە بڵێ من بانگهێشتنی یار دەکەم کە بە چاو بیبینم نەک هەر بە دڵ تێی

فکرم، بەڵێ جگە لەم وەرامە وەرامێکی تری ئەوەندە بە هێزی بەدەستەوەیە هەر بە جارێ ڕەخنەگر قەردارببار دەکاتەوە و لۆمەی تێنەگەیشتنیشی بە پاڵ دەدات.

ڕستەی «چ دەکەی لەم دڵەی پڕ شەرەر» دوو واتای جودای هەیە، یەکەمیان ئەوە بوو قسەمان لێ کرد و وا خەریکین بەر ڕەخنەی بگرین و لێشی ڕزگار کەین، وەک کردمان، دوەمیان ئەمەیە: چ لە دڵە پڕ شەرەرەکەم دەکەیت کە هەمووی هەر ئاگرە و سووتاوە و کەڵکی ئەوەی نەماوە تۆ هیچی لێ بکەیت...

لەم واتایەدا داوا کردنی دەرچوونی یار لە دڵەکە پەیدا نابێ تا ڕەخنەی ئەو داوایە لە شاعیر بگیرێ. کەواتە نالی دوو واتای سەرلەبەری ئامادە کردوە لە هەندێ وشەی بەیتەکەدا، یەکێکیان دەبێتە سوپەر بۆ ڕەت کردنەوەی هەموو توانج و ڕەخنەیێک کە لەوی تریان بگیرێ بێ ئەوە من و تۆ لە ڕێی استدلال لە وشەکانی تری بەیتەکەوە ڕەخنەگر پاشگەز بکەینەوە. دەمەوێ بڵێم واتای دوەمی وشەکان پێویست ناهێڵێ بەوە ئەو وصالە بکەینە وەرامی ڕەخنە کە لە ڕستەی «وەرە نێو جەننەتی دیدەم»دا دەفامرێتەوە چونکە دیتمان ڕستەی «چ دەکەی لەم دڵە» مەرج نیە ئەو واتایە بگەیەنێ کە ڕەخنەکەی لێ گیرا و وصالەکە پاراستی، سەدەفەکەی نالی دوو دوڕی تێدایە هاونرخ و هاوسەنگی یەکترن، چ بەیەکەوە بن چ تاک تاک، ئەو لەنگەربەستن و پارسەنگ بوونە پێک دێنن کە من لەم چەند دێرانەدا دەوریان هەڵدەسوورێم. سەیریش لەوەدایە نە بەیتەکە هەڵاخناویی پێوە دیارە نە واتاکان نەفەسیان سوار بوە نە هیچ جۆرە نوقسانییێک هەیە لە داڕشتنی بەیتەکە پێویست بکا یارمەتی بدرێ و لە لاوە واتای بۆ بخوازرێتەوە وەیا کەلەبەری پڕ بکرێتەوە.

شاعیر زۆرن لەوانەی نوکتە و نازکی لە شیعریاندا هەیە، بەڵام بەشی هەرە زۆریان پێیانەوە دیارە جێی نوکتەکە خۆش دەکەن لە شیعردا. بە نموونە لێرەدا شیعرێکی ناوداری دکتۆر ئیبراهیم ناجی میصری دێنمەوە کە بۆتە گۆرانی و کۆلێکیش مەدح دەکرێ، شاعیر دەڵێ:

و مشینا فی طریق مقمر
تثب الفرحة فیه حولنا
و ضحکنا ضحک طفلین معا
و عدونا فسبقنا ظلنا

بە چاکی لە تێکڕای هەردوو بەیتدا دیارە شاعیر بە خەیاڵیدا هاتوە بڵێ «پێش سێبەری خۆمان کەوتینەوە» کە بەڕاستیی و واتاییێکی جوان و تا بڵێی شاعیرانەش، بۆ ئەم مەبەسە لە بەیتی یەکەمدا «طریق مقمر» پەیدا دەکا چونکە واتاکەی پەکی کەوتوە لەسەر تیشکێک سێبەر دروست کات تاکو بە غاردان لەگەڵ خۆشەویستەکەی لێی پێش کەونەوە. دیارە ئەگەر واتاییێکی بە خەیاڵدا هاتبا پێویستی بە تاریکی هەبا بە ئاسایی دەیگوت:

و مشینا فی طریق مظلم

جگە لەم لایەنەی خۆهێنان و بردن بۆ سازدانی جێگەی لەبار بۆ واتا لە هەڵبەستدا، شاعیری عادەتی، بەڵکوو شاعیری پێشکەوتووش، لە تاکە بەیتدا هەر تاکە نوکتەیێک گەڵاڵە دەکات و هەر جێگەی ئەو تاکە

نوکتەیەشی بۆ ساز دەبێ – وەک ژووری یەک نەفەریی کە جێگەی یەک نوێنی تێدا دەبێتەوە، کەچی نموونەکانی شیعری نالی ئەوەندە واتایەیان تێدا ڕیز کراوە چاو بەهەڵە دەچێ لە ژماردنیان هیچیشیان جێی بە دراوسێکەی تەنگ نەکردوە. گەلێ لە بەیتەکانی نالی وەک کانگەی گەوهەر وایە تا لێی دەیتەوە گەوهەری تازەی تێدا دیار دەکەوێ. نالی هێندەش ئوستادە لە دارشتنی بەیتەکانی نەک هەر پێوەی دیار نیە خۆی خەریک کردبێ بە ئامادەکردنی جێگە بۆ واتا، جارەهای جار وا بوە دوای لێ بوونەوە لە شی کردنەوەی بەیتێکی و دڵنیا بوون لە گەییشتن بە هەموو واتا و جوانی و نوکتەی ئاشکرا و نهێنی بەیتەکە ئەوسا واتاییکی تەڕ و تازە لە نکاو خۆ دێنێتە ناو بیبیلەی چاوەوە هەر دەڵێی کاڵاوی سەخرە جنی لەسەر نابوو و لای دا. ئەمە یەکێکە لەو بەیتانەی هەر جارە واتاییک بە دەستەوە دەدەن:

هەر چەندە گوناهی دەمەکەت بارە لەسەر لێو
حەددی چیە نالی کە بڵێ ماچە کەفارەت

واتاییکی ڕێکوپێک کە وێنەی ئاشکرای وشە و دارشتنی بەیتەکە ڕادەگەیەنێ ئەو ڕاستە واتایەیە کە یەکەم نیگای خوێنەر و یەکەم بیستنی گوێگر بۆی دەچێ:

گوناهی دەمەکەت کە عاشق شەیدا کردن و بێ بەش کردنیەتی لەو دەمەت بۆتە بار. ئەو بارەی سەر دەمەکەش چ قورسایی باری گوناهەکە بێ وەیا ئەو بارە بێ کە لە زاراوەی کوردییدا دەبێتە «لێو بە بار» کەفارەتەکەی ماچە، بەو ماچە قورسایی گوناهەکەش لەسەر دەمەکە هەڵدەستێ، لێو بەباریەکەش دەرەوێتەوە بە سرینەوەی لێوەکان لە ئەنجامی لەیەکتر خشانیان بە ماچ، بەڵام نالی حەددی نیە ئەوە بڵێ و ڕێی ناکەوێ تەمای بە شتی وەهاوە بێ.

ئەو هێندە واتایە ئاشکرایە گەورەترین شاعیر پێی ڕازییە و شانازیشی پێ دەکا. هەموو کەرستەیێکی واتا و جوانی و هێز و سۆز و خۆ بەکەم گرتن و ڕێزنان لە مەعشوق و ... هتادی تێدایە کە کۆکردنەوەیان لە شیعردا بە هونەرمەندی زێدە دەسەڵاتدار و هەستیار و جوانکار نەبێ ناکرێ. بێی و هەر ئەوەندە واتا و جوانی و هێزە بدۆزێتەوە لە بەیتەکەدا شتێکی کەمت نەدۆزیتەوە بەڵام شتێکی زۆرت لە کیس چووە.

هەرچەندە گوناهی «دەمەکە»ت... لێرەدا پۆرگێک هەیە پڕە لە وردەکاریی و فتونی عیشق و عاشیقی. وشەی «دەمەکە» صیغەی «نهی»یە و ئەمرازی «دە»ی بە سەرەوەیە وەک کە بڵێی «دەمەخۆ، دەمەڵێ، دەمەڕۆ...». واتای بەیتەکە لە عاست «دەمەکە...ت»دا بە جاری دەگۆڕێ لە چاو واتاکەی بەرچاو، چونکە وشەی «دەم» لە ناودا نامێنێ و فیعلێکی نەهی جێی دەگرێتەوە. کە ئەمە وابێ واتاکە وای لێ بەسەر دێ: هەرچەند گوناهی ئەو نەهی کردنەی تۆ لە من بەوەدا کە چەندێکی بۆت ببزوومەوە پێم دەڵێی «دەمەکە» و دەمشکێنێتەوە، ئا ئەم گوناهەی «دەمەکە»ت کە بۆتە باری سەر لێوت بە ماچ نەبێ کەفارەتی نایێ بەڵام نالی حەددی نیە وا بڵێ و ڕێی ناکەوێ.

ئەم دوو واتایە، هەردوویان، لە لاییکەوە هەڵپەسێرە و خۆت خەریک کە لەگەڵ وشەی «حد» کە بە ڕێنووسی کوردی دەبێ «حەدد» بنوسرێ ئەم وشەیە لە ڕستەی «حەددی چیە، حەددی هەیە...»دا بە واتای «ڕێکەوتن و لێهاتن و ماف هەبوون» باوە، لەو دوو واتایەی تازەش هێنامەوە هەر وەها بەکارهاتبوو. لە

زمانی عەرەبیشدا وشەی «حد» واتای سنووری هەیە کە وا ڕەنگە واتا کوردییەکەی هەر لەو سنوورەوە هاتبێ لەو ڕووەوە کە «حەدد هەبوون» ڕاستەوخۆ سنووری میانی دوو شتان بۆ ئەو کەسە دادەگرێ کە حەددی هەیە. ئەم «حد»ە لە شەریعەت و «اصول الفقه»دا بوە بە زاراوە بە واتای سزای گوناهان ئیتر «حد»ی دزیەتی ٨٠ دارە و هی هەندێ گوناه ڕۆژووە وەیا برسی تێرکردنە وەیا بەندە ئازاد کردنە... کە وشەی «حد» بۆ ئەم واتایە ببەینەوە بەیتەکە دەبێتە پرسیار و وەرام:

هەرچەندە گوناهی دەمەکەت بارە لەسەر لێو
حەددی چیە نالی؟ کە بلێ ماچە کەفارەت

لە مصرعی یەکەمدا ڕووی وتووێژی شاعیر لەگەڵ یارەکەیەتی، بەڵام لە مصرعی دوەمدا ڕووی پرسیار لە یار وەردەگێرێ و بای دەداتەوە سەر خۆی، کە ئەمە «مخاطب» گۆڕینێکە زۆر پەسەند بوە لە ئەدەبی کۆندا تەنانەت لەمەدا پەیرەوی شێوازی قورئانیش کراوە.

بەڵام ڕێی تێ دەچێ نالی لە مصرعی یەکەمیشدا وتووێژی لەگەڵ خۆی بێ و بلێ گوناهی دەمی نالی کە «مخاطب» ە بۆتە بار لەسەر لێوی، ئەوجار لێی دەپرسێ ئەرێ ئەی نالی «حد» ی ئەم گوناهە چیە کە بۆتە باری سەر لێوت؟ خۆی وەرام دەداتەوە کە هەر خۆشی نالییە، و دەڵێ حەددی ئەم گوناهە ئەوەیە یار بلێ ماچە کەفارەت. لە شەریعەتدا کەفارەت بۆ خۆی بە واتای ئەو «خدر»ەش دێت کە لێرەدا مەبەستمان بوو.

خولاسە «مخاطب» لە مصرعی یەکەمدا یار بێ وەیا نالی، مصرعی دوەم دەشێ ببێتە ئەو پرسیار و وەرام دانەوەیەی باسم کرد، واتای وشەی «حد»یش ئەو سزایە شەرعییە بێ کە لە «تلک حدود الله»ەوە وەردەگیرێ. تا ئێستا، وابزانم، سێ تۆژاڵمان لە واتاکانی ئەم بەیتە هەڵگێڕایەوە بێ ئەوە هەستمان کردبێ بە هیچ جۆرە هەناسە سوارییێک وەیا وەتەنگهاتنێک لە لایەن خاوەنی بەیتەکەوە کە «نالی»یە. کە ئینساف بەکاربێنین و دان بە حەقدا بێنین دەبێ بسەلمێنین ئەو سێ واتایە نەک هەر بەسن بۆ بەیتێک بەڵکو لێشی زیادن چونکە ئەگەر وا نەڵێین دەبێ شاعیران مەنع کەین لە گوتنی بەیتی خاوەن یەک واتا و دوو واتا. لەمەدا چ تەگەرە نیە، بەڵام سەیر لەوەدایە جارێکیان لەگەڵ یەکێک لە ئەدیبە ناسراوەکانماندا باسی ئەم بەیتەم دەکرد و بەیەکەوە خەریکی سەرپۆش لەسەر هەڵگرتنی بووین و بە دوا قەتار کردنی ئەو سێ واتایەدا لە نکاو ئەدیبەکە گوتی ئای کە بێ خەبەرین و ئاگامان لەوە بڕاوە وشەی «دەمەکەت» دەشێ بە واتای «خوێنەکەت» بێ چونکە «دەم –دم» لە عەرەبیدا بە خوێن دەڵێن، خۆ دیارە دەم و لێویش کە جوان بوو لە سوورییدا وەک خوێن دەنوێنێ و ڕێی تێ دەچێ بگوترێ ڕشتنی خوێنی عاشقان بە هەموو ڕەنگی سوورییەوە لەسەر ئەو لێوانە بۆتە بار... خولاسە کە زیهن چوو بۆ لایەنی واتای خوێن لە وشەی «دەم»دا، بەیتەکە سەرلەنوێ دەبێتەوە بەو زەویە نەور و تەڕەی کە وا بە ئومێدی ئاوی زۆر بیری لێ هەڵدەکەندرێ و لە ئەنجامدا کارێزی لێ پەیدا دەبێ.

دەبینی هەڵگوشینی شیعری نالی تا ئەو ڕادەیە وشکایی واتاکانی دێت کارێکی بە کێشەیە نەفەسێکی درێژی پێ دەوێ. سەرەڕای کێشە تا بشلێی ورد و چاوخەڵەتێنە، مووقڵاشی و زەرڕەبینی نەبێ زەفەریان پێ نابات، ڕەنگە ئەوساش زەفەر پێ بردن هەر یەکجار زەحمەت بێ. بەڵام پاداشی هەڵێنانی

گەوهەرەکانی لەزەتێکی ئەوەندە گەورە و بێ هەمتایە هەموو خۆ پێوە ماندووکردنێک و لەگەڵ خەریکبوونێک دێنێ. چ سەیرێکیش لەم گوتەیەمدا نیە، چونکە ئاگامان لێیە دەوڵەتانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا خەریکن بۆ کاری زیهن بزێوی وەک شەترەنج وەیا یاری لە شەترنج بەرەژێرتر فێرگە دەکەنەوە و پسپۆڕ و ئوستادی شارەزا تەرخان دەکەن و پاداشی گەورە دادەنێن بۆ سەرکەوتوەکان لەو یاریانەدا، تەنانەت هاڤرکێی نێو دەوڵەتانی بۆ ڕێک دەخەن و جیهان بە گەلان و بە حکومەتانیەوە پێیانەوە خەریک دەبن ئیستگەکانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن خەبەری بزافتنەوەی بەردێک لەو بەردانەی سەر تەختەی شەترەنجەکە بە خەڵق ڕادەگەیەنن وەک ئەوەی ڕووداوێکی گرنگی ئابووری وەیا ڕامیاری وەیا کۆمەلایەتی وەیا زانستی ڕووی دابێ. خۆ دەشزانین ئەم یاریە و هەموو یارییێکی وەک ئەو هەر هێندەی سوود تێدایە کە زیهنی چەند کەسێک لە پەراوێزی خۆیدا تیژتر دەکا، هەڵسوڕ و داسووری یاریچییەکانیش هونەری پۆسپۆڕانە نیشان دەدەن سەرەڕای ئەوە کە یاریەکە بۆ خۆی میراتێکی کۆنی هونەری ئادەمیزادە، خۆ هەرچی جیهان هەیە ببێتە شەترەنجزان یەک لوقمە نان ناخەنە ناو زاری مرۆڤێکی برسییەوە.

وا لەم کاتەی کە ئەم دێرانەی تێدا دەنووسم و ڕێکەوتی ڕۆژی چوارشەمۆی ٢٧ ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٤ ە بەشێکی یەکجار زۆری ئەفریقا دووچاری قاتوقڕی بوە و بە ملیۆن خەڵق ئاوارە بوون بە دوای خۆراکی نەمر و نەژییدا چەندین هەزار کەسیش لە برسان مردن و چەندین هەزاری تریش خەریکی مردنن، کەچی بلیمەتەکانی شەترەنجزانی سۆڤێت و ئەمریکا و دەوڵەتانی تر بە یاریدەی حکومەتەکانیانەوە خەریکی «کش مات»ی شەترەنجن. نە خۆیان و نە حکومەتەکانیشیان بیر لەوە ناکەنەوە پارە و مەسرەفی ئەو یاریی وهاڤرکێیانە بدەن بە برسییەکانی ئەفریقا. کەسیش گلەییان لێ ناکا و پێیان ناڵێ ئای چەند بێ ڕەحم و بێ ئینسافن لە حاڵێکدا برا ڕەشەکانمان گیان دەدەن بە دەست برسیەتییەوە ئەم دەوڵەتە ئاتۆمیانە خەریکی کەیف و بەزمی شەترەنجن.

ئەوەی ڕاستی بێ منیش لە لای خۆمەوە چ گلەییەکیان لێ ناکەم و دەزانم برسی بوونی ئەفریقا دەخلێکی بەسەر شەترەنجی ڕووس و ئەمریکاوە نیە. ئەو چەند ملیۆنەی سەرفیش دەکرێ بۆ شەترەنج دەبێ هەر سەرف بکرێ دەنا یاریەکە کوێر دەبێتەوە، لەجیاتی بڕینی مووچە و بەراتی شەترەنجزانانیش باشتر ئەوە بوو لە مووچە و بەراتی چەکی شەڕ کەم بکرێتەوە وەیا مەسرەفی پۆلیسی نهێنی دابشکێ... بەڵام کە ئەمە وابێ و هێندەم بەلاوە ڕوون بێ دەبێ بشزانم، ئەگەر شەوکوێر نەبم، خەریک بوون بە شیعری نالییەوە بە تایبەتی بۆ ڕۆشنبیرێکی کورد صەد جاران پیرۆزتر و بایەخدارتر و بەشەرەفترە لە خەریک بوونی ڕووسێک وەیا ئینگلیزێک وەیا عەرەبێک وەیا کوردێک بە یاری شەترەنجەوە، نەک لە یەک سەر بەڵکو لە گەلێک سەرەوە:

١- هەروەک یاری شەترەنج زیهنی یاریچی تیژ دەکا شیعری نالی لەویش زیاتر زیهنی ڕۆشنبیر دەکاتەوە و ڕایدێنێ بە هەڵێنانی مەتەڵی زیهنی لە مەیدانەکانی ئەدەب و وەک ئەدەبدا کە ڕامیاریی و ئابووری و هونەریی... یە.

دەتوانم گرەو بکەم لەسەر ئەوەی دۆزینەوەی تەڵەی شەترەنج کە گەورەترین زانای شەترەنج نابێتیەوە کەمتر زیهنکاری دەوێ لە دۆزینەوەی تەڵەی واتا کە نالی خستۆتیە نێوان هەندێ هەڵبەستەکانیەوە. کە دەڵێم «گرەو دەکەم» ئەوە بزانە لە پێشەوە گرەوەکەم بردۆتەوە چونکە نزیکی ١٥٠ ساڵ تێپەڕیوە بەسەر بەشێکی ئەو تەڵانەی نالی تا ئێستاکەش بە کەس نەڕەواوەتەوە.

٢- خەریک بوون بە شەترەنجەوە هەر لە مەیدانی شەترەنجدا زیهن تیژ دەکا، ڕەنگە لە مەیدانەکانی «انسانیات»دا زیهن کوێر کاتەوە بە پێچەوانەی نوکتە شیعری نالی کە بە بەریەوە هەیە زیهنی مرۆڤ بکاتەوە لە هەموو مەیدانەکانی «انسانیات»دا چونکە خۆی یەکێکە لەو مەیدانانە. باوەڕم هەیە تۆ کە توانیت واتا نهێنیەکانی شیعری نالی هەڵێنی بە ئاسانی دەتوانی درۆ و فێڵبازیی پێشەوایێکی سیاسەت وەیا تەریقەت تێبگەی و خۆتی لێ بپارێزی، بە مەرجێک ترست نەبێ لە دانهێنان بەڕاستیدا کۆمەش نەکەی لە دۆزینەوەی درۆ و دەلەسەی کەسێک کە خۆشت دەوێ وەیا لە پلەی حیزبایەتییدا لە خۆت هەورازترە.

٣- ئۆینی شەترەنج بەرتەسکە لە ڕوقعەی شەترەنجەکە تێناپەڕێنێ، لەوانەیە نەخوێندەوارێک ببێتە گەورەترین زانای شەترەنج. بە نموونە دەڵێم کاک نوری برای کەک موستەفای کاکی هیران شەترەنجی لە پسپۆڕەکانی ئینگلیز دەبردەوە، خۆ ئەگەر بە تەرازووی شەهادە و خوێندنی ڕەسمییان هەڵکێشین کاک نوری مەکتەبیشی نەدیتبوو. نوکتەی شیعری نالی نەک هەر نەخوێندەوار تێی ناگا، تاک تاکە خوێندەوار نەبێ سەرەدەرییان لێ ناکا ئەویش لە هەموو نوکتەکان نا، بە ئاسانیش نا. بە تەنها زیرەکی و وردبینی چەکی ئەو شەڕەنین کە شیعرەکانی نالی بەرپای دەکەن. دەبێ لەگەڵ زیرەکییدا هەموو زانستەکانی سەردەمی نالیش کۆببێتەوە و کەڵەکەی پێ بکرێ لەسەر شیعردۆستی و ئاگاداریی فنونی ئەدەبی کلاسیکی و ئاشنایی بە دیوانی زوربەی شاعیرەکانی ئیسلام. ڕوقعەی واتا و نوکتەی شیعری نالی سەرەڕای زەکای مرۆڤ هەموو ئەدەب و زانستەکانی ئیسلامی سەردەمی «نالی»یە. سەیر لەوەدایە شەترەنجیش یەکێکە لەو کەرستانەی پەکی لەسەر دەکەوێ بۆ زانینی واتای هەندێک لە بەیتەکانی نالی:

«ماتم» وەکو زولفەینی سیەهـ گرتی سەراپات
پۆشی لە ڕوخت تەعبیەیی بەیدەق و شامات

وشەی «شامات» ناچارت دەکا بزانی «شا» لە یاری شەترەنجدا «مات» دەبێ لە پێشەوەش مەجبووری کردبووی کە بزانی لە عەرەبیدا «شامات» ڕێژە جەمعی وشەی «شامە»یە بە واتای «خاڵ» کە لە ڕووی یاردا وەک بەیدەقی سەر تەختەی شەترەنج «تعبیە» کراوە و «ماتم - ماتەم» و زولف پۆشیویانە.

کە بێین بەراوردی شیعری نالی بکەین لەگەڵ یاری شەترەنجدا، لە هەر ڕوێکەوە بێ ئەو بەراوردیی کردنە، دەبینین بەڕاستی شەترەنج یەکێکە لەو نۆکەرانەی دەستەونەزەر ڕادەوەستن لە دیوانی شیعری نالیدا. لە نوقتەی بەرامبەردا، یاری شەترەنج کە خۆی کەرستەیێکی شیعری «نالی»یە چ پەکی نەکەوتوە لەسەر تێگەیشتنی شیعر، هی نالی بێ یا شاعیرێکی تر، شەترەنج دیوان و دیوەخانەی نیە زانستێکی دەرەوەی خۆی ببێتە نۆکەر تێیدا. لەم مەیدانەدا شەترەنج وەک ئەو بۆرە پیاوەیە دەسەڵاتی بەسەر کەسدا ڕاناشکێ مەگەر بەسەر خۆیدا، ڕوتەیێکە لە ناو کۆڕی مرۆڤی کۆک و پۆشتەدا.

٤- ئەمڕازی یاری شەترەنج بە هەموو هونەری خۆی و شارازایی و زیرەکی شەترەنجزانەوە تەختە و بەیدەق و پەیکەری ڕوخ و فیلە کە هەموویان بێ گیان و سارد و سڕن، لە خۆیانەوە بەدەنگ نایەن و چ پەیامێک ڕاناگەیەنن ئەگەر من و تۆ بە دەنگیان نەهێنین، بەڵام ئەمڕازی شیعر، هی نالی بێ وەیا هی شاعیرێکی تر، وشەی واتادار و هەستیارە کە زادەی دڵ و خوێن و مێشکی خاوەنەکەیەتی. دەوجا بۆ

خۆت تێفکرە لە جوداوازیی میانی دوو هۆی زیهن بزێو کە یەکێکیان لە بەردی ڕەق و یەکێکیان خورپەی هەناو بێ.

من لێرەدا ئەم لایەنەش ناکەمە یارمەتیدەری شیعر کە بڵێم لێی دەوەشێتەوە ببێتە ڕابەری مرۆڤ بۆ ڕێی چاکە لە حاڵێکدا شەترەنج چ ڕێیان بە کەس نیشان نادا، چونکە مومکینە بگوترێ شیعر لەوانەیە ڕێی خراپیش بە مرۆڤ نیشان دات نەک هەر هی چاک، قسەکەش ڕاستە بەڵام ئەم دوو بەختییە وەنیە هەر لە شیعردا پەیدا بێ، هەرچی بەرهەم هەیە وایە یەک لەوان باروت کە شتێکی زۆر چاکە بۆ ڕێگە پێخۆشکردن تا بشلێی بەدە بۆ پیاو پێ کوشتن. شەترەنج بۆ خۆشی لەوانەیە بە ڕێکوپێکی بکرێ لەژێر سەرپەرشتیکردنی لایەنی بەرپرسی دەربەستی چاکە و خراپەدا، لەوانەیشە ببێتە قومارێکی ئاسایی کە هەر تەلّفاندنی کات و ماڵی لێ ڕودەدات. من لەم بەیەکدی گرتنەی شەترەنج و شیعردا خۆم ناکەم بە واعیز و قەمچی هەڕەشە لێکردن بە دەستەوە بگرم وەک مامۆستاکانی سەردەمی سوختەخانە پەند و ڕەوشت و ئایین فێری خەڵق بکەم، تەنها لە ڕووی بایەخ و نرخی زیهنی و هونەریی و مرۆڤایەتی سادەی ڕەنگ لێ نەدراوەوە بە یەکتریان دەگرم بەمەشدا بەلای شەترەنجمدا شکاندوە چونکە شیعری پەند و دینداریی تا بڵێی زۆرە، قسەی دژی یاریی و خۆخافلاندن ئەویش هەر زۆرە کە شەترەنجیش دەگرێتەوە و دەیشکێنێتەوە.

کە بمانەوێ لەسەر ئەم بەیەکدی گرتنە بەردەوام بین دەتوانین چەند ئالّقەیێکی تریش بخەینە سەر زنجیرەی ژمارەی ڕاکشانی شیعر بەسەر شەترەنجدا بەڵام پێویستی بەم ئەرکە نیە، چی تازە لە گوتنی بوومەوە بە سەر و زیادیشە لە مەبەس. نیازی بنجی لە هێنانە ناوی شەترەنج ڕاکێشانی سرنجی ئەو خوێندەوارانەیە کە بێ پەروا و بە شانازییەوە شیعری نالی و ئەمسالی نالی بێ بایەخ دەکەن و دەکەونە دژی. چ گومانم نیە لەوەدا کە ئەم تەرزە خوێندەوارانە ڕۆژەک لە ڕۆژان خەیاڵیان بۆ ئەم لایەنەی یاریی شەترەنج و بایەخ پێ دانی نەڕۆیشتوە. دەنا دەبوو یەک لە دوو کاران بکەن: یا واز بێنن لە دژایەتی ئەدەبی کۆن کە مەعلوومە هەزار جاران لە شەترەنج سوودبەخشترە یاخود بکەونە دژی شەترەنج و یاریەکانی وەک ئەویش، ئەو حکومەتانە و ڕێکخراوانەش تاوانبار بکەن کە خۆیان و عالەم بە شەترەنجەوە خەریک دەکەن. دەمێنێتەوە بڵێین ئەدەبی کۆن مێشک و دڵی خەڵق بۆ لای بیروباوەڕی کۆنەپەرستانە ڕادەکێشێ کە ئەمە زیانی بەولای هەموو سوودێکەوەیە لێی وەربگیرێ، لە زیانی یاریش پترە کە هەر بریتییە لە بەفیڕۆچوونی کات و چالاکی و کار ناکاتە سەر بیروباوەڕ و دڵ و دەروون. بۆ بەرپەچ دانەوەی گوتەیێکی وەها کە ڕۆشنبیری ئەمڕۆ لە دژی ئەدەبی کۆن بە زیهنیدا تێپەڕێ دوو وەرامم هەیە لێرەدا دەیان کەم بە پاش گەزکەرەوەی ڕەخنەی ئەوتۆیی، چەندین وەرامی تریشم هەن خوێنەریان پێوە خەریک ناکەم:

وەرامی یەکەم: ڕابردووی میللەتان هەر ئەدەب و شیعری تێدا نەبوە کە ئێستا ئێمە بیکەین بە نموونەی پاشکەوتوویی و بە شیر و خەنجەری ڕەخنە و نەفرین ئەنجن ئەنجنی بکەین. شیعر و ئەدەب دێرێکین لە ڕووپەڕەی ژیانی کۆمەڵایەتی کۆن، لە پێش ئەودا و بە دوا ئەودا چەندین دێڕ دێن ڕووپەڕەکە پڕ دەکەنەوە. کە ئێمە ئەوەندە خۆمان هەڵدەینەوە بە دژایەتی شتی کۆنەپەرستانە و لە پەنا ئەو خۆهەڵدانەوەدا ئەدەبی کۆن تاوانبار بکەین و لە ناوی ببەین دەبێ ئەم دڵسۆزییە بێژۆکەمان بە گژ هەموو ڕابردوومان بێنێ و بەرمان داتە گیانی هەموو مێژوو بە هەموو ڕووداو و کردار و گوفتاریەوە نەک هەر

تاکە میراتی شیعر، یەخە گیری سەرلەبەری خەڵقەکەشمان بکا بە مەلا و شێخ و کاسب و فەللاح و توجاریەوە نەک هەر شاعیر.

خولاسە ئێمە ئەگەر دەست درێژ کەین بۆ خنکاندنی شیعر و شاعیری کۆن دەبێ تێکڕای ڕابردوو لە ناو ببەین و بسڕینەوە چونکە بەو گەز و گرێیەی شاعیر دەکاتە کۆنەپەرست هەموو ڕابردوو کۆنەپەرستە تەنانەت شیعر لەچاو زوربەی لایەنەکانی تری بیروباوەڕی کۆمەڵایەتی لێرە بە پێشەوە زۆر بە پێشکەوتووش دەژمێررێ. تۆ بێنە شیعری نالی وەیا حافظ وەیا ابو العلاء المعری وەیا مەلای جزیری بخە تەنیشت ورێنە و گرۆگاڵە جنۆکاوییەکانی فەللاح و کاسبێکی ٢٠٠ساڵ پێش ئەمرۆ دەبینی شیعرەکان وەک شۆڕش خۆ دەنوێنن لە چاو ئەو ورێنە یەکجار دواکەوتوەدا. گیانی نەسەلماندن و ڕێزلەخۆگرتنی شاعیرەکانیش وەک شیعرەکانیان دە جاران لە گیانی سەرکزەلانە و خۆ بەکەمگرتوانەی چینی هەژاری ئەو سەردەمانە مردانەتر و ئازایانەتر هەڵدەچەقن لەبەر چاوی بینەری ئەمرۆدا. کە بێین و چینی هەژاری لەمەوپێشیش بکەینە بەرەوان و لە ڕەفتاری وانەوە حوکم بەسەر ئەو شاعیرانەدا بدەین، ئەوساش شاعیرەکان لەچاو زوربەی میللەتدا هەر لە پێشەوە دێن چونکە چینی هەژار ڕێزیان لێ ناون و لە خۆیان بە پشتەوەتر داناون.

من کە ئەم ڕاستییە دەڵێم ڕقی خۆمی پێ هەڵناستێنم لە کرێکار و جوتیاری دوێنێ کە نەیتوانیوە و نەیزانیوە شۆڕشگێڕ بێ، کە واقیعی کرێکار و جوتیاریش لە تەنیشت واقیعی شاعیری کۆن دادەنێم بۆیەمە تاکو ئەو ڕۆشنبیرەی دەست درێژ دەکا بۆ کوشتنی شیعر و شاعیری لەمەو پێشمان چ چاری نەمێنێ و دەست بگێڕێتەوە لەو ستەمە چونکە کە دەست نەگێڕێتەوە لە شاعیر و ئەدیبی کۆن دەبێ دەرحاڵ خۆ بکاتە جەللادی بێ فێڵی عەمەلە و فەللاحی لێرە بە پێشەوەش. هەرگیز ڕەوا نیە ڕێ بدرێ بە ڕۆشنبیرێکی ئەمرۆ شانازی بکا بە خۆیفدانی دەست نەپاراستن لە کوشتنی شیعر و شاعیری لەمەوپێش بە ناوی دژایەتی بیروباوەڕی پاشکەوتوو لە حاڵێکدا ماوەی بە خۆی داوە کورێنی بکا بە هەژاردۆستی و پرۆلیتاریاپەرستی کەچی هەرچی بیری پاشکەوتوو هەیە لای ئەو هەژارە بێچارە هێلکەی کردوە و جووجەڵەشی هەڵێناوە. دەبێ لەو ڕۆشنبیرە بگەیەنین بە کوشتنی شاعیر خۆی دەکاتە جەللادێکی بێ داد و ستەمکار کە هیچ عوزرێکی بە دەستەوە نەبێ، چونکە ئەو لەو کوشتنەدا پێشکەوتووترین تاقمی مێژوو دەکوژێ و دواکەوتووترین تاقمی مێژووش ئازاد دەکات کە ئەمە ڕاستەوخۆ دەبێتە «هەلپەرستی» بێ پێچ و پەنا لەو ڕووەوە کە هەموومان دەزانین بە ڕواڵەت خۆدانەپاڵ چینی هەژار بۆتە مۆدەی ئەم ڕۆژانەمان بە زۆریش خۆدانەپاڵەکە چی تێ ناچێ وەک مەسەلە زۆر مەشوورەکەی «خەنجەر لە کا». کە عوزری شاعیری لەمەوپێش نەسەلمێندرێ لەوەدا کە نەیتوانیوە و نەیزانیوە شیعری ئازایانەتر و ئازادانەتر هەڵبەستێ دەبێ عوزری عەمەلە و فەللاح و کاسب و خەڵقی تریش نەسەلمێندرێ لەوەدا نەیانتوانیوە و نەیانزانیوە، هەر نەبێ، بەقەدەر شاعیری سەردەمی خۆیان پێشکەوتوو بن.

ئەم «بانێکە و دوو هەوا»یە میللەتی نەخوێندەواری لێرە بە پێشەوە نەیسەلماندوە چۆن ڕۆشنبیرێکی سەردەمی ئاتۆم لە خۆی دەسەلمێنێ وەیا بەخۆی ڕەوا دەبینێ! ڕۆشنبیرێک کە شیعری نالی ڕەفز کا دەبێ ئایین و میرات و بازرگانی و مارەکردن و تەلاقدان و جووتی گارەش و ئاوی ئاوبارە و ئاشی ئاو و دەستاڕی گەنم و کرەی چەڵتوک و هەموو سەروبەرێکی تری ژیانی سەردەمی نالی ڕەفز کا چونکە شیعری نالی بەشێکی پێشکەوتوە لە ناو پەراوێزی تێکڕای ئەو کەلەپۆرەدا. خەرەکی خەرەکرێس و تەشی

تەشیرپێس لە چاو سەردەمی خۆیدا کە هەردەکاتەوە سەردەمی خەرەک و تەشی. شیعری ئەحمەدی خانی لە ریزی پێشکەوتووترین شیعری سەردەمی خۆی و دوای خۆشیەوە دێت کە ئەوسا گەلی کوردی بێچارە لە باری ژیانی مادیەوە چی ئەوتۆی لە ژیانی سۆمەر و ئاکاد تێنەپەراندبوو.

دەتوانم بلێم ئێستاش ناوچەی ئەوتۆ هەیە لە کوردستاندا فەللاح و شوانەکانی نموونەی مرۆڤی چوار هەزار ساڵ لەمەوپێشمان نیشان دەدەن کەسیش رێی نیە بلێ دەبێ ئەمانە لە ناوببرێن چونکە لەچاو رۆژگاری خۆیان دواکەوتوون. کە ئەمە وابێ بۆچی فەللاح و شوان دەشێ فەتوای لەناو بردنیان دەرچێ کە هات و بوون بە شاعیر.

چەند سەیرە رۆشنبیری کورد ئەمرۆ باری زیهنی و فەلسەفی و بیروباوەری لەو رادەیەدا بێ کەسێکی وەک نالی ببەخشێ و گلەیی لێ ناکا ئەگەر شاعیر نەبا و جوتیارێکی جنۆکەپەرست با، جوتیاریش تاوانبار بکا ئەگەر شاعیر با. بەو پێیە دەبێ رابردوومان بە باهەڵدراویی خۆش بوێ و تا سەرەوبنی نەکەین و رێزی لێ نەگرین. زۆر زەحمەتە دڵ و دەروون و بیروباوەری وەها لە هیچ کەلەبەرێکی منطقەوە ئاخاوتنی لەگەڵدا بکرێ، بۆ کەسیش نالوێ تەپوتۆزی بە سەهووچوونی لێ بتەکێنێ تا لە خۆوە لێی دەتکێ چونکە لە هەڵوەستێکدا نیە هیچ شت لە هیچ کەس بسەلمێنێ. ئەوەی چاوەروان دەکرێ لە بەسەهووچوونی قووڵ، پتر توورە بوون و گێف بوونەوەیە لە بەرامبەر هەر راستکردنەوەیێک کە دۆستانە بەرەوپیری بچێ و لە عاست هەر رەخنەیێک کە برایانە لێی بگیرێ. گوتەی کۆنینەی «کە گوترا حەق ئاو رادەوەستێ» بۆ مرۆڤی عادەتی بە راست دەگەرێ، مرۆڤێک بە سەهووچوونی لێ ببێتە فەلسەفە راستییان بە حەق نازانێ تا بۆی راوەستێ... بە داخەوە.

وەرامی دووەم: بیروباوەری ئەم تەرزە خوێندەوارانەش رۆژەک دێ ببێتە کەلەپوری رابردوو و چینی پاشەرۆژ بە قێزوبێزەوە سەیری بکەن و لچک و لێوی لێ هەڵێنن وبلێن ئای لەم بیروباوەرە دواکەوتوە قوندیلەیەی سەردەمی تاریکستانی کۆن! کە ئەمە دەڵێم زۆرم حورمەتی ئەو خوێندەوارانە و بیروباوەرەکانیان گرتوە بەوەدا کە بێبایەخکردنیان دەخەمە بەر حوکمی دوارۆژ چونکە، راستییەکەی، لە ئەمرۆوە رێی بێبایەخ کردنیان لەبەر هەموو کەسێکدا راست و رەوانە نەک تەنها لە رووی ئاشکرایی بەسەهووچوونیانەوە بەڵکو بەهۆی کرداری خودی خۆیانەوەش چونکی کە حەڵاڵ بێ بۆ وان ئەدەبی غەیری خۆیان نابوود بکەن حەڵاڵیشە بۆ یەکێکی تر ئەدەبی وان نابوود بکات.

زۆر بە ئاسانی و ئاسایی دەتوانم بەو کەسە بلێم کە رابردوومان ریسوا دەکات و رۆژگاری ئێستاکەمان بە حەرامزادە لە قەڵەم دەدات، تۆ کە بێئینسافانە حازرمان لێ دەکەیتە منداڵی بیژووی رابردوو، سەر لە نوێ، دوارۆژیشمان دەکەیتەوە بە منداڵی حەرامزادەی ئەمرۆکەمان چونکە گومان لەوەدا نیە تۆ کە نەتوانی دەماری پەیوەندیی ئێستا کە لەگەڵ رابردوو بدۆزیتەوە و بیانکەیتەوە بە باوک و رۆڵەی شەرعی، هەر بە جارێ ناتوانیت دوارۆژێک پێک بێنیت کە بشێ پێی بگوترێ رۆڵەی شەرعی ئەمرۆ... ئەمە ناتوانیت بایی رازی کردنی خۆت چ جایی پێرازیی بوون و سەلماندنی خەڵقی تر. خۆ تۆ خالق نیت لە بورجی عاجیتەوە رۆڵەی دوارۆژ لە دایکی ئەمرۆکە بەوەلەد بێنیت بە پێی وەسیقەی مارەکردنی لە باوکێکی کە گۆرانی مێژوویی راستەوخۆی بێ درۆ و فێڵ و فەرەج بێت. تۆ کە خالق نیت ساحیریش نیت بە چاوبەستەکێ وەسیقەی ساختەمان بە دروست بێنیتە بەر چاو یاخود چاوی مرۆڤی دوارۆژ نابینا کەیت و ئەو هەڵەیەی پێ بسەلمێنیت کە خۆت مەبەستتە.

خۆ بە سەهووبردن لە عاست «ممكن و نامكن» هەموو ڕێگەیێکی منطق و هۆش و لێکدانەوە پەک دەخات. خواهشت کردنی بیروباوەڕی مۆدێلی ١٩٧٠ لە شاعیری ١٨٥٠ ڕێ دەدا خواهشت بکرێ لە شاعیری ئەمڕۆمان فرۆکەمان بۆ دروست کا بە نووکی ئەو خامەیەی لەو زیاتر شک نابا، لە خەیاتیش خواهشت بکرێ بە دەرزیەکەی بیری نەوتمان بۆ لێدات.

خولاسە هەموو نامومکینێک خواهشت بکرێ لە هەموو کەسێک، بەر لە هەموان ئەوان ڕۆشنبیرانەی خواهشتی نامومکین دەکەن لە ڕۆژگاری ڕابردوو.

باوەرهێنان بەوە کە شیعری کوردی صەدەی نۆزدەم مردوە وەیا کاتی بەسەرچوە وەک باوەڕ هێنانە بە مردنی دوێنێی خۆت وەیا هەر نەبێ بەسەرچوونی. من کە ئەمە دەڵێم هەر حیسابی بەسەرچونی پێنج شەمۆ و داهاتنی هەینیت، بیروباوەڕی ئەمرۆشت لەهی دوێنێت جودا بێت چ بە دوێنێی خۆشت ناڵێی مردوو وەیا دواکەوتوو ڕەنگە شانازیش بکەیت بە گۆڕانی قەناعەتەکانت لە دوێنێوە بۆ ئەمرۆ و بڵێیت ئەمە بەڵگەی بەرەوپێشەوە چونمە. خۆ ئەگەر نەختێک نیگات فراوان کەیت و هەندێکیش ئینساف بخەیتە ناو نیگاکەتەوە دەتوانی فەتوای «نەمردن و بەسەر نەچوون» بۆ ئەدەبی لە خۆت بە پێشەوەش دەرچوێنیت وەک بۆ ڕابردووی شەخسی خۆت دەرچواند، ئەوسا بە دڵێکی حەسایەوە و بێ گرێ و گاڵ خۆت بە میراتگر و ڕۆڵەی شەرعی ئەو ڕۆژگارە بژمێریت، کە بەڕاستیش هەر وایت، و هەوڵ دەیت میراتەکە دەوڵەمەندتر کەیت و بەرەوپێشەوەتری بەیت، دوایش دەوری کەیتەوە بۆ دوارۆژێک کە ئەویش ڕۆڵەی شەرعی خۆت دەبێت.

میللەتانی تریش وەک کورد، دە هێندەی کوردیش، ئەدەبی کۆنیان هەبوە و پارێزراوە. ئەو میللەتانە جارێکی تریش لە کورد بەختیارترن لەوەدا کە ڕۆشنبیری ئەمرۆیان ئەدەبی کۆنیان تاوانبار ناکەن. بەڵێ ڕاستە ئەو میللەتانە هەر خاوەنی ئەدەب نەبوون، باری مادیشیان لەچاو ڕۆژگاری کۆن پێشکەوتوو بووە، لەمەوە ڕەنگە بگوترێ لانی مادی پێشکەوتوو شەفاعەت دەکا بۆ ئەدەبەکەیان ئەگەر پاشکەوتووش بووبێ، کەچی من دەڵێم دەبێ بزانین ئەم ڕاستییە لەسەر ئەدەبی کورد دەکاتەوە نەک دژی دەوەستێت چونکە عوزرێکی گەورەی بە دەستەوە دەدا لە ڕووی ئەوەوە کە دواکەوتنی باری مادی و کۆمەڵایەتی کورد ڕێی بریوەتەوە لە ئەدەبەکەی کە پێشکەوتوتر بێت، ڕەنگە لە هەمان کاتدا گلەیێکیش بێنێتە سەر ئەدەبی ئەو میللەتە پێشکەوتوانە بەوەدا کە باری مادی دەوڵەمەند و پێشکەوتویان دەبوا ئەدەبێکی پێشکەوتووتر بەرهەم بێنێ لەوەی کە هەبوە. ئەگەر چاومان ڕەشکەوپێشکە نەکات و مێشکمان لەق نەبووبێت ڕێمان هەیە بڵێین ئەرێ ئەی بوێژی فارس و تورک و ڕووس و عەرەبی پێش صەد ساڵ ئێوە کە لە دەوروبەرێکی یەکجار دەوڵەمەندتر بوون و ژیان لەچاو هی کورد بۆچی هەڵبەستتان لە هی نالی و شێخ ڕەزا و مەولانا خالید پێشکەوتووتر نەبوە؟ کوا ئەو واتا و وێنە سیحراویەتان کە لە ژیانە دەوڵەمەندەکەتانەوە تیشکی دابێتەوە بۆ ناو هەڵبەستتان و هاوتای ئەو لە واقیعە هەژارەکەی نالی تیشکی نەدابێتەوە؟ بۆ دەبێ حاجی قادر لێتان دانەبرێ وەیا کەیفی جوانرۆیی شان بە شانتان بێت؟

لێرەدا سەرگوزەشتێکی کورتیلە دەکەمە پاڵپشتی قسەکانم: چەند ساڵێک لەمەوبەر قوتابیەکانی کورد لە قاهرە پرسیارێکیان کرد لە شاعیرێکی ئێستاکەمان دەربارەی نالی و هێزی لە شیعردا. لەوەرامدا پێیانی گوت بەسە بۆ دەرخستنی پایەی نالی کە بڵێم لە بەیتێکی دڵدارانەدا وەسفێکی خورما و دارەکەی

کردوە بە خەیاڵی هیچ شاعیرێکی عەرەبدا نەهاتووە، دەشزانین دارخورما ماڵی بێفێڵی عەرەبە و نالی لێی مێوانە:

ئەتۆ قوربان نخیلی یا ڕطابی
وەها شیرین و سینە نەرم و دڵ ڕەق

بە دوا ئەو بەیتەدا بەیتێکی تری نالی دێنمە ناو قسەکانمەوە کە وەسفی بیابانی حیجازی پێ کردوە ئەویش تۆزی نەشکاوە لە لایەن شیعری هیچ شاعیرێکی عەرەب کە وەسفی بیابانی کردبێ. ئەمە دەڵێم لە عاست تێکڕای ئەو هەڵبەستانەی خۆم خوێندومنەوە، کە شتی تری زێدە نایاب هەبێ لە وەسفی بیاباندا و من چاوم پێی نەکەوتبێ بەر ئەم قسەیەم ناکەوێ:

سماقی احمرە «یاقوت»ی ڕوح و ئاوری نەفسە
حصاتی ابیضە یا شهبی نجم و ڕجمی شیطانە

بزانە لە مەقامی جەزبەگرتنی بەرەو کەعبە ڕۆیشتن نالی بەردە سماقی سور و وردە چەوی سپیلکەی ڕێی حیجازی بۆ کوێ بەرز کردۆتەوە. تو خوا بە وردی سەیرێکی ئەم ڕیزکردنەی «قوتی ڕوح» و «ئاوری نەفس»ی نیوە بەیتی یەکەمی بکە کە لە وەسفی بەردەسماقدا هاتوە چۆن بە ئاسایی و بێ نەفەسسواریی لە خۆوە بەرامبەر «شەهبی نجم» و «ڕجمی شیطان» وەستاون؟ قوتی ڕوح لەگەڵ شەهبی نجم جووت هاتوە ئاوری نەفسیش لەگەڵ ڕەجمی شەیتان!!! کاکە لێی ورد بەوە جیهانێکی سیحری حەلاڵ وا لەبەرچاوتە نە سەری دیارە نە بن.
من کە بە گەرمی لەسەر ئەدەبی کۆنمان دەکەمەوە یەک وشەی توانجم لە ئەدەبی ئەو کەسانە نەگرتوە بێ ئینسافی دەکەن لەگەڵ ئەو ئەدەبەدا. نەک هەر ئەمە و بەس، هەرگیزیش ناڵێم ئەدیبی کورد دەبێ لەسەر شێواز و ڕێبازی شاعیری لێرە بە پێشەوەمان بڕوا و ڕێگەی تازە داهاتوو لە خۆی حەرام کات. ئەوەی ڕاستی بێ پارچە هەڵبەستی نەوباوی ئەوتۆم دیوە سەد سڵەواتم بۆی لێداوە هەرچەند واتاکانی لە پشت پەردەیێکی ئەستووری ڕەمز و هێما و داپۆشراوییدا خۆیان بزر کردوە تا ئەو ڕادەیەی بە زەحمەت تێیانگەیشتووم یا هەر تێیان نەگەیشتووم .
بە لای باوەڕی منەوە شاعیری نوێی ئەوتۆمان هەیە خەریکە هەنگاو هەڵێنێ بۆ بەرەوپێشەوەی «گۆران» و قۆناغەکەی چ لە ڕووی ڕواڵەت چ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بێ. مەبەسیشم لە ناوەڕۆک مەفهومی سیاسی و فەلسەفی نیە، مەبەسم ڕژانی نەفسی شاعیرە بۆ ناو هەڵبەست جا ئەو نەفسە چی تێدا دەبێ با ببێ. هۆیەکی زێدە ئافەرین کردنیشم لەو شاعیرە «وەیا ئەو شاعیرانە» ئەمەیە کە خۆی ناکاتە عەبدی شێواز و ناوەڕۆکی یەکێکی لە خۆی بە پێشەوەی وەک «گۆران» بەڵام لە هەمان کاتدا هەزار حەیف و مخابنی بۆ دەڵێمەوە کە دەبینم هێندە بێڕەحمانە و ناشارەزایانە دەکەوێتە دژی ڕابردوێکی بێتاوانمانەوە. چەند سەیرە و چەند نامەفهوومە لە ڕۆشنبیرێکی کورد کە منداڵێکی هەژاری بێ باوکی دیت بزەیی بۆی بجووڵێ بەڵام ڕقی لە ڕابردووی کورد هەڵستێ کە ئەویش وەک ئەو منداڵە بێ باوکە وا

بوە بە درێژایی پتر لە دو هەزار ساڵ نەفەسی حەسانەوەی هەڵنەمژیوە و تێر بە زگی خۆی نەخواردوە و قەمچی ستەمکاری بێگانە لەسەر پشت و شانی هەڵنەستاوە. من لە وەسفی کورددا ئەمەی ژێرەوەم گوتوە لە ساڵی ١٩٦٠ڕووی قسانیشم لە ڕۆشنبیرانی عەرەب بووە:

«فهو يخرج اليوم من حدث التاريخ اشعث اغبر ينزف جسمه من جرح عشرين قرنا او يزيد، وتغوص في عظامه سلاسل الاحقاب لو اطلعت عليه لوليت منه فرارا ولملئت منه رعبا».

ئەم پرزۆڵە لەش خوێناوییەی ناو گۆڕستانی مێژوو ئەوە نیە ڕۆشنبیرێکی خۆی سەرلەنوێ ئەنجن ئەنجنی کا... پوختەی مەبەس و مرازی من لەم درێژەپێدانە و میسال هێنانەوە و ڕەخنەگرتن و ڕەخنە ڕەواندنەوەیە ئەوەیە چاوی ڕۆشنبیری کوردی ئەمڕۆ پێ بکەمەوە کە سەرگەرمی تەمەنی گەنجایەتی و مەستی کەف و کوڵی حەزارەتی تازەی ئەوروپایە و لەبەر تیژڕۆیی خۆی شوێن هەنگاوان نابینێ، بەهۆی چاویلکەی خوازرایەوەش چەشمەندازی لێ لێڵ بوە.

بێگومان کە ئەمە دەڵێم لە خۆم و لە تاو و تەئسیری قسەکانم بێ ئاگا نیم. زۆر باش دەزانم ڕۆشنبیرێک ئەوەندە ئاوەژوو بوو بێ دوێنێ بە ئیمڕۆ بگرێ وەک ئەوەی ئاسمان بە ئەرز بزانێ بە قسەی من نایێتەوە سەر باری ئاسایی تا ئاسمانەکە هەڵداتەوە بەرزایی و دوێنێش بخاتەوە پێش ئەمڕۆ. ڕۆشنبیرێک تا دەگاتە ئەو ڕادەیە لە سەهوو چووندا کە داوای مستحیل لە ڕابردووی بەسەرچوو بکا و قەمچی لە ڕۆژگاری تێپەڕیو بدا، دەبێ لە سەهوەکەیدا ئەوەندە قوڵ ڕۆچووبێ کە شریت و دەولکەی بیروباوەڕ و نووسینی یەکێکی وەکو من نەیگاتێ. تاریکستانی ئەنگوستەچاوی یەخەگرتنی ڕابردووی بێ گوناه و کوشتنی تارمایی بلیمەتی گۆڕستانی مێژوو بە چرای کزی ئەم قسانەی من ڕووناک نابێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا خامۆش بوونی من و هی وەک من چ خزمەتێکی ڕاست کردنەوەی سەهووی ئەو ڕۆشنبیرانە ناکا، پتریشیان بە سەهوو نابا.

ئەمە لە لایێکەوە، لە لایێکی تریشەوە ئەدەب و ئەدیبێکی کوردی کۆن کە لە نەزەر خۆماندا جێی شانازی پێوە کردن بێ دەبێ لە حاڵی هێرش بردنە سەریان لە لایەن ڕێ لێشێواوێکی کوردەوە، بە چەکی خامە بەرگرییان لێ بکەم. لە منیش بە پێشەوە نووسەران هەبوون بەشێکی نووسینەکەیان تەرخان کردوە بۆ لەسەرکردنەوەی ئەو ئەدەب و ئەدیبەی لە بارەیان نووسیوە، ڕەنگە هەندێک لە خوێنەرەوەی ئەم باسەش ناچاری لەسەرکردنەوەبووبن. ئەوەی ڕاستیش بێ میللەتی کورد پێویستی پتر هەیە بە لەسەرخۆکردنەوە تا میللەتێکی تری خاوەن سامانی مادی و مەعنەویی چونکە بە داخەوە کورد ئەوەندەی نیە هەندێکی لە ژێر پێی ڕەخنە و نەفرینی ناڕەوا بپلیشێتەوە و دەربەست نەبێ. بە تایبەتی کە ڕەخنەکان دژی ڕاستی و ئینسافیش بن و لە بەسەهووچوون و بێ باکی و وردنەبوونەوەی ڕەخنەگرانەوە سەریان هەڵدابێ لە عاست مێژوو و بەسەرهاتەکانی کە چ سووچێکی ڕەخنە لێگیراوەکان نیە ئەو بەسەرهاتانە بە پێی زەوق و کەیفی مرۆڤی صەدەی بیستەم ڕوویان نەداوە و حازرێکی باشتریان بۆمان بەرهەم نەهێناوە. هەروەک ناقوولایی ژیانی چینی زەحمەتکێشی ئەمڕۆی کورد بە ئارەزۆ و بە تاوانی ئەوان نەڕسکاوە تا گلەیی بێسامانی و بێڕاحەتی و بێئازادیی خۆیان لە خۆیان بکەین. ئەدیبێکی وەک نالی کە بەلای بیروباوەڕی منەوە یەکێکە لە شاعیرە هەرە پێشکەوتوەکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلام، نەک تەنها هی کورد، گلەیی ئەوەی لێ ناکرێ بۆ کەیفی صەد ساڵ دوای خۆی شیعری هەڵنەبەستوە. لەوەشدا سەرشکێن ناکرێ کە شێوازی شیعری کۆنی بەکارهێناوە، لەم لایەنەوە دەبێ بڵێین نالی ئەگەر ئەوە نەبا

که هەبوو گلەیی لێ دەکرا و گومان دەچووە سەر شاعیریەتی چونکە دەبێ مرۆڤ کوری سەردەمی خۆی بێت، کە ئەو کورە نەبێ دیارە ناتەواوییێک لە نەفسی وەیا لە هونەریدا بۆتە لەمپەڕ لە پێشی و کردوەتی بە مرۆڤێکی تار بووی لە تێکرای خەڵق.

نالی بێ وەیا یەکێکی تر بێ هەر ئەوەندەی لێ داوا دەکرێ بە پێی مەفهومی سەردەمی خۆی مافی ڕێزلێگرتنی هەبووبێ تا ئێمەش ڕێزی لێبگرین چ ڕەوای هەق نیە ئێمە بێین دوای صەد ساڵ لەو سەردەمە هەموو خەڵق بە درۆ بخەینەوە لەو ڕێزەی کە لە یەکێکی وەک «نالی»یان ناوە. وا دەزانم ئەم قسەیەی لێرەدا دەیکەم هیچ دەمەتەقە هەڵناگرێ. لە منیش بە پێشەوە کەسانی تر گوتویانە. هۆی دووبارە کردنەوەی لێرەدا زێدە پێویستی میللەتەکەمانە بۆ خۆبەسەهونەبردن و خۆزەرەرمەندنەکردن. لە فەرزی میللەتی ئینگلیز خۆ گێل کا لە عاست «شەکسپیر» ئەوەندە شاعیر و ئەدیبی گەورەی تری دەمێنێتەوە دڵی خۆیان پێ خۆش کات، سەرەوەت و سامانەکە و فابریقە و داهاتە زۆرەکەشی چی لێ کەم نابێتەوە بە نەهێشتنی ناوی «شەکسپیر» لە فەرهەنگی ئەدەب و هونەرییدا. خۆ ئەگەر ئینگلیز لەم پلەیەی بێ ئینسافیەش تێپەڕێنێ و هەموو ڕابردووی خۆی بسڕێتەوە – کە هەرگیز نایسڕێتەوە، حورمەتی ڕووپەڕە بێحورمەتەکانیشی دەگرێ– حازرێکی هێندە دەوڵەمەندی هەیە بۆی تێبنێتەوە لە سڕانەوەی ڕابردووی. بەڵام کورد چی ئەوتۆی نیە لە ئێستاکەیدا دڵی خۆی پێ خۆش کات لە بەرامبەر کاری منداڵانەی ڕیسواکردنی ڕابردووی خۆی.

کورد لە بارێکدایە بۆی بپارێیتەوە نەک لێی کەم کەیتەوە بە تایبەتی کە خۆت کورد بیت، خۆ هەر بە جارێ بێ عوزر دەبیت ئەگەر لێ کەم کردنەوەکەت لە مەیدانی بایەخداری زێدە بە نرخی شیعر و ئەدەبی کۆنی بێت کە هیچی وەک ئەو بە نرخی نیە.

لەم گەشتەی ناو باغ و ڕاغی هەڵبەستەکانی نالیدا چەند نموونەیێکی ئەوتۆمان دیت کە لە ناو نموونەی هەرە پێشکەوتووی ئەدەبی ڕۆژهەڵاتدا پرشنگ بدەنەوە و نموونەکانی تر کز کەنەوە لە نەزەر خۆیاندا. ئەم بەرزیەی ئەدەبی نالی جارێکی تریش بەرز تر دەبێتەوە کە بە بیر خۆت بێنیەوە نالی ڕەوشتێکی پاک و نەفسێکی ڕێز لە خۆگرتووشی هەبوە و لەو ئەدیبانە نەبوە عەیب و عاری ڕەفتاری نالەباری لە ناو مەخمەلی هەڵبەستدا بشارێتەوە. چ نهێنیان ئاشکرا ناکەم بەوەدا کە بڵێم زۆر لە شاعیری ناسراوی خاوەن شۆرەت لە کۆن و نوێدا ئەگەر شیعر و هونەر شەفاعەتیان بۆ نەکەن لەوانە نەبوون بە برادەری خۆتیان قبووڵ کەیت نەوەکا ناوت بەد بێ پێیانەوە. نالی سەرەڕای ئەوە کە چ عەیبێکی لێ نەدیتراوە تا بشلێی ڕاست و دڵسۆز بوە لەگەڵ بیروباوەڕیدا، چی لە دڵدا بوە ئەوەی گوتوە و بە درێژایی ژیانی سوور بوە لەسەر قەناعەتەکانی.

بەڕاستی نالی یەکێکە لەو شاعیرانەی قەناعەت گۆڕییان نەکردوە. هەرچەند ئەم نووسینە جێی ساغکردنەوەی قەناعەت و بیروباوەڕی نالی نیە، بەڵام جێی ئەوەندەی تێدا دەبێتەوە بە پێی داخوازی موناسەبە بڵێم دیوانەکەی سەروبن کەیت و شیعرەکانی بەو پەڕی وردییەوە بخەیتە بەرچاوی زیهن و مەنتیقەوە چ فەرقێک ناکەی بە قەناعەتە بنجییەکانی لە قەسیدەییەکەوە بۆ قەسیدەیێک وەیا لە تەمەنێکەوە بۆ تەمەنێکی تر. وەک من لە نالی دەگەم ئەگەر پێمان بکرێ لیستەیێکی زەمەنی بۆ شیعرەکانی ڕێک خەین لێمان مەعلووم دەبێ ئەو لە تەمەنێکی مەیلەو زووەوە بەرەو پێکهێنانی قەناعەت و بیروباوەڕ چوە، هەر ئەم زوو کردنەش بۆتە هۆی خێرا ڕۆیشتنی بۆ حەج. تەنانەت نامەکەی بۆ سالم و پرس پێکردنی لە

بەرژەوەندی گەڕانەوەی بۆ سلێمانی ئەو ترسە پێی کردوە کە دوای گەڕانەوە دووچاری وەزع و ژیانێک بێ کە خۆی لێی ڕازی نیە. دەمەوێ بڵێم پەرۆشی بۆ قەناعەتەکانی وای لێ کرد ڕاستەوخۆ نەگەڕێتەوە، لە حاڵێکدا ئەو دەزانێ بەسەرچوونی دەسەڵاتی بابان و هاتنی حوکمێکی بێباکانەی عوسمانی لەوانەیە ڕێ لە ئازادیی ڕەفتار و قەناعەتی بگرن و مەیدانی لێ تەسک کەنەوە بە تایبەتی چونکە ئەو لە سەردەمی حاکمەکانی باباندا هەرگیز ناچار نەبوە لە ئاوی باوەڕی لێڵ بخواتەوە. دیارە لە حاڵی وەهادا تێکچوونی وەزعی سلێمانی بە نیسبەت نالییەوە ناخۆشتر بوە لە تاکە کەسێکی تر کەوا نە زۆر دەربەستی باوەڕ بێ و نە لە سەردەمی باباندا مەرحەبای دیبێ.

نالی کە لە شام مایەوە و دوایش، پاش گەیشتنی وەرامی سالم پێی، چوو بۆ ئەستەمبوڵ بێ ئەوە هیچ هۆیەکی گوزەرانی مسۆگەری هەبێ وەیا بە تەمای پەیدا کردنی هیچ پایە و ڕوتبە و نیشانێک بێ. خۆی دزیەوە لە گەڕانەوە بۆ سلێمانی لە ترسی بەرەنگار بوونی وەزعی بێ حورمەت بە دەست حوکمی کەم ئینسافی عوسمانیەکانەوە. ئەگەر ئەم ترسە بەرهەڵستی لێ نەکردبا دەیتوانی لە سلێمانی ئەو کەرتە نانە پەیدا کا کە لە شام و ئەستەمبوڵ پێی قانع بوو. هەر جارە کە ئەم بەیتەی لای کۆتایی نامەکەی بۆ سالم دەخوێنمەوە، لەگەڵ تەزووی سۆز و هەستی پەرۆشم بۆ نالی، دیمەنی مرۆڤێکی جوانمەردی ڕێزلەخۆگرتووشم دێتەوە بەرچاو کە مەرگی غەریبانەی ڕێزلێگیراو تەرجیح دەداتە سەر ژیانی ناو کەس و کار بە بێ حورمەتی و بێ دەسەڵاتی:

ئایا مەقامی ڕوخصەتە لەم بەینە بێمەوە
یا مەصلەحەت توقفە تا یەومی نەفخی صور

دیارە نالی لەم مەصلەحەتەدا مانگانەی دوکان و قەیسەری و داهاتی زەویوزارە نەبوەکانی مەبەس نیە، پرسیاری ئەو لەبارەی بوونی وەزعێکەوەیە کە بتوانێ تێیدا گوزەرانی نەمر و نەژیی بکا لەگەڵ پاراستنی دڵۆپی ئابڕوودا. پێش من سالمیش لە مەبەسی نالی گەیشتوە بۆیەیە لە وەرامدا بە زۆریی باسی بێدادی و بێ حورمەتی تورکەکان دەکا نەک نەبوونی نان و گوزەران:

شارێکە پڕ لە ظلم و مەکانێکە پڕ لە شین
جاییکە پڕ لە شۆڕ و وڵاتێکە پڕ لە شەڕ
سالم صفەت لە بێ کەسییا با نەبێ هەلاک
من کردم ئەو نەکا لە غەما خوێنی خۆی هەدەر

لێرەدا ڕەنگە پرسیارێک بکرێ و بگوترێ بە نیسبەت نالییەوە ئەستەمبوڵ و شام و سلێمانی چ فەرقێیان دەکرد؟ خۆ هەر عوسمانلی حاکمی هەموان بوون؟ پرسیارەکە بێ جێ نیە بەڵام بێ وەرامیش نیە. لە تەجروبەی خۆمان دەزانین ژیان لە جێگەیێکی تازە داگیرکراوی وەک سلێمانیدا بۆ کوردێکی شەرم بە خۆی موحتەرەمی وەک نالی سەختتر و جێگومانترە تا ژیانی ئەستەمبوڵ وەیا شام کە لە وێدا داگیرکەری عوسمانی پەڵپی بێحورمەت کردن بە غەریبێک ناگرێ کە لە هیچ ڕوێکەوە نایێتە ناو حیساب

و بەرژەوەند و چاکە و خراپەیەوە و چ لەمپەران لە بەر پێی هاڵنانێ. لەمەش بەولاتر، شاری گەورە و قەڵەباڵغ چاکتر دەبێتە حەشارگە بۆ کەسێکی بیەوێ بەرچاو نەبێ، نالیش لەوە زیاتری نەویستوە ژیانێکی ڕەشۆکی بێ ئارایشت لەناو ئاپۆرەی شاری گەورەدا چەپارەی بدا لە نیگای نارەزای میری و ئەو هەڵمەتەکاسانەی خۆ لە میری نزیک دەکەنەوە بە تێوەگلاندنی بابای وەک نالی ڕێزلەخۆگرتوو.

ئەم بە قەناعەت نازینە و لە خۆڕازی بوونەی نالی لە گەلێک ڕەفتاری تری نالی سەر هەڵدەدەن. جارێ چەندێک سەیری هەڵبەستەکانی بکەیت پارانەوەی لەبەر کەس تێدا نابینیتەوە، خۆ داوا کردنی یارمەتی و لووتەخۆری هەر هیچ. نووسەرێکی کورد لە پێشەکی دیوانە چاپکراوەکەی نالی خلیسکی بە خامەی خۆی بردوە و نالی شکاندۆتەوە بەو یەک دوو ناوبردنەی حاکمەکانی بابان کە لە چەند موناسەبەیەکدا هاتوونەتە ناو شیعریەوە. بەرامبەر ئەم شکاندنەوەیە چەند وەرام دانەوە و ڕاستکردنەوە و ڕوونکردنەوە هەن:

یەکەم: گەلی کورد بە ئاواتەوەیە لە مێژووی خۆیدا هەڵکەوتی وەها پڕ شانازی بدۆزێتەوە کە ئەدیبێکی کورد مەدحی حوکمڕانێکی کوردی کردبێ. وەی کاشکی سەرلەبەری ئەدەبی کۆنمان مەدحی بەروبارەگا و دەست و قام و جوامێریی حاکمە سەربەخۆکانی کورد بوایە. کاشکی کورد خاوەنی ئەو حوکمڕانە بویایە بە درێژایی مێژوو مەدح کرابایە.

نالی کە دێ و مەدحی «تاقمە مومتازەکەی شاهـ» دەکات تابلۆیێکی پڕ شەرافەتی مێژوە هەژارەکەی کوردمان بۆ دەکا بە نەمر. چ دەستێکی سواڵ و سەدەقەشی تێدا پان نەکردۆتەوە ببێتە لککە لەو تابلۆیەدا. لاواندنەوە و پیرۆزباییەکەشی بۆ مەرگی سلێمان پاشا و حوکمڕانی ئەحمەد پاشا لە قەسیدەکەی «تا فەلەک دەوری نەدا» ئەویش وەک هی «تاقمی مومتازی شاهـ» هەستی بەخۆنازینمان زیندوو دەکاتەوە و گیانی کوردایەتیمان تیژتر دەکات، بەشێکی زۆری هەتیوایەتی کۆنینەشمان لە بیر دەباتەوە بەوەدا کە پێمان دەڵێ ئەمیرێکمان هەبوە لە مردنیدا بۆی بگریەین و یەکێکی تریشمان هەبوە لە هاتنی بۆ سەر تەخت پیرۆزبایی لێ بکەین.

لەم قەسیدەیەشدا نالی هێندە بڵند دەڕوانێ و خۆی بەرز دەکاتەوە لە لایەنی چاو چنۆکیەوە دەتوانم بڵێم پێی دەگاتە شانی ابو تمام و بحتری و متنبی. بەڕاست ئەم گیانی بەرزبوونەوەی نالی ژووروی گومان لێکردنی یارمەتی خواستن کە لەم دوو قەسیدەیەدا دەچنە ناو بیبیلەی هەموو چاوێکی بیناوە، دیمەنێکی یەکجار ئاشکرای بەخۆنازینی نالی دێنێتە ناو هەڵبەستەکانەوە هەندێ مەدح و لاواندنەوەکە جێی خۆی کردۆتەوە.

بە لێوردبوونەوە دیار دەکەوێ نالی لەم دوو قەسیدەیەدا بە پێی حوکمی سروشت و ڕەوشتی فیتری لە تارمایی دەست پان کردنەوە دوور کەوتۆتەوە نەک لەبەر خۆپاراستنی دوای لێکدانەوە چونکە لە هەردوو قەسیدەدا تاکە یەک وشە نادۆزیتەوە باسی سەخاوەت و بەخشینی مەدح کراوەکان بکات چ جای ئەوەی داوای یارمەتی بکات.

بەمەدا دیارە نالی دڵ و دەروون و فکر و زیهنی بە لای چاو چرکردنەوەدا نەڕۆیشتوە، هەر بیریشی لێ نەکردۆتەوە، چونکە ئەگەر لە گۆشەیێکی هەست و نەستیدا وێنەی تارمایی خواهشت و نیاز هەبا، خۆشی بێ و ترشی بێ، سێبەرێکی ئەو تارماییە دەکەوتە ناو هەڵبەستەکانەوە وەیاخود هەر نەبێ لە وشەیێکیاندا «ئحم»ێکی وەک هی کابرای گۆشەی مزگەوت دەبیسترا.

لێرەدا پێویستی ڕوونکردنەوە و وەرام دانەوە باسی دوو قەسیدەی هێنا ناوەوە کە مەدحی پاشای
بابان و تاقمی تایبەتی ئەوی تێدایە. نالی لە تاکە بەیتێکی تریشدا مەدحی سلێمان پاشای کردوە،
هەڵبەت ئەم مەدحە دەبێ پێش مەرسیەکەی «تا فەلەک» بێ. ئەم تاکە بەیتە چاوی هەموو ئەو ئەدیبانەی لێ
خلیسکاوە کە من لە بارەی شیعری نالیەوە ئاخاوتنم لەگەڵدا کردبن وەیا نووسینیانم خوێندبێتەوە
دەربارەی نالی. منیش بەینێکی دورودرێژ لێی بێ ئاگا بووم تاکوو لە خۆوە بە تێپەڕینی کات و کەڵەکە
کردنی داهاتی ئاشنابوونم بە نالی لە ناو دەروونمدا واتای بەیتەکەم بۆ ڕوون بۆوە بایی ئەوەی مەدحی
سلێمان پاشای تێدا بخوێنمەوە:

هودهودی دڵ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە یەقین
خۆی کە دامەنگیری شاهی ئاصەفی ثانی دەکا

بێگومان شاهی ئاصەفی ثانی – باسی ئەم بەیتە بە درێژتر لە بەشی دووەمی «حاجی قادری کۆیی»
هاتوە – لەم بەیتەدا سلێمان پاشای بابانە چونکە دیارە شاهی ئاصەفی یەکەم سلێمان پێغەمبەرە بە
خۆی و سەرگوزشتە قورئانیە زۆر مەشوورەکەیەوە لەگەڵ هودهود و بەلقیس و سەبادا کە لەم بەیتەدا
نالی کردوەتی بە مەبەستی هەڵبەست، کە سلێمانێکی دوەم هەبێ وەک سلێمانی یەکەم پاشا بێ و نالی
دامەنگیری بێ، کەسێکی تر نیە لە سلێمان پاشای بابان بەولاوە.

هەرچەند کەموزۆری پەیوەندیی نالی بە دەرباری پاشاکانی بابانەوە بە چاکی نەزانراوە و نەبیستراوە
بەلاّم لەم بەیتە و مەدحەکانی تریشدا دەردەکەوێ نالی بە هۆی بوێژیی بێ مانەندیەوە لە پاشاکان نێزیک
بوە و ڕێزی لێ گیراوە. دەم و دوی ئەو هەڵبەستانەی تامی ئاشنایی و دۆستایەتی لێ دەکرێ لەگەڵ مەدح
کراوەکاندا واش ڕادەگەیەنێ نالی لەسەردەمی حوکمڕانی سلێمان پاشاوە بوە بە دۆستی نێزیکی بابان
چونکە مەدح و پێداهەڵگوتنی بۆ سلێمان پاشا و ئەحمەد پاشا، لەوان بە پێشەوە چ مەدحێکمان لێ
نەبیستوە دۆستایەتی و ئاشنایەتی ڕابگەیەنێ بە پاشاکانەوە.

دوەم: نالی ئەگەر مەبەسی لەم مەدحانەدا نان پەیدا کردن بوایە دەبوو باشتریش مەدحی خەلیفە و
والی و وەزیر و پیاوماقوڵەکانی عوسمانی کردبایە. کەچی نە ناوی هێناون نە لێشیان نزیک بۆتەوە.
سەیر لەوەدایە هەرچەند تورکیەکی باشیشی زانیوە بە دەگمەن نەبێ شیعری بە تورکی نەگوتوە، ڕواڵەت
وا ڕادەگەیەنێ نالی نەیویستوە، وەیا خۆی نەخستۆتە بارێک، هەڵبەست بە زمانی دەسەلاّتداری بێگانە
دانێت نەوەک بە خۆتێهەڵسوون لەسەری حیساب بکرێ و گومانی دەست پانکردنەوەی لێ بکرێ.

نەبوونی مەدح لە هەڵبەستی نالیدا دیاردەیێکە سەربەخۆ. جگە لەو دوو سێ مەدح و ناوهێنانی بە
موناسەبە کە بۆ میرەکانی بابانی کردوە تاکە یەک مەدحی تر لە دیوانەکەی هەیە ئەویش بۆ شێخ نوری
ناوێکی ڕوودباریی «ڕوباریی»یە:

لە چاوی ڕوودبارم نوری دیتن وەختە تاری بێ
ئەمیش با ماجەرای هیجرانی «نوری ڕوودباریی» بێ

له لاپەڕە ٨٧ ی دیوانەکەی چاپی هەولێر سەیرێکی ئەم هەڵبەستە بکە و نەختێک سرنج بگرە وشەکانی دەرحاڵ بۆت مەعلوم دەبێ نالی ئەم پارچەیەی بە موناسەبەی چوونە حەجی «نوری ڕوودباریی» داناوە:

چ میعمارانە بۆ تەعمیری کەعبەی دڵ دەچێتە حەج
خودا یار و مەدەدکار و نیگەهداری عماری بێ

دیارە نالی لێرەدا مەدحی برادەرێکی خۆی دەکات کە دەچێ بۆ حەج و پیاوێکی خوایی و موسڵمانە هی دونیا و دەسەڵات و زەبر و زۆر نیە. لە سەرانسەری بەیتەکانیش، دیسان، چ دەست پانکردنەوەیێک نادیترێ. من لە بارەی ئەم «شێخ نوری ڕوودباری»یەوە هەر ئەوەندە دەزانم بەینێک لە کۆیێ ژیاوە و پیاوێکی بەرچاو و ڕێزلێگیراویش بوە. بە پێی گێڕانەوەی دەماودەمی باوکم لە باپیرمەوە شێخ نوری نانی بە شێخایەتی پەیدا نەکردوە، خۆی خاوەن بەخشین بوە و بە ماڵی خۆی خزمەتی خەڵقی کردوە.
نالی لە زەمینەی مەدحدا ئەوەندە کنارەگیر بوە تەنانەت لە پیاوانی ئاینیش تەنها مەدحی پێغەمبەر «ص»ی کردوە، هەر لە نێوان مەدحی ئەویشدا ناوی چوار خەلیفەکەی هێناوە. بەلای باوەڕی منەوە ئەو برە شیعرەی «عاشورا» کە لە لاپەڕە «٧٥» دیوانەکەی چاپی هەولێردا چاپ کراوە نە هی نالیە و نە بە هیچ کلۆجێک دەچێتەوە سەر شێوازی نالی. برە شیعرێکی بێهێزی نابەڵەدانەی بێ تام و شام کە لە شاعیری ڕیزی دوەمی شیعری کوردیش ناوەشێتەوە چ جایی ئەوەی لایەق بە نالی بێ. نەختێک وردبوونەوە لە بەیتەکان دەری دەخا خاوەنی قەسیدەکە کێیە. لە بەیتی چوارەمیندا شاعر ڕووی قسە لە خۆی دەکا و ناوێک دێنێ یا ناوی ڕاستەقینەی خۆیەتی یا نازناویەتی. من لێرەدا بەیتی چواردەم شکڵ نووس دەکەم لەبەر دیوانەکەی نالی چاپی هەولێر ١٩٦٢:

عارفا سەد عەقل کل حیرانە وا لەو عالەمە
عالمی اعلم کە بۆ خۆی هەم علیم و اعلمە

وشەی یەکەمی بەیتەکە «عارفا» بانگ هێشتنی «عارف»ە لە لایەن خاوەنی ناوەکەوە. لەمەدا چ گومانێک نیە و دەبێ بتۆژێتەوە کام شاعیری کورد ناوی وەیا نازناوی «عارف» بوە. بەم پێیە دەبێ کۆتایی قەسیدەکەش ناوی «نالی» لێ دەرهاوێژرێ و عارفی بخرێتە جێیەوە:

لۆمەیی «عارف» مەکەن یاران ئەگەر بمرم لە غەم
خۆش ئەگەر سەد پارە کەم هێشتا لە غەم ئەمرۆ کەمە

پوختەی گوتە لێرەدا ئەمەیە کە شیعرەکان سەرەڕای بێهێزی و بێجوانی و بێهونەرییان، دژی تەبعی نالیشن لە ڕووی ئەوەوە نالی لە مەیدانی دینداریدا ستایشی خوا و پێغەمبەری کردوە و بەس. سەیرێکی ئەم بەیتە قوندیلەیە بکە و پێم بڵێ بە کام کوێرەڕێدا بۆ سەر خەزێنەی گەوهەرەکانی نالی دەبردرێتەوە؟

احمد و اولاد و الش در عرب شبهی گوڵن
حاصلی گوڵ خاره ئەی دانا دەلیلی محکمه

لە پێش چاوی مندا نالی نەفسی لە بەرزییدا هاوتای شیعرەکانیەتی لە مەتانەتدا. بە خۆڕایی و بێ بنج نیە نالی هێندە بە خۆی و شیعرەکانی خۆیدا هەڵدەڵێ. دیارە هەستی بە بەرزیی دڵ و دەروونی ئەوەندە بەهێز بوە چ کۆمەی نەکردوە لە دەربڕینی ئەو هەستە چونکە بەلای خۆیەوە شتێکی وەک بەدیهیەی گوتۆتەوە لە هەموو ئەو کەسانە مەعلوومە کە دەیناسن. مرۆڤی گومان لە خۆکردوو ناوێرێ لە خۆهەڵدانەوە و ناز بەخۆکردندا خەڵق بێ منەت کات لە ترسی بە دەمدا هاتنەوە و عەیب دیار خستنی. وا دیارە نالی هیچی ئەوتۆی بە خۆی شک نەبردوە لە خەڵقی بترسێنێ وەیا چاوشۆڕی کەس بکات. کەسێک چ ڕۆژان هەڵوەستێکی بێ حورمەتانەی لە خۆی دیبێ ناتوانێ بەم شێوەیە ژووروویی عالەم کەوێتەوە:

ئەم سەرسەری بازانە کە وا هەمسەری بوومن
موشکیل بگەنە ساعیدی شاهێکی وەکوو من

من بەش بە حاڵی خۆم چەندێکی بڵێی ئەوەندە گەش دەبمەوە بەوەدا کە دەبینم و دەزانم نالی لە ڕەوشت و بەرزیی نەفسدا هاوتای نالی بوێژ و ئەدیبە، چونکە بەڕاستی فەلاکەتە ئەدەبی بەرز بخرێتە ناو نەفسی پەستەوە. پێی ناوێ من بڵێم لە خۆوە دیارە پیاوی نزم لە گوتنی وشەی بەرزدا درۆزنێکی ئانقەستە. شاعیرێک وەیا ئەدیبێک کە ناو و ناتۆرەی بە دواوە بوو لە هەموو گوتەیێکیدا تارمایی بەدناویەکەی لەبەرچاوان قوت دەبێتەوە و قسە خۆشکەڵەکانی بە درۆ دەخاتەوە یاخود هەرنەبێ لە بایەخیان کەم دەکاتەوە.

وا خۆشە دەست و زمان بەیەکەوە پاک بن. صەد شکور ئەم خۆشیە لە شاعیریەتی نالیدا بە زیادەوە پێک هاتوە.

لە بەشێکی ئەم گوتارەدا لایەنێکی تایبەتیەکانی ئەدەبی نالی کە پارسەنگ بوون و لەنگەر بەستنە قسەی لێ کرا بایی ئەوەی لە قەوارەی گوتاردا بگونجێ، ئەوەش گوترا کەوا بە ڕادەی بەشداربوونی زات و بابەت «هونەر و زانست» لەو پارسەنگ بوون و لەنگەربەستنەدا توانا و دەسەڵاتی شاعیر خۆ دەنوێنێ. ئێستا کاتی ئەوە هاتوە بڵێم چەندێکی شاعیر بتوانێ لەگەڵ هێنانەوەی واتای وشک و وشەی سەختدا زرینگە و مۆسیقا و نازکی و پاراویی لە هەڵبەستدا بپارێزێ شاعیرتر و هونەرمەندتر و دەسەڵاتدارتر دەبێ ئەم لایەنەی پاراستنی تاو و تەئسیر و زەوق و شەوقی ئاخاوتن لە هەموو حاڵێکی لەبار و نالەباردا لە «قران»دا زۆر بەرچاوە. کەسێک نەختێک شارەزایی هەبێ لە جوانی گوتە، سەیرێکی ئەو ئایەتانە بکا کە لە دابەشکردنی میرات دەدوێن تێ دەکا دەسەڵاتی «قران» گەیشتۆتە کوێ چونکە لە باسی میرات و پشکی میراتگران وشکتر و وەڕسکەرتر نیە کەچی ڕستەکانی «قران» بە شێوەیێکی ئەدەبی ئەوەندە تەڕ و پاراو لێیان دەبێتەوە چ فەرقێکی نەبێ لەگەڵ ئایەتەکانی دوای سەرکەوتنی «بدر» کە جێگەی بەکارهێنانی ڕستەئارایی و هونەرکاریی و ڕەوانبێژییە. لێرەشدا چ گومانێک نیە کە نالی پەیرەویی قورئانی کردوە لە بەکارهێنانی وشە و واتای ڕەق و سەرکەش لە قاڵبێکی شەنگ و شلکدا. من ناڵێم

ئەگەر قورئانی نەدیبا نەیدەتوانی هونەر بەکاربێنێ لەو تەرزە جێگایانەدا، هەر ئەوەندە دەڵێم نالی شوێن پێی قورئانی هەڵگرتۆتەوە لە گەشتی ناو نغوردی وشە و واتای سەختدا. وەک لێرە بە دواوە، لەم بەشەی گوتارەکەم بێ وەیا لە بەشی سێیەمیدا، نموونەی بەیتەکانی نالی دەری دەخەن هەندێ جار واتا و ڕستەی ڕاستەوخۆ لە قورئانەوە هەڵقولێون. پێشتریش جارێکیان نموونەم هێنایەوە لە شیعری نالی کە واتای قورئانی هۆندۆتەوە بەڵام وشەیێکی ئایەتەکەی قورئانی گۆڕیوە بە وشەیێکی تر بۆ پاراستنی مۆسیقای هەڵبەست، ئەم جارەیان وێنەیێکی تر لە ئەدەبی نالی دێنینە بەرچاو کە لەوێشدا هەر پەیڕەویی قورئانی کردوە ئەگەرچی بۆ مەبەستێکی تر بێ، کە بریتیە لە سەر نەرمکردنی وشە و واتای سەخت بۆ ناو قاڵبی هەڵبەست. وردە وردە بە دەم شەرح دانەوە دەگەینە نموونەی ئەم بابەتە لە هێز و دەسەڵاتی نالی.

کۆمەڵ کردنی وشەی نازک و تەڕوتۆڵ و زرینگەدار لە ناو هەر نووسینێک بێ –هەڵبەست یا پەخشان– لە خۆوە ڕەونەقێک دەدا بە نووسینەکە، ڕێگەش هەموار دەکا لە پێش هەنگاوی نووسەر بۆ ئەوە بێ زەحمەتێکی زۆر زەنەی دەروونی بخاتە ناو زەرفێکی جوانەوە. شاعیر هەیە بەشێکی زۆری دیوانەکەی وشەی بژاردە و تریسکەدارن کە لەبەری بێواتایی پێ پڕکردۆتەوە. بێگومان نالی لە بەکارهێنانی وشەی جواندا مەبەسی تێبردنی بێ واتایی نەبووە چونکە وەک دەزانین واتا لە شیعری نالیدا تەنگی بە وشە هەڵچنیوە. لە هێنانەوەی نموونەی شیعری نالی لێرەدا مەبەس دەرخستنی دەوری وشەی جوانە لە هەڵبەستدا بێ ماندوو بوونی شاعیر:

دیدەت وەکو گوڵ سوورە پڕی شەبنمی ئەشکە
یا لالەیی پڕ ژاڵەیە دوو نەرگسی شەهلات
بەو گریەیی تۆ ڕەنگە منیش هێندە بگریێم
گەوهەر بڕژێنم بە بلندیی قەد و باڵات

نموونەی دوەم:

ئەوە لێوی ئەتۆیە پڕ لە خەندە
کەوا شەککەر دەباری گوڵ دەپشکوت

نموونەیێکی تر:

من گریە ئەتۆ خەندە بە یەکدی دەفرۆشین
من لەعلی بەدەخشان و ئەتۆ لوئلوئی لالا

یەکێکی تر:

دیدە و دڵ هەردوویان جۆبار و جۆیای قەدیی تۆن
سەروی دڵجۆی عەرعەرە دڵ جۆی نەمامی دیدە جۆی

ئەمەشیان:

تیپی شکۆفە خیمەیی داوە لە هەر تەرەف
یا شاهی نەوبەهارە هەڵی داوە هوردوێ

لەم نموونانەدا وشە و قاڵبی شیعرەکان هێندە شلک و ناسکن هەر دەڵێی لە مەیدانی واتادا ئەو وڵاغە ئازموودە خۆش جڵەوە پشت نەرمەیە کە نالی وەک سووکە سوارێکی وڵاغناسی دەست مەعلانی پێ و ڕکێف مەحکەمی شارەزا بێ ترسی ساتمە و خلیسکان، جلیت بازیی و غارێنە و مەقەسەی پێ دەکا. بەڕاستی وشەکان ئەوەندە تەڕ و پاراون بە بەریانەوە هەیە بیان گوشی ئاویان لێ بێ.

لە شیعری وەها وشە نەرم و نۆڵدا تەنها ئەرکی ڕێکخستنی لەبار و ڕیزکردنی دەست ڕەنگینانە دەکەوێتە ئەستۆی شاعیر، پێویست بەوە نیە شاعیر زرینگە و تەڕایی و شەنگی و شلکی لە شیعرەکە پەیدا بکا چونکە وشەکان پەیدایان کردوە. زێدە وەستایی و هونەر و زەحمەت لەوەدایە وشەی سەخت و سەرکەش نەرم بکرێ و سەر دانەوێنێ بۆ ناو میحرابی هەڵبەست.

هێنانی وشە و ڕستەی زەحمەت و ڕەق لە دەسەڵاتی هەموو شاعیرێکدا هەیە، بەڵام چ سوود ئەو وشە و ڕستانە وەک ئێسکە ماسی لە ئەوکی بەیتەکان گیر ببن. ئەم دەسەڵاتەی تێبردنی ڕەقایی وشەی سەخت لە نێو شیرازەی هەڵبەستدا بە زیادەوە لای نالی هەیە، بەڵام بۆ هەست کردن بەو دەسەڵاتە و زەوق لێوەرگرتنی، یاخود چاکتر ئەوەیە بڵێم بۆ سوودمەند بوون و سامان پتر کردن و خۆچەسپاندن لە مەیدانی ئەدەبدا بەهۆی هەستکردن بەو دەسەڵاتەی نالی، دەبێ خوێنەری کوردی تازە پێگەیشتوو دڵ و مێشکی خۆی ڕزگار بکا لەم تەم و تاریکایی هەموو ئەو دەنگ و باس و حیکایەتە سەرلێشێوێن و بەهەڵەبەرانەی کە خوێندەوارییە ناتەواوە لاساییکەرەوەکەی ئەوروپا لە ڕێی ئەدیبە نەورەسەکانمانەوە چەشمەندازی بیر و ئەدەبی لێڵ کردوە یاخود خەریکە لێڵی بکات. ئەدیبی تازەی کورد بۆ ئەوە ستەم لە خۆی و ئەدەبەکەی هەڵەنگێوێ دەبێ یەکجارەکی لە دەستە ستەمکارەکەی دوشمنایەتی ڕابردوو ڕزگار بێ، ئەگەر بمانەوێ ناوی ڕاست بۆ ئەو دوشمنایەتییە دانێین دەبێ پێی بڵێین نەخۆشی نەفسی، چونکە ئەم ڕقهەڵگرتنەی ئەدیب لە، تراث، چ فەرقی نیە لەگەڵ ڕقهەڵگرتن لە باوک و دایکی بە دوا ئەوانیشدا لە نەفسی خۆی چونکە لە دوارۆژدا خۆی دەبێتەوە بە باوک و دایک، ئەدەبەکەشی دەبێتەوە بە «تراث»...

کە حاڵ وا بێ چ چار نامێنێ دەبێ بڵێین ئەدەبی ڕقهەڵگرتوو لە ڕابردوو دوچاری نەخۆشی نەفسی بوە. بێ و لەم دەستنیشانکردنەی هۆی ڕقهەڵگرتنەکە نیشانمان نەپێکابێ و بە سەهوو چووبین، ئەوسا هەرئەوەندەمان بۆ دەمێنێتەوە بڵێین ئەو تەرزە ئەدیبە لە قەپێڵکی زات و باوەڕەکانی خۆیدا خەریکی دەروێشی و سۆفێتییە چاو و گوێی خۆی لە تیشک و دەنگی حەقیقەت بەستوە و زەرک وەشینی دەکا لەسەر تەرمی ڕۆژگارە بەدبەختەکەی گەلی کورد.

من کە ناوی لاسایی کردنەوەی ئەوروپا دێنم مەبەسم بە سەهوو چوونی ئەوان لاساییکەرەوەن کە لە ئەنجامی چاو هەڵاتنیان بە شارستانیەتی ئەوروپاوە ڕاستەوخۆ دەکەونە دژی ڕابردوومان کە دەبینین ئەو ڕابردووە بە گەز و گرێی فکری نوێی ئەوروپا «ڕەجعی» و پاشەکەوتوو دەردەچێ، لەمەشدا تا ڕادەیێک شوێن پێی تیرێژێکی تەسکی ئایدیالیزمی پڕ لە کوڕێنی هەڵدەگرنەوە کە ئەورووپاش پێیەوە نەختێک نارەحەت بووە، لە حاڵێکدا ئەوروپای ڕاستەقینەی مێژووی لە سەر خەتی حەزارەتی ڕەسەن هەڵستاو، هەرگیز ئەو چاپوولەی ڕقهەڵگرتن لە ڕابردووی نەهاویشتووە بەڵکو ڕۆژبەڕۆژ لە حورمەتی شتی کۆنینەی

زیاد دەکات تا گەیشتە پلەیێک لە بایەخدان بە ڕابردوو یاسا دەردەچوێنێ بۆ هێڵانەوەی کۆڵانە تەسک و تاریکەکانی سەدەکانی ناوەڕاست نەکا دەستەی شارەوانی بە ناوی نوێکردنەوە و سازگارکردن دەستیان تێ بدات. کە کۆڵانەی تەسک و خانوە شڕی کۆن بپارێزێ دیارە ئەدەب و هەموو بەرهەمێکی فکری کۆن بەولای پارستنەوە دەبات. ئەوروپا ئەو دەبەنگە نیە مەوجوودی کۆنینەی وێران بکا لەبەر تاکە هۆی ڕقلێبوونەوە و کەیف پێنەهاتن. ئەوروپا لە مەوجوودی کۆنی زیاد دەکات و ڕۆژگاری نوێی دەداتە بەر درێژە کێشانی سەرکەوتویی ڕابردوو، دواڕۆژیش لەسەر بنجی ئێستایەوە بەرەژوورتر دەبا. ئەم تێگەیستنەی کۆن و نوێ و ئایندە بە چەشنێک خۆی سەپاندوە لە وڵاتە پێشکەوتوەکان و وەهاش لە هەموو تەجرەبەیەک دەرچوە، وای کردوە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەش بکشێتەوە لە گەلێک هەنگاوی کاڵ و کرچی چەپڕەوانەی بە زاهیر پێشڕەو کە «لینین» کاتی خۆی دلێرانە تاوانباری کرد و بە هەموو توانییێکەوە بزووتنەوەی بۆڵشەڤیکی لێ گێڕایەوە. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ کەلەپووری ئادەمیزاد پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە ئەوروپا و «لینین» لەسەری بکەنەوە بۆ خۆشویستن و پایە لێنانی. گریمان بۆ ماوەیەک هەموو جیهان هێندە خولێگۆڕبوو بوو کەوتە دژی ڕابردوو، ئەوساش ئەم ڕابردوە هەمان تاکە سەرچاوە دەبێ کە ئێمەی لێ هەڵقوڵیوین ئیتر بایی حورمەت و نرخی ئێمە ئەویش بە حورمەت و نرخە. هەرگیز نایەتە عەقڵی ڕاست و دروستەوە مەرحەبا بکرێ لە تف هاویشتنی سەرەووژوور.

کە قسەمان گەیشتە ناوهێنانی ئەوروپا با ئەوەش بڵێم ڕۆشنبیرانی ئەوروپا، چ سۆشیالیست چ سەرمایەدار، لەوەندە ڕاناوەستن بایەخ بە ڕابردووی خۆیان بدەن، ئەوان لە جیاتی ئێمە خەریکی ڕابردووی ئێمەن و ڕێز لە کەلەپوورمان دەنێن. کە نەختێک بگەڕێینەوە بۆ ڕابردوو دەبینین بەشێکی زۆر لە زانا و ئەدیبەکانی ئەوروپا خۆیان تەرخانکردوە بۆ ڕۆژهەڵات ناسی و بەهۆی خەریک بوون و لێکۆڵینەوەی ئەوانەوە خەڵقی ڕۆژهەڵات شارەزای ڕابردووە زۆر کۆنەکەی خۆیان بوونەوە کە هەزاران ساڵ بوو لە بیری کەسدا نەمابوو. پیاوێکی وەک ئۆسکارمانی ئەڵمان لەسەر تەکلیفی قەیسەری ئەوسای ئەڵمانیا بەر لە ٧٠ ساڵ هاتۆتە کوردستانی ئێران و بەند و بەیت و حیکایەتە کۆنەکانی کوردی نووسیوەتەوە لە دەمی شایەر و حیکایەتبێژی کوردەوە. تازەبەتازە کۆڕی زانیاری کورد خەریکە ئەو کارە تەواو کات کە ئۆسکارمان شەقڵی بۆ شکاندین لە جەرگەی ژیانی مەعنەویمانەوە. زۆربەی ئەنتیکە و ئاساری کۆنی ڕۆژهەڵاتی نێزیک زانا ئاساریەکانی ئەوروپا دەریانخست و خوێندیاننەوە.

بەلامەوە یەکجار سەیرە ناوناوە کە دەبیەم ناوی ئەو زانایە ئارکیۆلۆجیانە بە «دز» دەبرێ، گۆیا بەشێکی زۆر وەیا کەمی ئەنتیکەکانیان بردوە بۆ ناو مۆزەخانەکانی وڵاتی خۆیان. لەم قسەیەدا خەڵقەکە ئەو ڕاستییە لە بیر خۆیان دەبەنەوە کە ئێمە بە درێژایی هەزاران ساڵ خەریک بووین شوێنەوارەکانمان کوێر دەکردەوە و ئەنتیکەکانمان وردوخاش دەکرد و ئەو نووسینانەی بەسەر بەردانەوە بوون هەموومان دەسرینەوە. دەک دەستی ئەو دزە خۆش بێ کە نایەڵێ مێژوو بە دەست نەفامانەوە سورگوم بێ. مەسەلەی کتێبە دەسخەتە کۆنەکانمان ئەویش وەک ئەنتیکەکانمان زوربەیان لە کتێبخانەی ڕۆژئاوا پارێزران، بەشێکی زۆری دەسخەتی نرخدار لە وڵاتی خۆمان بوونە خۆراکی مشک و مۆرانە و سیسرە. ئێمە بە داخەوە لە عاست کتێب و شوێنەواری کۆنمان وەک ئەو ئەهرەمەنە بووین کە بەیتە شاکارەکەی پیرەمێرد لە موناسەبەیێکی جەرگبڕدا ئیشارەی بۆ دەکا:

شەوێ دەست ئەهرەمەن کەوت خاتەمی مولکی سلێمانی
کەچی میر و گزیریی پێ دەکرد قەدری وەها زانی!

چەندین جار دیومە مەردی دڵسۆزمان هەر هێندەی عەقڵ بە دونیا شکاوە کە پەڕە شڕی کتێبی دەسخەتی دیوە لە ناو خۆڵ کەوتوە گوتوەتی دادەی خێرا بیسوتێنن نەکا بێحورمەت بێ. ڕەنگە پەڕە شڕیی ئەوتۆیی گەوهەرێکی واتا وەیا خەزنەیێکی دەنگوباسی ڕابردوو لە پەراوێزێکی نوسرابێتەوە و بە سووتاندنی لەناومان بردبێ. هەر ئەو پەڕە شڕانەن ئێستا لە کتێبخانە زلەکانی ڕۆژئاوا جامخانەی بۆ دروست کراوە لە خانووی بە کۆندیشندا، ژمارەشی خراوەتە سەر وەک ئەوەی سامانێکی نرخدار بێ. ئێمە خەریکین لەوانەوە نرخی ئەو کتێبە زەردە پەڕپوتانە و پەڕە شڕانە بزانین و بە چاولێکەری وانەوە بیانپارێزین. سەیر لەوەدایە دوای کرانەوەی مێشک و چاومان بۆ نرخی ئەوان ئاسارانەمان لە ڕێی پەند وەرگرتن لە میللەتانی پێشکەوتوەوە، ئەدیبی نەوباوی کورد خەریکە بەهۆی بەسەهووچوونیەوە لە لاسایی کردنەوەی نابەڵەدانەی ڕۆژئاوا سەرلەنوێ دەست دەکاتەوە بە لەناوبردنی کەلەپۆر و ڕابردوومان: جاران پاشکەوتو بووین ڕابردووی خۆمان دەکوشت، ئەمجارەیان ڕابردوومان بە پاشکەوتوویی تاوانبار دەکەین و دیسانەوە دەیکوژین... سەیرە لە کۆییێ!!

بە هەمەحاڵ هەڵوەستی ئەو ئەدیبانە لە عاست کەلەپۆر هەرچی دەبێ با ببێ، من کە خۆم بە ڕۆڵەیێکی نیوەی دوەمی سەدەی بیستەم دەزانم و چاوم بڕیوەتە ئەو هەنگاوە هەڵنەهێنراوانەی زووتر بەرەو سەدەی بیست و یەکەممان دەبەن، ڕێزی زۆرم هەیە بۆ ئەو کەسانەی بە پێی سەردەمی خۆیان نەختێکیان لە ڕوناکایی ڕۆژگارە تاریکەکەیان زیاد کردوە، مەرجیش دانانێم ئەو ڕوناکییە لە گڵۆپی کارەباوە وەیا لە چرای لۆکسەوە بێ، چرا قودیلە و شاپڵیت و مۆمیش بێ پێی ڕازیم. من کە لۆکسم چنگ نەکەوت چرا قودیلە و مۆم ناکوژێنمەوە چونکە چیترم نیە ئەشکەوتەکەمی پێ ڕوون کەمەوە. کە کارەباشم بوو دەرحاڵ شەوقەمەنیە کۆنەکان بەلاوە دەنێم بێ ئەوە زەرەیێک لە ڕێزم بۆیان کەم بێتەوە. ئەم شەوقە کزانە لە کاتی خۆیاندا کاری کارەبایان بۆ کردووم ئیتر بۆ لێیان ناڕازی بم! ئەگەر چیترم بە بەرەوە هەبا دەبوو لە کاتی خۆیدا بە کاریبێنم. من تورە نابم لەو شەوقەی هەمبوە، بە پەرۆشم بۆ شەوقێک کە نەمبوە.

من دەستی وێران کردن و لەنەوبردن بۆ هیچ شتێکی لێرە بە پێشەوەی کورد درێژ ناکەم کە بزانم بایی تۆسقاڵێک لە سامانە یەکجار کزەکەمانی زیاد کردبێ چ جایی شیعری کەڵە شاعیرێکی وەک نالی بە هەموو گەز و گرێیەکی سەردەمی خۆی لە ڕیزی هەرە پێشەوەی شیعری ڕۆژهەلات دێت. من کاتێک لەبەر خۆمەوە دەخوێنمەوە:

ئەم غەزالانە کە نەقشی دیدەمن
تەن سپین و دیدە کاڵ و موو سیان

هەست دەکەم نالی سەرەڕای پژاندنی ڕەنگ و بێنی بەهەشتی هەڵبەست بە ڕوماندا، وێنەیێکی هونەریی ئەوتۆشی لە لوولووی وشە و ئاوریشمی هۆنینەوە نەخشاندوە هاوتای تابلۆی ڕەسامە زلەکانی جیهان بێت. کورد کە کەسی نەبوە بە «ڕیشە» وێنە بکێشێت نالی هاتوە بە هەڵبەست وێنەگریی کردوە، بەڵگەی

سەلماندنم ئەم نموونانەن کە بە ڕێکەوت لە خەرمانی تابلۆکانی نالیم هەڵگرتنەوە:

-١-

دەس بەندییانە دێن و دەچن سەرو و نارەوەن
خاوەن کولاهـ و سایە وو بەرگن وەکو ملوک
کانی دەزێن بە تاو و درەخت ئاوسن بە با
شادیی بەهارە بولبولە داماد و غونچە بووک
وەک چاوی وشکە صوفییەکانی لە دار و بەرد
دەردێن بە صەد «ترنم» و گریان و نووکە نووک
رایێڵی تار و پۆدی کڵۆی بەفرە ئابشار،
با بای دەدات و ماسی پیا دێ وەکو مەکووک
شەبنم کە «نظم و نثرە» لە ئەوراقی غونچەدا
گۆیا بوە بە زار و زمان و ددان و پووک

-٢-

هێند مونتەزیری تۆ بوو هەتا چاوی سپی بوو
نەرگس کە لەسەر یەک قەدەم و دیدە چەقی بوو

-٣-

سروشکم ئاو و دانەی نارەکی دێ
بە گەرمی داوەری بەم تەرزە تەرزە

-٤-

گەهـ تاوس و گەهـ کەبکن و گەهـ بووقەلەموونن
گەهـ ئاتەش و گەهـ شوعلە و گەهـ دوودی سیاهن
لالەن بە بەدەن ئەتلەسی ئەخزەر کە لەبەر کەن
نەورەستە گوڵی بەستە لەگەڵ دەستە گیاهن

-٥-

مەستی خەیاڵی ئەوە لەحزە ژمێری شەوە
دوشمنی خوونی خەوە دیدەیی بیداری من
دیدە نیگەهبانی یار تیپی سروشکم هەزار
ناڵەیی دڵ نەیسەوار ئاهـ عەلەمداری من

-٦-

تا سەری زولفی لەسەر ڕوو حەلقە دا
من وەکو ماری سەر ئاور خەم دەخۆم

-٧-

سەراپا گوارە زەردی ترس و لەرزە
دەڵێی عاسێ بوە لەو جێگە بەرزە

-٨-

بۆ تۆ کە بیکر و تازە وەکوو حووری جەننەتی
قەیدی چیە عەجووزەیی دونیا بدەم تەلاق

-٩-

ئەژدەهای زوڵفت لە دەوری گەنجی حوسنەت حارسە
حەلقە حەلقە چین بە چین سەر تا بە خواری گرتوە
خۆش لەسەر سینەت سەری هەڵداوە دوو گۆی سەربەمۆر
مات و حەیرانم کە چۆن عەرعەر هەناری گرتوە

-١٠-

عاشقی صنعی حەقم قوربانی دەستی قودرەتم
چاوی ماویی خاڵی شین کوڵمی سپی زوڵفی سیا

-١١-

دەسرۆکەیی هەوری چ حیجابێکە کە تێیدا
شمس فلک الحسن انارت فتوارت

-١٢-

پەچەیی پەرچەمیی و پرچی سیا
هەر دەڵێی مانگەشەوە کوڵمی تیا
لادە دەسرۆکەیی هەوریی لە جەبین
دەرکەوێ شمس و قمر نور و ضیا(٤)
فەرشی کەففی بەری پێتە نەرگس
سەری داخستوە وەک چاوی حەیا

-١٣-

نالی ئاسوودە نیە توولە نەمامی عومرت

بە نەفەس دێت و دەچی ئەسلی لەسەر بایێکە

-١٤-

تا نەگریا ئاسمان و تەم وڵاتی دانەگرت

گوڵ چەمەن ئارا نەبوو هەم لێوی غونچە وا نەبوو

-١٥-

تەنی حاجی لەسەر چارچێوەیی ناجی دەڵێی نەعشە

لوعابی خۆر لەسەر ئیحرامی وەک کافووری ئەکفانە

تابلۆکانی نالی بەبەریانەوە هەیە، لەبەر زۆری، نیمچە دیوانێک پێک بێنن.

لەم نموونانەدا نالی شاعیرێکی عادەتی نیە، لەگەڵ شاعیریدا وێنەگریشە. هەر جارە لە خوێندنەوەی بەیتی وێنەگرانەی نالیدا عینوانە ژیرە خۆشکەڵەکەی دیوانی «الرسم بلكلمات»ی نزار قەبانیم بە بیر دەکەوێتەوە. بێگومان ئەم دەسەڵاتەی وێنەگرتنی «شت» سروشت بێ یا مرۆڤ، تجرید بێ یا مادە، بەڵگەی تێکەڵبوون و تفاعلە لەگەڵ دەوروبەردا، لەم مەیدانەشدا نالی لە ریزی پێشەوایەتی و ڕابەریی دێت. ئەم ئامادەییەشی بۆ «تێکەڵ بوون و تفاعل» پاڵپشتێکی گەورەیە بۆ ئیمکانی گەیشتنی بە پلەی تکامل چونکە لە هەموو پەروازێکی بەرەو ئاسمانی واتا و جوانیدا شریتەی بەسترانەوەی بە «واقیع» درێژ دەبێتەوە و ژوورخان و ژێرخان بەشدار دەکا لە سازدانی تابلۆی هونەر. پێی ناوێ من بڵێم، پچڕانەوەی مرۆڤ لە زەوی و نیشیمەن و دەوروبەر پتر لە نیوەی جیهانی مرۆڤایەتی لەناودەبا بەو پێیەش بەرهەم دادەشکێ و دادەلەنگێ. تۆ سەیری نالی لە وەصفی بەهاردا چەند واقیعیانە ژیانەوەی ڕووەک بە ژیانەوەی ڕۆژی مەحشەر تەشبیه دەکا:

دایەی زەمین کە حامیلی ئەبنایی مەحشەرە

هەر تۆیەکی تیا کە ئەمانەت بۆ دایەوە

لەم تابلۆیەدا لایەنی ژیانی ئێستا کە پشکی پتر وەرگرتوە لە قیامەت، بەڵام قیامەت تێیدا بۆتە فەرمانبەرێکی بێ دریغ لەو ڕووەوە کە ژیانەوەی سەرلەبەری تۆ و گیا و گوڵی زەمینی ڕاگەیاندوە چونکە لە مەعشەردا هەمو گیانلەبەرێک دەژیێتەوە.

ئەم دەسەڵاتەی نالی لەم هونەری تابلۆ کێشان و لە هەموو هونەرەکانی تر کە بە درێژایی ئەم نووسینە لە بەشی یەکەم و دوەمیدا باسکراون، ئا ئەم دەسەڵاتە هەر خۆیەتی جارێکی تریش لە سەر نەرم کردنی وشەی سەخت بۆ ناو چارچێوی هەڵبەست بەوپەڕی هێز و تەواوییەوە دەردەکەوێت. ئەم ڕاگەیشتنەی نالی بەسەر هەموو لایەنێک حەق و حسێبێکی شیعردا، ئەویش بۆ خۆی یەکێکە لە تایبەتەکانی هونەری نالی

کەوا بە دەگمەن نەبێ پەیدا نابێ بۆ مرۆڤ. گەلێک لە شاعیری گەورە و لێهاتوو هەن کە بەرزییان لە یەک دوو مەیدانی هەڵبەستدا دەردەکەوێت، لە چەند مەیدانێکی تریدا وون دەبێت. بێگومان هۆی ڕاستەقینەی ئەم دیاردەیە نوقسانی یەکێک لە دوو سەرچاوە بنجییەکانی هەڵبەستە. زات و بابەت، ئەگەر نوقسانییەکە لە هەردووکیاندا نەبێ. دیارە لێرەشدا مەبەس لە زات و بابەت دوو لایەنەکەی بەهرە و پێگەیشتنە.

لێرەدا مەودای گوتار بە پایان دەگات و خامەم بە دیار داهاتنی کاتی ژمارەیێکی تری گۆڤاری کۆڕ دەمی خۆی دەبەستێ، وەک شەهرەزاد، داستانەکانی ناوەڕۆک و سەر نەرمکردنی وشەی سەخت و باسی تریش کە هەبێ هەڵدەگرێ بۆ ئەو بەشی کە لە هەزارویەک پەڕەی گۆڤارەکە بەرخۆی دەکەوێت.

## بەشی سێیەم

لە بەشەکانی ڕابردووی ئەم نووسینەدا، بە پێی دەرفەتی بەرتەسکی گوتار، جارجارە یەکێک لە تایبەتیە بەرچاوەکانی شیعری نالی باس کراوە و ناوناوەش نموونەی خراوەتە بەرچاو. ئەوەی ڕاستی بێ نموونەکان، لە زۆر جاردا، پێویستییان بە شیکردنەوە و واتا لێدانەوە هەبوو بەڵام ترسی درێژەکێشان مەودای لە نووسینەکە کورت کردۆتەوە و واتای شیعرەکانی پێ بەجێ هێشتوە. بۆرە عوزرێکی تری وازهێنان لە واتای ئەو شیعرانە لەوەشدا بوە کە مەبەس لە نموونەکان واتاکەیان نەبووە بەڵکو لایەنێکی تری هونەر بوە وەک ئارایشتی وشەی نەرم و شل لەناو هەڵبەستدا وەیا وێنەگریی بە شیعر وەیا هەر لایەنێکی تر بێ غەیری واتا. لێرەدا ڕێم هەیە جارێکی تریش بۆ کەم و کورتی نووسینەکەم بپارێمەوە بەوەدا کە من لە سەرەتاوە چ بەڵێنێک، وەیا نیوە بەڵێنێکیشم نەداوە تۆژینەوەی تەواو لە شیعری نالی بکەم. سەرەباسەکە خۆی «چەپکێک...» ئەم عوزرەی هێناوەتەوە و دانی بەم کەم و کورتییەدا هێناوە. باوەڕم هەیە بۆ تاکە نووسەرێک لە زنجیرە گوتارێکدا هەر ئەوەندە مومکین دەبێ چەند دەلاقە و کەلێن بخاتە شوورە مەحکەمە پتەوە سەختەکەی دەوری قەڵای گەنجینەی شیعری نالییەوە تا چاوێک بخشێنێ بە چەند کۆمەڵە گەوهەرێکیدا، ئەگەر دەستیشی لە درزێکەوە گەیشتێ بە دزیلکانە یەک دوو گەوهەری لێ گلداتەوە هەرچەند نالی خۆی ئەم تەرزە دزەی لە پێشەوە بەم بەیتە جوانە شکاندۆتەوە، کە ئەویش گەوهەرێکی خەزنەکەیە:

ئەو گەوهەری نوکتەی کە لە نالی دەدزن خەڵق<br>
ئاوی نیە وەک ئاگری بێ شەوقی دزانە!

چاکە ئێمە ئەفسوونی خۆپاراستنمان لەم توانجەی نالی لە خۆمان خوێندوە بەوەدا کە شاعیر نین تاکو دزانە نوکتەکانی نالی لە هەڵبەستماندا بە کزی هەڵایسێنین.

بۆ ئەو کەسەی حەز لە «جوانی ئاخاوتن» دەکا ئەوەندە بەسە هەڵبەستەکانی نالی بەڕاستی و دروستی بخوێنێتەوە با لە هەموو واتاکانیشی نەگات. ئەگەر بوێرم دەڵێم وا هەیە بەیتی نالی ئەوەندە زل و زرینگەدارە چ پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە تێی بگەیت یا تێی نەگەیت. ئەو تەرزە بەیتە زێدە مەحکەم و بەهێزانە، چ هی نالی بێ چ هی شاعیرێکی تر لە کورد و غەیری کورد، بە شێوازی کۆن و نوێ لەو سامانە ئەدەبیانەن کە بە ڕۆشنبیرێکی زێدە بەرز و زیرەکێکی یەکجار هێژای نەبێ سوودی لێ وەرناگیرێ. با لێرەدا تەعبیرێکی پەرەسەندوو بەکاربێنم و بڵێم بابەتی ئەدەبی وەها هەیە هەر بە پوختەی پوختەکراو «خلاصە الخلاصە»ی ڕۆشنبیران دەکرێ تێی بگەن و زەوق لە واتا و داڕشتن و تێکهەڵکێشان و وشە سەرکەشەکانی وەرگرن، بە کوردی دەبێ بڵێم بەرەیێکی تەسکی ڕۆشنبیری ئەریستۆکرات لە ئەدەبدا دەگمەن بە پایەی لێ حاڵیبوون و هەزم کردنی بەرهەمی هەرە بەرز و بە نرخ و هێزوپێز.

دەزانم گەلێک لە خوێنەران چاویان هەڵدەبەزێتەوە لە وشەی «ئەریستۆکرات» کە تازە کردم بە وەسفی بەرەیێکی تەسکی ڕۆشنبیران چونکە گوێ و مێشک و دڵ و هەست و نەستی جیلی ئەمڕۆی خوێنەران پڕ بوە و هەلاخناوە لە واتای دزێویی وشەی «ئەریستۆکرات» لەو ڕووەوە کە ڕاگەیاندنی دەسەڵاتی ناڕەوای تێدایە، لە نوقتەی بەرانبەری دەسەڵاتیشدا بێ دەسەڵاتی نائەریستۆکراتەکان ڕادەگەیەنێ. ئەمە دەزانم لەگەڵ ئەمەشدا پەشیمان نیم لە بەکارهێنانی وشەکە چونکە تاکە مەیدانی ئەدەب و زانست و هونەرە، وەیاخود با بڵێین مەیدانی بەرهەمی «عقلي» ئادەمیزادە کە لەوێدا کەس قەمچی هەڕەشە لە کەسی تر هەڵناسووڕێنێ. ئەریستۆکراسی لە مەیدانی دەسەڵاتی مادییدا دژی مرۆڤایەتییە و دەبێ بەرهەڵستی بکرێ و لەناو ببرێ، لەمەشدا چ فەرقێکی دوێنێ و ئەمڕۆ و چەپ و ڕاست وئابووری و زانیاریی نیە و هەموو جۆرە ئەریستۆکراسیێک وەک یەک بەدە. من و تۆ کە بێ دەسەڵات کراین و قەمچیمان بەسەرەوە ڕاگیرا چ دڵ دانەوەیێکی خۆمان لەوەدا نابینین دەستی قەمچی گرتوو هی سەرۆک نەقابەیە نەک هی دەرەبەگ وەیا شێخی تەریقەت، وەیاخود کابرای هەڕەشەکەر ناوی نیشتیمانپەروەری و چینپەروەریی بە خۆیەوە ناوە.

ئەریستۆکراسی یەکێکە لەو مەفهووم و ڕواڵەتە کۆمەڵایاتیانەی لە ئەنجامی گۆڕانی مێژوویی ناحەز بووە و سەردەمێک لەمەوبەر ڕێزی لێگیراوە، تەنانەت لەم ڕۆژگارەشدا ئەوەی بە زار لێی ناڕازییە بە دڵ هەر حەزی لێ دەکا و بە ئەنواعی فروفێڵ و تەڵەکەبازیی لەکاریشی دێنێ. ئەم ئەریستۆکراسییە لە میراتی کۆنینەی ڕێز و خۆشەویستی کە هەیبوە پشکێکی بۆ ماوەتەوە تا بڵێی ڕەوا و بێ زیانە ئەویش، وەک گوتم، لە مەیدانی بەرهەمی «عقلي»دا بە زانست و ئەدەب و هونەریەوە. مانەوەی بۆ ئێستاکە دیاردەیێکی بەرچاوە کە دەمەتەقە هەڵناگرێ. لە هەرلایێکەوە سەیری بەرهەمی «عقلي» ئادەمیزاد دەکەیت هی وای تێدا دەبینیت «تاک» نەبێ تێی ناگات. لە ناو ئەو بەرهەمانەشدا، کە لە ڕووی زەحمەتی تێگەیشتنیانەوە بە ئەریستۆکرات دەژمێررێن، هی وا هەیە هەمیشەکات بەکار دێن و ڕۆژی چەندین جار دەکەونە بەر چاو و دەستی خەڵق. بە نموونە: فڕۆک، تەلەفزیۆن، وێنە و پەیکەری سورریالیست، پرسیارەکانی ریازیاتی بەرز، کۆمپیوتەر، باسەکانی فەلسەفە، مادی بێ یا ئایدیالیست، ئوتروحەی سەخت و ورد کە لە زانکۆکاندا دکتۆرای پێ وەردەگیرێ. پێی ناوێ زنجیرەی نموونەکان درێژکەمەوە نەکا لێی نەبمەوە.

دەبینی تا ئێستا «ئەریستۆکرات بوون» هەر لە باودایە، جێی ڕێزلێنانیشە ئەگەر سەر نەکێشێتە سەر

قەمچی کاریی. سەرەڕای ڕێز لێنان، هی وایان تێدایە ژیان بێ ئەوان بەڕێوە ناچێت وەک لە نموونەکانی سەرەوەدا دیتمان.

کەواتە، ئەریستۆکراسی ڕەوای سوودبەخش تا ئەم ڕۆژگارەمان دەژی و هۆی ژیانیشە. خۆم لە باسی ئەریستۆکراسیی بەد و ناڕەوا دەدزمەوە کە ئەویش لە ژێر ناونیشانی تازە داهاتوودا هەندێ ڕابردوە پاشکەوتوەکانی هەزاران ساڵ لەمەوبەر لە گەڕدایە، چونکی نە لە نووسینی وەهادا چارەسەر دەکرێت و نە بابەتێکیشە دەست بدا بۆ پاڵپشتی کردنی بیروباوەڕەکانم.

من دەمەوێ پشت ئەستوور بم بە «هەق و ڕاستی» لە نووسینمدا، نەک بیروباوەڕم بێهێز کەم لە ڕێی ڕاگرتنیەوە بەرانبەر کاری ناڕەوا. من داوای بەردەوام بوونی شتێک ناکەم ئەنجامی بەدی لێ ڕوو بدات ئیتر ناچار بم بۆی بپاڕێمەوە وەیا لە ڕەخنانی ڕزگار کەم بە هەنجەتی ئەوەی شتی زۆر بەد و ناڕەوا بەردەوام و ڕێز لێگیراوان.

بەڵێ بێگومان ئێستاکەی ئادەمیزاد گەلێک جۆری خراپ و چاکی «ئەریستۆکراسی» تێدایە، تەنانەت جۆرە خراپەکانی بەهۆی چاوسوورکردنەوە و قەمچی هەڵسووڕاندنەوە ڕێی ڕەخنانیش لە خەڵقی دەبڕنەوە، بە زۆری پەرستنی خۆشیان بەسەر خەڵقیدا دەسەپێنن. نەک ئەمە و بەس، بەرەیێکی بەرفراوانی خاوەن قەڵەم و هونەریش واز لە خاوەن قەمچی دێنن و بەردەبنە گیانی قەمچی لێدراو، بە دوا ئەمەدا خەریکی تاوانبارکردنی جۆرە پەسەند و ڕەواکانی «ئەریستۆکراسی» دەبن بە چەندین تاوانی وەک «فکری کۆنەپەرست، پاشماوەی دەرەبەگ، خزمەتکاری ئیمپریالیزم، بەندەی ئەفسانە، خۆ لە میللەت بەرەژوور گرتوو...» هانی خاوەن قەمچیش دەدەن لە ناوی ببات.

ئەم ڕاستییانە هێندەی هەبوونی خۆمان بەرهەست و بەردەستیشن، لەگەڵ ئەمەشدا داوا دەکەم، بەڵکو ئاواتەخوازم، هەر لە ئێستاوە تا ئەو کاتە بێبڕانەوەی کە ئادەمیزاد تێدا دەژیت و بەرەوپێش دەچێت دیاردەی «فکری ئەریستۆکرات» هەر بمێنێ و ڕێزی لێ بگیرێ و گەشەی پێ بدرێ چونکە کە هات و مرۆڤ لە ژان و ژواری ڕۆشنبیری و زانستدا هەر ئەو بەرهەمانەی بەوەلەد هێنا کە زەین و هۆشی عادەتی تێی دەگەن بەرهەمە هەرە بەرز و بایەخدارەکەی لێ حەرام دەبێ. زیانی لێ حەرام بوونی ئەو بەرهەمەشی لەوەندە ناوەستێ کە لە دەست چوونی بارستی بەرهەمەکە دیاری دەدات. بەولای ئەو زیانە مەحدودەوە، کە شتێکی زۆرە و کەم نیە، هەنگاوی بەرەوپێش چوونی ئادەمیزادیش کورت دەبێتەوە... سەرەوژوور چوونی کەم دەکاتەوە... دووربینی و وردخوێندنەوەی پەکی دەکەوێ...ئومێدی گەورەی بچووک دەبنەوە... تێکڕای دەسەڵاتی مرۆڤانەی دادەلەنگێ.

ئەمەش چونەتی ڕاستییەکەیە: سرینەوەی ئەو هێندە زێدە زیرەکی و بلیمەتییەی کە بەرهەمی «فکری ئەرستۆکرات» پەکی لەسەر دەکەوێ ڕاستەوخۆ وەک پەڕاندنی تیژایی سەرەڕم وایە کە برشتی پێ ناهێڵێ و دەیکا بە خزمی داروەکاز. بە وردبوونەوەش بۆت دەردەکەوێ زۆر بوون و کەڵەکە کردنی گیروگرفتی ژیان و گوزەران ڕۆژ بە ڕۆژ پێویستی پتر دەکا بە بوونی بلیمەتیی و زیرەکی و زانستی لە ئەندازە بەدەر چونکە بلیمەتی دوێنێ و ئەمڕۆ هەر بایی چارەسەرکردنی گیروگرفتی دوێنێ و ئەمڕۆی بە بەرەوەیە، تەنانەت کێشە و تەگەرەکانی ئەمڕۆ بە ئەمرازی دوێنێ چارەسەر ناکرێ. دەزانین مرۆڤی پسپۆری ڕیازیات زاڵ دەبوو بەسەر حیساباتی دوێنێدا، بەڵام لە عاست پرسیارە زۆر تێکەڵپێکەڵ و درێژکێشی گیروگرفتەکانی ئەمڕۆدا دەستە پاچە و دۆش داماو دەوەستێ ئیتر کۆمپیوتەر هات و باری

ڕاست کردەوە. ئاسمان گەردەکان بە بێ ڕایەڵەکانی ئەلیکترۆنی ناتوانن کەشتییە ئاسمانییەکان لێ خوڕن... دیتت نەوت شوێنی خەڵووزی گرتەوە و کارەبا لە کاری ناسکدا نەوتی دەرکرد و هێزی ئاتۆم لە مەیدانی خۆیدا کارەبای زۆر کرد... فێرگەکانی ڕەمزی و سۆریالیست دریان بە شێوازی کلاسیک دا لە هونەر... شیعری وەها جێی بە شیعری ستوونی لەق کرد... فەنی برینکاریی (جراحە) و دۆزینەوەی نەساغی و دەرمانسازیی نوێ هەموو زانستی لەشسازیی کۆنی کرد بە ئەفسانە... دەبێ ئەوەشمان لە بیر بێ هەر یەکێک لەو شتانەی کە بزووتنەوەی بەرەوپێشەوەچوونی دەیان کا بە میراتی مێژوو لە کاتی خۆیاندا بەرهەمی «ئەریستۆکرات» بوون لە مەیدانی تایبەتی خۆیاندا.

هەر یەکێک لەو قۆناغانەی کە مرۆڤ بەجێی هێشتوونەوە، با بڵێم تێیدا بە پێش خۆی کەوتۆتەوە، ئەویش لە کاتی خۆیدا ئەوەندە پێشکەوتوو نەدەبوو ئەگەر ڕێی بەرهەمی «ئەریستۆکرات» لە پێش هەنگاوی مرۆڤدا کوێر کرابایەوە. تۆ بڵێی ئەگەر لە سەرەتاکانی ئەم چەرخەدا هەوڵدەرانی دروست کردنی فرۆک وازیان لە تەقەلا هێنابا لەبەر گاڵتەپێکردنیان لە لایەن زانا کلاسیکیەکانی ئەو کاتەوە دەبوو ئێستا لە کام پلەی ژیار و زانستدا باین! چونکە ئەگەر فڕین نەبا مەیدانێکی بێ سەروبنی زانست و تەکنیکی ئەم ڕۆژگارەش لە خۆوە بە ڕووی مرۆڤدا دادەخرا.

پاش ٥٠ ساڵی تر دانیشتووی ئەم زەوییە ئەوەندە زۆر دەبن زانست و تەکنیکی ئەم کۆتاییەی چەرخی بیستەمە لە برسانیان دەکوژێ. خۆ دەزانین مرۆڤی ئەمرۆش هەر بە هۆی هەوڵ و بەرهەمی «ئەریستۆکرات» توانای ژیان و مانەوەیان هەیە. بێنە لە کشتوکاڵدا گاڕەشەکەی بیتوێن و شارەزوور بەکار بێنە و هۆش و فامی مام بارام و مام باییزیش بکە ڕابەر و سەیری ئەنجام بکە.

تۆ لەم گوتەیەمدا پێم مەڵێوە مام باییز و مام بارامی هەژار چ گوناهیان نیە لە دواکەوتن و نەخوێندەوارییان و ئەوانیش ئەگەر بۆیان ڕێک کەوتبا لەوانە بوون بگەن بەو پەڕی زانین و هونەر، بەڵێ ئەمەشم پێ مەڵێ چونکە من گلەییم لە مام بارام و مام باییز نەکردوە، عەیبیشم لێ نەگرتوون، لە زیمندا بۆشیان پاراموە. من هەر ئەوەندەم گوتوە و دەڵێمەوە گیروگرفت و کێشە و بەرەی ژیان و ژیار بە هۆش و گۆشی مام بارام و مام باییز چارەسەر ناکرێ، تەنانەت بەرزترین زیرەکی و بلیمەتی چەرخێک ناتوانێ بە کەرستەی ئەو چەرخە تەنگ و چەڵەمەی کۆمەڵایەتی چەرخێکی تری دوای خۆی چارەسەر بکات. مام بارام و مام باییزیش هەرگیز نابنە بەرهەمهێنی هۆی ڕەواندنەوەی گیروگرفتی ژیان ئەگەر نەگەن بە پلەی فکری ئەریستۆکرات، واتە کە بە وردی سەیری هەڵکەوت بکەیت دەبینی لێ قەوماویی و دوکەوتوویی مام بارام و باییز بە جۆرێکی بەرچاو لەسەر فکری ئەریستۆکرات دەکەنەوە نەک تاوانباری دەکەن، نووسەرێکیش کە دێت و بە ڕواڵەت قێزی خۆی هەڵدەستێنێ لەو بەرهەمانەی زۆربەی خەڵق تێیان ناگات و عینوانی «ئەریستۆکرات»یان لێ دەکا بە عەیب، مەبەستی لەوەدا سەوداکردنە بە گوتەی لەبەر گوێیان خۆش کە بازاڕی ئەو لە نێوان گەلانی خەڵقدا گەرم دەکات و دوکانە سیاسیەکەی بە هەرمێن دێنێت، لەهەمان کاتیشدا کام بەرهەمی ئەریستۆکراتانەیە بە کاری دێنێت و تامەزرۆیی خۆی پێ دەشکێنێت. لە بیرمانە لە سەرەتاکانی شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ کابرایێک لە میکرۆفۆندا هاواری دەکرد «لا قصور، لا ثلاجات» کەچی دواتر کە دەسەڵاتی چنگ کەوت و دنیای بۆ تەخت بوو...

فکری بەرز لە هەر چەرخێکدا چرای هەرە بە شەوقی ئەو چەرخەیە. ئەم فکرەش هەموو مەیدانێکی ژین و بوونی ئادەمیزادی گرتۆتەوە، واتە وەنیە هەر لە ڕیازیات و فەلسەفە و پیشەسازی و دکتۆریی و

ئاتۆم و ئاسمانگەردی و شتی ئەوتۆ زەحمەتدا فکری بەرز هەبێ و بسەلمێندرێ بەڵکو ئەدەب و هونەریش شان بە شانی زانست و تەکنیک و «صناعة» لە ئاسانەوە دەست پێ دەکات، کە بابەتی هەرزەکارانە لە رۆشنبیرییدا، و تێهەڵدەکشێ لە رێکار و شێواز و واتا و ناوەرۆکدا تا پلەی ناوەندی و بەرەژوورتریش تێدەپەڕێنێ و دەگاتە ئاسۆ بەرزەکانی فکری ئەریستۆکرات. دەتوانم بڵێم فەرقی نێوانی فرۆک و پاسکیل چەندە، کە هەردوویان هۆی گواستنەوە و گەڕانن، فەرقی نێوان ئەدەبی هەرزەکاران و ئەدەبی بەرز ئەویش هێندە دەبێ، چ فەرقێکیش نیە لە نێوان نەهێڵانی ئەدەبی بەرز و نەهێڵانی هۆی گواستنەوەی بەرز (کە فرۆک و شتی وەک ئەوە) چونکە هەردووکیان لەیەک سەرچاوەوە هەڵدەقوڵن کە پێشکەوتووترین فکری ئادەمیزادە.

لەبەر رۆشنای ئەم لێکدانەوەیە ئەدەبی نالی ڕاستەوخۆ دەچێتە ریزی ئەو بەرهەمانە کە زادەی فکری ئەریستۆکراتن، لە وێشدا بە پێی دارشتنی مەحکەم و نوکتە ئاوایی و رەنگینی و وردپێویی و قووڵی خۆیەوە دڕ بە ریزەکانی دواوەی فکری ئەریستۆکرات دەدا تا دەگاتە لای بەرایی. نەک هەرئەمەندە و بەس، بگرە شیعرەکانی نالی خۆی پێشبڕکێ لە یەکتری دەکەن و یەکیان ئەوی تر دەخاتە دوا خۆیەوە لە مەیدانی ئەریستۆکراسیدا. بە نموونە بێین و ئەم دوو بەیتەی خوارەوە بە یەکتر بگرین فەرقی تێ هەڵکشێنیان بەرەو بەرزایی فکرەوە بە ئاشکرا خۆ دەنوێنێ:

نموونەی یەکەم:

لەبت میم و قەدت ئەلف و زوڵف چیم
دەزانی بەم سییانە طالبی چیم؟

نموونەی دوەم:

ڕەوشەنی دیدە بە ئینسانە کە موژدەی قەدەمت
ڕەوشەنی دیدەیی غەم دیدەیی «بیت الحزن»ە

نالی لە نموونەی یەکەمدا لە ڕاستە شەقامێکی واتا تەقلیدیەکانی نێوان شاعیرانی رۆژهەلاتدا رۆییوە بەرەو نوکتە و «تشبیه و جناس و توریه»وە. لێرەدا بنگەی هەڵبەست و خەیاڵ و عیشقی هەڵستاندوە لەسەر چەند تەشبیهاتێکی سەلمێنراوی نێوان شاعیران بەوەدا کە لێو تەشبیه کراوە بە سەری پیتی «م» باڵاش بە ڕاستایی «ا» و لوولی زوڵفانیش بە نیوە ئاڵقەی پیتی «چ» کە لە ریزبوونیاندا وشەی ماچ پەیدا دەبێ. بەڵام بۆ ئەوەی چ غەدران لە نالی نەکەین دەبێ ئەوەندەش بڵێم لەم بەیتەدا نالی هەندێک واتای جوانی بۆ گل داوینەتەوە یاخود بە قەرز بۆی هەڵگرتووین کە لە بەیتی سێیەم پێمانی دەداتەوە:

کە هاتی تیغی «بێ زاریی»ت لەسەر دام
سەری خۆم خود بە خود هەڵگرت و ڕۆییم

واتا قەرزەکە لەوەدایە کە وشەی «بێ زاریی– بێزاریی» هەم «نەبوونی دەم» و هەم «وەڕس بوون» ڕادەگەیەنێ. هەر دوو واتا بایی ئەوە دەکەن نالی ئومێدی بە «ماچ» نەمێنێ، بەڵام کە وشەی «بێ زاریی» بە واتای «نەبوونی زار» بێ لە بنەڕەتدا «ماچ»ەکە لەناو دەبا چونکە پیتی «م» لەناودا نامێنێ. ئەم صورەتەی «نەبوونی زار»یش یەکێکە لەو موبالەغە ڕەوایانەی کە شاعیرانی لەمەوبەر مەهارەتی خۆیانیان تێدا تاقی کردۆتەوە، نالی بۆ خۆی چەند جاران ئەم وێنەیەی «نەبوونی زار»ی کێشاوە، مەبەستیش لە نەبوونەکە زێدە گچکەیی و تەنگی زارەکەیە:

گوتم ئایا بە زاری خۆت دەپرسی حاڵی زاری من؟
برۆی هێنایە یەک وەک شکڵی «لا» یەعنی کە «بێ زارم»

نموونەی تریش هەن وەک ئەمانە کە پێویست نیە لێرەدا درێژە بە گوتار بدەین لە ڕێی هێنانەوەی هەموویان.

یەکێک لەو شاعیرە مەشوورانەی ئەم واتایەیان هێناوەتە ناو هەڵبەست حاجی قادرە، کە ئەمەش نموونەی مەهارەتەکەیەتی لە فەندی تێبردنی «زار» بە نیازی مەدحی خۆشەویست:

نقاشی «دم»ی نوقتەکی دانا بە نیشانی
زانی کە «ذم»ی کردوە «بێزار»ە لە مانی

واتە وێنەگری «دم – دەم»ی مەدحکراوەکە لە جێگەی «دم – دەم» نوقتەیێکی دانا چونکە هێند بچووکە لەوە پتر هەڵناگرێ کە بە شتێک تەشبیە بکرێ لە نوقتە گەورەتر بێ، دەشزانین نوقتە هەر بە گوتە و لە کاری عەقڵیدا وجودی هەیە ئەگینا لە واقیعدا وجودی نیە. لەگەڵ ئەمەشدا کە شتێک نەبوو لە نوقتە بچووکتر بۆ وێنەی دەمەکەی، ئەو هەر پێی ڕازی نەبوو و بە زەمی حیساب کرد و «بێزار» بوو لە مانی.
کە ورد بیتەوە لە وشەی «دم» وەیا «دەم – بە ڕێنووسی ئێستا» دەبینی هاتنی نوقتە بە نیشانە بۆی هەڵدەگرێ وشەی «دم – دەم» بکا بە «ذم –ذەم» چونکە پیتی «د» لە «دەم»دا کە نوقتەی بە نیشان درا دەبێتە «ذ» دەمەکەش دەبێتە «ذەم». لەمەوە هەر بە جارێ مەدحکراوەکە مافی ئەوەی دەبێ لە مانی نوقتەکە «بێزار» بێ. وشەی «بێزار» واتای نەبوونی زاریش دەدا «بێ زار».
وشەی «مانی» لە کۆتایی بەیتەکە ئەویش ئیشارەیێکی تێدایە بۆ فەندی وێنەگری لەو ڕووەوە کە «مانی» ناوی وێنەگرێکی یەکجار بەناوبانگی ڕۆژهەڵاتی کۆن بووە. لە هەندێک ئەدیب و شیعر دۆستم بیستووە گۆیا یەکێک لە واتاکانی وشەی «ذم» بە عەرەبی «مدح» دەگەیەنێت، ئەوسا بەیتەکە بۆ ئەم لایەنەش دەچوو کە وێنەگرەکە بە دانانی نوقتە لە جێگەی دەمی یاردا مەدحی کردوە و ئارایشتی داوە ئیتر یار لە مانی وێنەگری بەناوبانگی کۆن بێزارە و لێی بێنیازە. بەڵام من ئەوەندەی سەیری فەرهەنگی عەرەبیم کردبێ نەمدیوە «ذم» بە واتای «مدح» هاتبێ، واتە «ذم» لەو وشانە نیە پێیان دەڵێن «اضداد» و دوو واتای پێچەوانە دەبەخشن.

بێجگە لە حاجی و نالی شاعیری تریش هەن، کورد و غەیری کورد، ئەم واتایەی چووکردنەوەی زاری مەحبووبەیان کردوە بە ماکی بەیت و دوو بەیت لە هەڵبەستدا، بەڵام پێویست نابینم نموونەیان لێ بێنمەوە و پەکی زنجیرەی بابەتی نووسینەکەم بخەم، ئەم بەیتەی حاجی قادریشم لێرەدا وەک پاڵپشت خستە بەرچاو کە لە سەر بەیتەکەی نالی بکاتەوە ئەگەر هات و خوێنەرێکی تازە پێگەیشتووی مێشک بە زانستی نوێ زاخاودراو لە گۆشەی نیگای شێوازی نەوباوەوە عەیبی لێ بگرێ و ئەو هونەری تێیدایە بە شتێکی بێ بایەخی دابنێ. کە ئەم کارە لە نالی بە عەیب بگیرێت دەبێ لە هەموو ئەدەبی کۆنی ڕۆژهەڵاتی موسڵمان بکرێ بە عەیب.

با بێینە سەر خوانی بەیتەکەی تری نالی بزانین چ خۆراکێکی مەعنەوی لەویان وەردەگرین و چۆن لە سەرەژوور چوونی بەرەو پۆپی فکر و تەعبیری ئەریستۆکرات بەیتەکەی یەکەمی جێهێشتووە!

رەوشەنی دیدە بە ئینسانە کە موژدەی قەدەمت
رەوشەنی دیدەیی غەم دیدەیی «بیت الحزن»ە

چاو بە «انسان» ڕوون دەبێتەوە. بە دیتنی «انسان»ی خۆشەویست ڕەوشەنی بۆ دیدە پەیدا دەبێت. یاخود ڕووناکی چاو بە «انسان»ە، لە عەرەبیدا «انسان العین» بە بیبیلەی چاو دەڵێن، کەواتە ئەو ئینسانەی لەم بەیتەدا دەبێتە هۆی ڕوون بوونەوەی چاو وەک «انسان العین» وایە کە هۆی دیتنە و بێ ئەو مرۆڤ کوێر دەبێ.

ئەم ڕاستییەی ڕوون بوونەوەی چاو بە «انسان» با لێرە بێ تا بزانین ئینسانە خۆشەویستەکەی نالی لە مەیدانی چاو ڕوون کردنەوەدا چ دەکا:

نالی دوای بەیان کردنی تەئسیری «انسان» لە ڕوونکردنەوەی چاو، کە ئەمە بەیان کردنی ڕاستیێکی گشتییە، ڕوو لە خۆشەویستەکەی دەکات و پێی دەڵێ: تۆ نەک خۆت بەڵکو تەنها قەدەمت، واتە پێت، قەدەمیشت نا، هەر موژدەی ئەو قەدەمە بەسە بۆ ڕوونکردنەوەی چاو... بەڵام چ چاوێک! نالی ڕازی نیە «موژدەی قەدەمی خۆشەویستەکەی» هەر بەقەدەر ئەو ئینسانە تەئسیری ببێ کە چاوی عادەتی ڕوون دەکاتەوە... موژدەی قەدەمی ئەو «ڕەوشەنی دیدەیی غەمدیدەیی بیت الحزنە»، واتە ڕەوشەنی چاوە غەمدیدەکەی «بیت الحزنە» کە دڵە پڕ لە غەمەکەیەتی. موژدەی قەدەمی یاری نالی ڕووناکایی چاوی غەمدیدەیە، کام چاوی غەمدیدە؟ هی دڵ. کام دڵ؟ دڵی ناو خانەی خەم و خەفەتان!! «بیت الحزن» ئەو واتایەش ڕادەگەیەنێ کە «خانەی تازیەداران» بێ، بەو پێیە موژدەی قەدەمی یارەکەی بەسە بۆ ڕوونکردنەوەی دڵە خەفەتبارەکەی ئەهلی ئەوماڵەی تازیەی تێدایە. موژدەی قەدەمی یاری نالی دەبێتە «انسان العین»ی چاوی غەمدیدەی دڵی تازیەداران.

لە کوردییدا «قدم» بە واتای «هاتنەلا، سەرلێدان» دێت واتە مەرج نیە «قدم» هەر ئەو «پێ»یە بێ کە ئەندامێکی لەشە. بەمەدا واتای بەیتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە موژدەی بیستنی سەردانی یارەکەی بەسە بۆ ئەو چاوەی غەمدیدەی دڵی تازیەداران ڕوون دەکاتەوە.

ناسک کردنەوەی وێنە و واتا و تەعبیری ئەم بەیتە لەو ڕادەیەدایە کە مامڵەتی لەگەڵ ئاخاوتن و تێگەیشتن و هەستی عادەتیدا بە تەواوی پچڕاوە و پەلەفڕەی لە ناو دڵ و گیان و نەستە. بۆ گرتنی جوانی

بەیتەکە «منطق – ژیربێژیی» هیچی پێ ناکرێ، دەبێ هەست و هۆش و گۆش پەنجە مەوهوومەکانی «مطلق و تجرید»ی لێ بەکار خەن. دوو واتایی وشەکانی «انسان، قدم، بیت الحزن» لە پێش نیگای سرنجدا، وەک ڕەنگ گۆڕیی پەڕی تاووس، هەر جارە و هەر ساتە تریفە و ئاورینگێکی نوێ بە بەر دیدەی غەمدیدەی خەیاڵدا دێنێت.

لە خوێندنەوەی ئەم بەیتەدا هەموو جارێک بەیتێکی مەولەویم بە بیردا دێت کە ئەویش مەودایێکی بەرفرەوانی بڕیوە لە مەیدانی خۆ ناسک کردنەوەدا:

ڕوخسارێ وەختێ مەصقەڵ مەدا ویش<٥>

وە شنۆی پارێز خەیاڵ مەبی ڕیش

«ڕووی یار کاتێک بە «مەصقەڵ – دەرمانی ئارایشت» ڕێک دەخرێ ئەوەندە ناسک دەبێ بە شنۆی پارێزی خەیاڵ زامدار دەبێ، نەی گوت بە پارێزی خەیاڵیش زامدار دەبێ. ناسکیەکەی لەوەدایە بە شنۆی پارێزی خەیاڵ ناڕاحەتە.

بێگومان بەیتەکەی مەولەویی لە ڕووی تەنک هەڵبڕین و ناسک کردنەوەدا هێندە تێهەڵکشیوە پەکی سەرەژوورتر ڕۆیشتنی خۆی خستوە، بەڵام دیسانەوە بێگومان بەیتەکەی نالی لە چەند بارێکەوە پێش هی مەولەویی دەکەوێتەوە:

یەکەم: لە لایەن ئەوەوە کە نالی ڕێگەی یەکسەرە «مباشر»ی نەگرتوە بۆ سەپاندنی واتای مەبەست بەسەر دڵ و مێشک و زیهنی گوێگردا، هاتوە لە پەنا ڕاستییەکی بێ دەمەتەقەوە «ڕوون بوونی چاو بە انسان» پێ دزیلکەی شاعیرانەی بە خامەی خۆی کردوە بۆ مەڵبەندی خولیایی «دیدەیی غەم دیدەیی بیت الحزن» لە هەموو هەنگاوێکیشدا سێبەری ڕاستییەکە، وەک سایەبان، چەپارەی خامە و خولیای نالی دەدەن لەوە کە هیچ پریشکێکی ڕەخنە و ناڕەزایی خوێنەر و گوێگری بەربکەوێ. نالی لەسەرەتای بەیتەکەدا دەروازەیێکی وەها فەراحی بە ڕووی خەیاڵدا کردۆتەوە هەتا واتا و خولیا و ناسکی و وردیی پێدا تێپەڕێنێ هەر کەمە. لە بەیتەکەی مەولەویدا ئەم خۆ لادانە لە تەگەرەی تەعبیری یەکسەرە «مباشر» پەیدا نیە تاکو بتوانێ زەقایی واقیعی نامەئلوف تێببا – کە بریندار بوونی ڕووە بە شنۆی پارێزی خەیاڵ. دەبێ لێی بسەلمێنین ڕووی یارەکەی ئەو ناسکەیە کە هەڵبەست وێنەی کێشاوە هەموو بەڵگە و هۆی سەلماندنیشمان هەر قسەی شاعیر خۆیەتی، ئەوەندەشی بۆ داوێیینە سەر، کە جەزبە و گەرمایی عیشق بە عادەت پەلەفڕە بە عاشق دەکەن لەم پەلەفڕەیەشدا چاوەنۆڕیی گوتە و کردەی نامەئلوفی لێ دەکرێ و لێی دەسەلمێندرێ. هەڵبەت ئەو سەلماندنە کە بۆ مەولەویی دەکرێ بۆ نالی و غەیری نالیش دەبێ بکرێ، بەڵام نالی لەم بەیتەدا خۆی نەهاویشتۆتە بارێک شەفاعەتکاری بۆ پەیدا کەین لە عورف و عادەتی شاعیران وەیا لە جەزبە و ئاگری عیشق.

دوەم: نالی لە بەیتەکەییدا وردی و ناسکی و جوانی هەڵداوەتەوە سەر یەک تا ئەو ڕادەیە کە قەپێلکی هەڵبەست مشت بوە لێیان و کەلەڕێژیش دەکا هەموو جوانی و ناسکیەکەشی لە سەرچاوەی ناوەکی (داخلی) هەڵبەست هەڵقوڵاندوە کە خۆشەویستیی یارە و چ بەرتیلی نەداوە بە هۆی لاوەکی تا دەستی یارمەتی درێژ کا هانای بردۆتە بەر «مەصقەل» و ئارایشتی دەسکرد کە لە جوانی یار زیاد کەن. ئەمەش دیاردەیێکی ئاشکرایە لە بەیتەکەدا پێی ناوێ من درێژەی پێ بدەم.

سێیەم: ڕەخنەیێکی تایبەتی خۆم هەیە لە بەیتەکەی مەولەوی، ڕەنگە خوێنەرێکی تر بە ڕەخنەی دانەنێ، هەر جارە کە بە بەیتەکەی نالی دەگرم پتر خۆم لە ڕەخنەکەدا بە ڕاست دەزانم. حەزم بەوە دەکرد مەولەوی لە جیاتی «ڕیش – زامداریی» ئەنجامێکی تری زێدە جوانیەکەی هێنابا ناو هەڵبەست کە پێوەندیی ڕاستەوخۆی لەگەڵ عاطفە و سۆزی شاعیر و گوێگر هەبا نەک ئەو سۆز و عاطفەیە بە دوا «زامداریی»دا ببنە ئەنجامی دوەمی جوانیەکە، واتە ئەنجامی، بەو مەعنایە کە بریندار بوونەکە بەرهەمی یەکەم و کوتومتی جوانیەکەیە، پاشان لە ڕێی ئەوەوە سۆزی گوێگر هەڵدەستێتەوە وەک بەرهەمی دواکژ. بەیتەکەی نالی لەم مەیدانەدا دوو جاران بەسەر بەیتەکەی مەولەویدا زاڵ دەبێ.

جارێکیان لەوەدا کە هەڵڕژانی سۆزی شاعیر و گوێگر وەها ڕاستەوخۆ لە جەرگی هەڵبەستەوە هەڵدەقوڵێ هەر دەڵێی پێشبرکێیەتی لەگەڵ وشە و ڕستەی هەڵبەست. تۆ کە خوێندتەوە «ڕەوشەنی دیدە بە ئینسانە کە موژدەی قەدەمت» و چاوی جیهانبینی تۆقەسەری مرۆڤت دیت کرنوو دەبا بۆ قەدەمی هەرە پایینی یار، چ پێی ناوێ نیوەی دوەمی بەیتەکە بخوێنیتەوە بۆ مەبەسی سەر کردنی سۆزت، ڕەنگە بیر لەوە بکەیتەوە ئایا نالی چ بورکانێکی عاتیفەی بە دەستەوە ماوە بیکا بە ئەنجامی ئەم جەهەنەمە! ئاگری لەمە بەتینتر وەیا وەک ئەمە تیندار لە تەندووری چ هەناوێکدا پەیدا دەبێ لەنگەری سۆزی نیوە بەیتی یەکەم ڕاگرێ لە نیوە بەیتی دووەم ؟

جارێکی تریش بەیتەکەی نالی بەسەر ئەوەکەی مەولەوییدا زاڵ دەبێ لەوەدا کەوا نەک هەر لە سەرەتاوە سۆزی گوێگر دەجۆشێنێ، بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا کە بە زاهیر لە پێشەوە هەموو سۆزێکی خۆی هەڵڕشتووە بەهۆی بەرزکردنەوەی «موژدەی قەدەم» بەسەر «انسان العین»دا، دێت و لە مصرەعی دوەمدا جارێکی تریش ئیفلاس بە «انسان العین» دەکاتەوە کە چاوی عادەتی خوێن و گۆشتە بەوەدا ڕادەگرێ لە بەرانبەر «دیدەیی غەمدیدەیی بیت الحزن» ئەوجا سەر لە نوێ «انسان العین»ەکە ئیفلاس پێ دەکاتەوە لە تەک «موژدەی قەدەم»دا چونکە ئەو موژدەیە خۆی بۆتە ڕووناکایی«دیدەیی غەمدەیی بیت الحزن»، بەو پێیە کات لە کات سۆز و کڵپەی هەڵبەست پتر مەشقەڵ دەبەستێ. لە پشت ئەو وێنە و واتایانەوە تارمایی وێنەیێکی تری یەکجار خەیاڵی و خولیایی و تجریدی جلوە دەبەستێ بۆ سرنجی وردبین، خەریکم نەوێرم خۆمی لێدەم نەکا، وەک جیوە، بەر پەنجەی تەعبیرم نەکەوێ وەیاخود بۆم نەچێتە ناو پەراوێزی تعبیرێکی ڕەوان و مەفهوومەوە:

زانیمان لە مصرەعی یەکەمدا «انسان العین» هەیە. لە مصرەعی دوەمدا ئیمکان هەیە شتێک پەیدا بێت کە پارسەنگی ئەم «انسان العین»ە بێ. ڕستەی «ڕەوشەنی دیدەیی غەمدیدە» مومکینە واتای «ڕەوشەنی چاوی غەمدیدە» بدات. «چاوی غەمدیدە» دەشێ تەرکیبێکی ئیزافی بێت نەک وەصفی و ماناکەی «چاوی غەمدیدەیێک – ئینسانێکی غەمدیدە» بێ لە ئینسانەکانی «بیت الحزن»، کەواتە «دیدەیی غەمدیدە» چاوی ئینسانە لە بەرانبەر «انسان العین»دا دەبێتەوە «عین الانسان». لەوەوە بەیتەکە ئەم شێوەیە بە دەستەوە دەدات «ڕەوشەنی دیدە بە «انسان العین» ـە، موژدەی قەدەمی تۆ ڕەوشەنی «عین الانسان» ـە.

بەڕاستی بەیتەکەی نالی زۆر شتی تری بە بەرەوە هەیە، هێندە دەوڵەمەندە وەک ئەوەیە چەند ئاوێنەیێک بەرەو ڕووی یەکتر ڕاگریت بە جۆرێک هەریەکەیان وێنەی ئەوانی تر بداتەوە ئیتر سەیری هەر کامێکیان دەکەیت شریتەیێکی بێ برانەوەی ئاوێنانی تێدا دەبینێت. من لەم چەند دێڕەدا وێنەی گشتی

ئەم «ئاوێنە ڕێزان»ەم خستە پێش چاوان لەگەڵ خورد کردنەوەی دیمەنی تێکڕای چەند ئاوێنەیێک با خوێنەریش لەلای خۆیەوە چاو ببڕێتە ئەم ئاوێنە بەندانەی نالی و تابلۆی واتایان لێ وەرگرێ بایی توانای خۆی.

من هەرگیز مەبەسم ئەوە نیە ڕەخنەی ناحەزانە وەیا بێ ڕەحمانە لە شیعری مەولەوی بگرم، کە دەزانم مەولەویی شاعیرێکە لە ڕیزی هەرە پێشەوەی شوعەرای ڕۆژهەلات دێت، نەشم ویستوە بە خۆڕایی لە نرخی بەیتەکەی کەم کەمەوە بەڵکو، بە پێچەوانە، ڕەنگە زێدە نرخ و جوانی بەیتەکە وای کردبێ بخرێتە تای تەرازووی موقارەنە لەگەڵ بەیتەکەی نالیدا کە شاکارێکە لەوانەی تاک تاک نەبێ مانەندیان چنگ ناکەوێ. دیتت پێشتر بەیتەکەم بە بەیتێکی تری نالی خۆی گرت و کردمنە نموونەی پێشبڕکێ لە مەیدانی فکری ئەریستۆکراتدا.

لەم نمایشتەی بابەتی جۆر جۆری دارشتن و جوانی و وردیی هەڵبەست کە وەکو پێپلکە یەکیان ژووروو‌ی ئەویتر دەکەوێتەوە و پایەی بەرزتر بۆ خۆی دادەگرێت لە مەیدانی هونەری ئاخاوتن و فکری ئەریستۆکراتدا، دەگەین بەو قۆناغە باسی سەرنەرم کردنی وشە و تەعبیری سەختی تێدا بکرێ، نەرم کردنێک کە لە ناو نەرمانی شیعردا خۆی بە ڕەق و زەق نەنوێنێ. بێگومان ئەم هونەرەی مامڵەتی شاعیرانە لەگەڵ بابەتی سەختدا پلەیێکی نوێی تایبەتی بۆ خۆی هەڵدەنێ و بەرەو دەسەلات و توانای پێویست بۆ ئاخاوتن بە زمانی یەکجار پسپۆڕانە و پوختی دەربڕینی مەبەست لە قاڵبی ئەریستۆکراتدا، چونکە لەم جۆرە دارشتنەدا سەرەڕای دەسەلاتی ڕاشکان بەسەر فکری ورد و قوڵدا کە لە بەهرەی هونەری هێژایەوە پەیدا دەبێ دوو بەرز بوونەوەی تر پێویستە:

یەکەم: دەسەلات و بەهرەی هونەریی زگماک کە بوێژ دەگەیەنێ بە بانی بەرزی فکر و تەعبیری ئەریستۆکراتی عادەتی، دەبێ لە چەرخ بدرێت و مشتومال بکرێت تاکو نەرم و نۆڵیەکەی دەگاتە ئەو ڕادەیە کە لە کاتی تێئالان و شل بوونەوەی بە دەوری کەرەستەی ڕەق و زەقی تەعبیری سەرکەشدا هەست بە زبریی و لێکخشان و پێککەوتنەوە نەکرێ کە عەیبی بنچین لە هەڵبەستدا.

دوەم: بەهەری زگماکی مشتومال کراو کە لایەنی «هەڵکەوتوویی» بوێژ دەگرێتەوە بە تەنها نابێتە هەڵگری باری قورسی تەعبیری سەرکەش لە مەڵبەندی فکری ئەریستۆکراتدا: وێڕایی هەڵکەوتوویی و بە ڕادەی ئەویش، پێویست بە «پێگەیشتن –ڕۆشنبیریی» هەیە. هەر ئەم پێگەیشتنەیە، پتر لە بەهرەی سادە، زیهن بە چڕگەنی فکر و تەعبیری سەختدا دەگێڕێت، بەڵام دەرباز بوونی زیهن لەو چڕگەنە کاری بەهرە و هونەرە.

ئەم ڕاستییانە ڕاستییەکی تریان لێ هەڵدەستێ، هەروەک فەرمانی بوێژ لەم بابەتە هونەرەدا یەکجار گران و سەختە، خوێنەریش بە کەرستەی عادەتی تێگەیشتنی شیعر بڕ لە چڕگەنەکە ناکات. دەزانین زمانی شیعر کەم و زۆر زەحمەتترە لە ئاخاوتن، بەو پێیە تێگەیشتنی وەک تێگەیشتنی قسەی عادەتی نیە. لەمەوە دەزانین تێگەیشتنی فکری ئەریستۆکرات لە شیعردا جارێکی تریش سەختتر دەبێ لەچاو فکری سەراو.

پوختەی گوتە ئەمەیە تاکوو بەرهەمی فکری ئەرستۆکرات لە شیعردا تێ هەڵکشێ بەرەو بەرزایی، پێویستی بە خوێنەری زیرەکتر و پێگەیشتووتر دەبێ، یاخود بە تەعبیرێکی تر، خوێنەریش دەبێ لە فکردا ئەریستۆکرات بێ ئەگینا لە بەرهەمی فکری ئەریستۆکرات ناگا. هەر ئەم هۆیەی زەحمەتی تێگەیشتنی

بەرهەمی فکری ورد قووڵە کە بە «مجاز» پێی دەگوترێ «فکری بەرز» وەیا من لێرەدا ناوی ئەریستۆکراتی بۆ بەکار دێنم، دیاردەیێکی زۆر بەرچاو پێک دێنێت لە بازاڕی ئاڵ و گۆڕی ڕۆشنبیری، پێ بە پێی سەخت و زەحمەت بوونی ئەو فکرە کە لە بەرهەمەکەدایە کڕیار و خوێنەری لێ دەتەکێنەوە تا وای لێ دێ بەرهەمی یەکجار ورد و قوڵ لە فکری ڕووتدا، ڕاستییەکەی لە هەموو مەیدانێکی فکر و زانستدا، تاک و تەرا نەبێ کڕیاری چەنگ ناکەوێ.

من بە پێچەوانەی ئەوان ڕۆشنبیرانەی وەتەنگ دێن لە باو نەبوونی بەرهەمی نایاب، نەک هەر وەتەنگ نایێم و بەس، بەڵکو هەستی حەسانەوە دەکەم بەوەدا کە لەبەر نەبوونی بابەتی نایاب شتێکی ئاسایی و چاوەڕاوانکراو ڕووی داوە چونکە بەڕاستی سەیر دەبوو خوێنەران وروژمیان هێنابا بۆ سەر نووسینی سەخت و سەرکەش کە باوەشی بە فکری ئەریستۆکراتدا گرتبێ و لە کەمێکی نەبێ تێی ناگەن یا هەر لە هیچی، ئەوسا بیرم بۆ ئەوە دەچوو خوێنەران بە چاولێکەریی وەیا بە نیازی خۆهەڵدانەوە شتێک دەکڕن و پارە و ماندوو بوونی بۆ بە خەرج دەبەن کە سوودی لێ وەرناگرن، ئەمەش دیاردەیێکی زۆر ناسازگارە و تارمایی نەخۆشی نەفسی تێرا دیار دەکەوێ.

بە چاوی زیهنت ئەم دیمەنە بێنە بەر بینینتەوە: کتێبی «سەرمایە»ی کارل مارکس بە عەرەبی وەیا کوردی بڵاوکراوەتەوە و کڕیاری کورد و عەرەب ڕادەکەن بۆ کتێبخانان تا بیکڕن بەو بۆنەیەوە کە لەسەر مافی کرێکار دەکاتەوە لە حاڵێکدا گەلێ باسی ئەو کتێبە پسپۆڕی ئابووری و فەلسەفە نەبێ تێی ناگات چونکە کتێبەکە خۆی یەکێکە لە بەرهەمە هەرە ئەریستۆکراتەکانی فکر هەرچەند باسی کرێ و نرخی زیاد و پەتاتە و شوتیش بکات.

کڕیاری بەرهەمی ئاسان زوربەی گەلە، بەرهەمی ئاسانی ئەوتۆش هەیە هەموو گەل هەر لە منداڵییەوە تا فەیلەسووفەکانی دەبنە کڕیاری چونکە خۆشییێکی وای تێدایە هەموویان حەزی لێ دەکەن. پێم بڵێ کێ هەیە حەز لە گەپ و نوکتەی بازاڕیی وەیا مەتەڵەکانی مەلای مەشوور نەکات؟ قەشمەریاتی کتێبەکەی «الفاشوش فی حکم قراقوش» لە پاشاوە تا گەدا پێوەی دەگەشێتەوە، ڕەنگە ئەگەر قەرەقوش خۆشی ببیبیستبان لێیان ڕازی با.

گۆرانیی شایی و هەڵپەڕکێ و چیرۆکەکانی «تیغەڵماس و سەلیمی جەوهەریی» هەموو کەسێک حەزیان لێ دەکات. هەر ئەو کەسەی کە دڵ تەنگە لەبەر کزی بازاڕی بەرهەمی بایەخدار بۆ خۆی کڕیاری گەلێک لەو بەرهەمانەیە کە بە سەرەتایی و منداڵانەیان دا دەنێ. بڕیاری سروشتە بە کەیفی من و تۆ نیە تا خۆراک چەورتر بێ میعدەی ساغتر و بەهێزتری دەوێ، ئەرک و مەسرەفی لێنانیشی پترە لە هی خۆراکی ڕەشەشێو. شۆڕشگێڕێکی وەک لینین ناو ناوە عوزر دێنێتەوە لە بەکارهێنانی نووسینی زەحمەت کە زوربەی خەڵق تێی ناگەن لەبەر ئەوە کە بابەتی نووسینەکە خۆی لە خۆیدا زەحمەتە و ئاسانکردنەوەی لە توانای نووسەردا نیە.

لینین کە ئەم عوزرە دێنێتەوە بۆیەیە کە پێشەوای زوربەی میللەتێکە لە بازاڕی سیاسەتدا و دەبوو بە زمانێک باخێوێ کە ئاسان بێ، ئەگەر زانایێکی ڕیازیات وەیا ئاسمان وەیا ئاتۆم با ناچاری عوزر هێنانەوە نەدەبوو. کەواتە خۆ لادانی خوێنەری عادەتی لە بەرهەمی فکری ئەریستۆکرات نە سووچی خوێنەرە نە هی بەرهەمەکە. بەڵام لێرەدا ڕووی گلەیی دەکرێتە خوێنەر کە هات و بێ سێ و دوو بکەوێتە دژی بەرهەمی ڕەسەن و لە دژایەتیەکەشی بەردەوام بێ. گلەیی ناکرێ لە قوتابیێک خۆی لە کۆلیجی طب

نەدا لەبەر قورسی دەرسەکانی بەڵام مافی ئەوەی نیە بکەوێتە دژی طب و داوا لە خەڵقیش بکا رووی تێ نەکەن. مەسەلە مەشوورەکەی «رێوی دەمی نەدەگەیشتە ترێ دەیگوت ناتخۆم ترشی» بە رۆشنبیر رەوا نیە. مەردی نەزان و نەخوێندەوار هەرچی ورێنەی سەروبنە بیان کات لێی بە عەیب ناگیرێ، بەڵام کام گلەیی قورسە ئەوەیان لە رۆشنبیر دەکرێ کە پێی داگرت لە پەسەندکردنی ئەو بەرهەمانە کە لە رێکار «مستوی»ی تێگەیشتنی ئەون و بەس.

رۆشنبیر دەبێ تەکان بدا سەرەوژوور بۆ تێگەیشتنی ئەو بەرهەمانە کە لە ئاسۆی بڵندڕوانینی ئەو بەرزترن نەک ئاسۆی بەرز دیتن و زانین تاوانبار بکات. ئەگەر بتوانین پەلە نەکەین لە بڕیارەکانمان، ئەمانەی لێرەدا دەیانڵێم هەموویان شتی زۆر ئاسایی و سەرەتایین و هی نەسەلماندن نین. بە نموونە دەڵێم ئەو رۆشنبیرەی پەلە دەکا لە تاوانبارکردنی بەرهەمی لە فکری خۆی بەرزتر، ئاگادار نیە لەوە فکرەکەی خۆی ساڵە و ساڵ بەرزتر دەبێتەوە و لە هەر بەرزتربوونەوەیێکدا ماوەیێک دەبڕێ لە هەستکردن بە هەڵە بوونی تاوانبار کردنی فکری بەرز چونکە بێگومان ئەو بە دڵیدا نایێت بەرزتربوونەوەی خۆی تاوانبار بکا لەبەر تیشکی فکرە نزمەکەی پار و پێراری، دەوجا کە حاڵ وابێ هەر نەختێک پتر لە مەسەلەکە ورد بێتەوە دەبینێ تاوانبار کردنی فکری بەرز لە بنەڕەتادا تاوانێکی گەورەیە وەیاخود هەر نەبێ نەزانینێکی گەورەیە.

رۆشنبیر لە گلەیی رزگار نابێ بەوەدا قۆناغ بە قۆناغی تێهەڵکشانی خۆی بەزەیی بۆ فکری بەرز بجوڵێتەوە و بایی ئەو تێهەڵکشانە حورمەتی فکری بەرز بگرێ چونکە ئەوسا هەم شێوازەی «رێزی مەرحەلی» بۆ فکری بەرز لە نێوان تێکرای رۆشنبیراندا دەبێتە دیمەنێک کە دەشێ پێی بگوترێ «چەرخ و فەلەکی رێز گرتن» بەو مانایە کە هەر بابایەک بە حوکمی باری زیهنی و نەفسی خۆیەوە لە جۆلانەی سەرەوژوور چوون و بەرەوخوار هاتنی ئەو رێزگرتنەدا دەبێ.

ئەوەی راستیش بێ، جۆلانە و چەرخ و فەلەکی رێز گرتن لە مەیدانی فکر و سیاسەتدا شتێکی زۆر بەرچاوە لە ژیانی رۆژانەماندا نەک هەر لە پەراوێزی تاکاندا بەڵکو بە گەز و گرێی نێوان دەوڵەتانیش: بۆ خۆت دەبینی تەرمۆمەتری رێز و خۆشەویستی لە چ هاتوچۆیەکدایە بە پێی کات و سەعات و باری بەرژەوەند و سوود و زیان. گەلێک جاران رێزلێگیراوێکی دوێنێ، کە باری دالەنگا، رۆژانی رێزلێگرتنیشی تاوانبار دەکرێ و چاکەکانی پار و پێراریشی لێ بە خراپ دەگەڕێ. بە تەعبیری پۆکەرچیان بە رێست دەگەڕێنەوە سەر رابردووی. چەند خۆشە رۆشنبیریی لەم تەڵەکەبازییە و کاری مەیموونانە رزگار بووبا، رزگار بوونیشی بە من و تۆ دەکرێ کە لە راستیشدا رزگار بوونی من و تۆیە. خۆ ئەگەر رێشمان نەبوو دەستێک درێژ کەین بۆ رزگارکردنی رۆشنبیری ئەوەندەمان پێ دەکرێ یارمەتی تەڵەکەباز نەدەین و لاتەریک بوەستین. ئەگەر لاتەریکیش زەحمەت بێ هێندە هەر دەمێنێتەوە پاڵ بە خۆمانەوە نەنێین بەرەو تەڵەکەبازی:

شاهی کە نەبێ رادەبوێرین بە فەقیری
بۆ ئەهلی قەناعەت لە پلاو خۆشترە داندۆک

بەیتە واتا سەخت و وشە و ڕستە سەرکەشەکانی نالی لەم مەیدانەی فکری ئەریستۆکراتدا دوا پلەی پەیژەی سەرەژوور چوونی شاعیرەکانی کورد پێکدێنن کە ئیتر بوارێکی زەحمەتتر نیە شاعیرێکی کورد لێی پەڕیبێتەوە. لەم مەیدانەشدا نالی خاوەن ماڵە نەک مێوان، واتا بەشێکی بەرچاوی شیعری نالی لە پلەی بەرزی و سەختیدایە نەک چەند بەیتێکی. هەموو شاعیرێک بە نیازی سەپاندنی شاعریەتی خۆی چەند جارێکان ئەسپی زمانی لە مەیدانی مەتانەتی وشە و واتادا تاو دەدا ئیتر یا بە ساغی لێی دەردەچێت یا تێیدا دەگلێت و دەگەڕێتەوە بۆ مەفتەنی هەمیشەکاتی خۆی کە هەڵبەستی زادەی دەسەڵات و چاپووک سواری عادەتی خۆیەتی. لە تاک تاکە بەیتی خۆنیشاندانداندا شاعیر دەبێتە مێوان، پێشیەوە دیارە لەو بەیتانەدا جل و بەرگ و وڵاخی خوازراوەی بەکارهێناوە. ئەم فەرقەی نێوان نالی و شاعیرێکی تری کورد لە لایەن دەسەڵاتی بەکارهێنانی وشە و ڕستە و واتای زەحمەت و سەرکەشەوە هەر خۆیەتی بە دیار دەکەوێتەوە لە مەیدانی هەڵبەستی ئاسان و ئاساییدا: نالی کە لە ڕەوەزی سەختی واتا سەرکەوێ و لە بواری خوڕی تەعبیردا بپەڕێتەوە، دیارە لە دەشت و نەرمانان و بەناو تەنکاواندا بە گەپ و شۆخیەوە ڕێگە دەر دەکات. ئەم ڕاستیە چرایەکە کە لەبەر تیشکی ئەودا نالی ئەم برە شیعرەی گوتوە:

طبعی شکرباری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا
ئیمتیحانی خۆیە مەقصودی «لە عەم داوە» دەکا
یا لە مەیدانی فصاحەتدا بە میسلی شەهسوار
بێ تأمل بەم هەموو نەوعە زمانی ڕادەکا
کەس بە ئەلفاظم نەڵێ خۆ کوردیە خۆ کردیە
هەرکەسێ نادان نەبێ خۆی طالبی مەعنا دەکا
بێتە حوجرە پارچە پارچەی مسوەدەم بکرێ بە ڕوح
هەرکەسی کوتاڵ و پارچەی «بێ بدل» داوا دەکا
شیعری خەڵکی کەی دەگاتە شیعری من بۆ نازکی
کەی لە دقەتدا پەتک دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا

دوا بەیتی شیعرەکە لە کۆتایی مەصرەعی یەکەمیدا لە جیاتی «بۆ نازکی» لە هەندێ نوسخەدا «ئەی نالیا» نووسراوە. ئەگەر وەهاش بنووسرێ واتای «بۆ نازکی» لە دەست نادرێ چونکە «کەی لە دیقەتدد...» ئەو مانایە تێ دێنێتەوە.

لە مەصرەعی دوەمی بەیتی یەکەمدا «لە عەم داوا»م خستە ناو کەوانەوە چونکە یەکدوو جۆر خوێندنەوە و واتای هەیە: دەشێ «لە عەمددا– عەمدەن» بێت مومکینیشە بە نەختێک زار پەلکردنەوە بکرێتە «لە عام داوە...». هەروەها وشەی «لە عەم» هەڵدەگرێ «لعم»ی عەرەبی بێ بە واتای لیکی زاری مرۆڤ کە ئەویش نەختێکی خۆ پێوە ماندوو کەیت جێگەی بۆ لە بەیتەکەدا دەدۆزیتەوە.

لەم هەڵبەستەدا نالی لە هەست کردن بە پۆپی دەسەڵاتی خۆیەوە تێمان دەگەیەنێ ئەو کە بە کوردی شیعر هەڵدەبەستێ بە ئانقەست کەرستەیەکی ئاسانی ئاخاوتنی پەسەند کردوە کە زمانی دایکزایە بۆ دەربڕینی هەموو واتاییک با زەحمەتیش بێ، ئەگینا لە توانایدا هەبوو بە زمانێکی تر کە (فارسی و

تورکی و عەرەبی) یە شیعر بڵێ. تۆ سەیری بە دوا بەیتی «خۆ کوردی و خۆ کردی» دا چ بەیتێکی مەتین و بێمانەندی هێناوەتەوە کە هەموو ڕەخنە و توهمەیێکی «خۆ کردی» ڕیسوا دەکا بەوەدا کە لەو خۆکردیەدا کام هونەری دوورەدەست و سەخت و زەحمەتە ئەوی کردوە بە ناوەڕۆکی هەڵبەست و چەندین واتای جوداجودای تێک هەڵکێشاوە. من کە هێندە بە هێز و توانای نالیدا هەڵدەڵێم نابێ خوێنەر لێم بە سەهوو بچێ و وا تێبگا لایەنگیری ئەم مەدح و سەنایەم پێ دەکا.

ئەوەی ڕاستی بێ نالی خۆی لە چەندین جێگە پێمان دەڵێ پایەی بوێژیی ئەو لە چ بەرزیەک دایە و چ هونەرێکی خاریقی لە شیعردا بەکارهێناوە و چەند قووڵ بۆتەوە بۆ بنی دەریای واتا و چەند تێهەڵکشیوە بەرەو ئاسمانی خەیاڵ. لەم هەموو هاوارەی نالی بۆ ڕاکێشانی سرنجی خەڵق بەرەو وردی و نازکی و قووڵی و مەتانەتی هەڵبەستەکانی هەر دەڵێی خەریکە پەنجەمان بگرێ و لەسەر خەزێنەی گەوهەرە شرایەوەکانی دابنێ وەیا پێڵووی چاوە نوستوەکانمان هەڵداتەوە تا پرشنگی شەوچراکانی ببینین.

مرۆڤ مەگەر گوێی گران بێ ئەگینا هاوارەکانی نالی لە حەوت خەوی غەفڵەتی بە خەبەر دێنن. نالیش ناکەین بە شاهید بۆ خۆی، نەمرێکی وەک حاجی قادر لە دە جار زیاتر شایەدیی بۆ بلیمەتی نالی داوە، بە دوا حاجی قادریشدا هەموو ئەو شاعیرە کوردانەی بە زاراوەی نوێ پێیان دەڵێن کلاسیک لە ڕاستیشدا ڕۆمانتیکن نالییان بە پێشەوای شیعری کوردی داناوە.

من لەم نووسینانەمدا دێم و خاڵ لەسەر پیت دادەنێم و درشتان خورد دەکەمەوە و چەند لایەنێکی تایبەتی نرخ و پایەی بوێژیی ئەو دەخەمە بەرچاوی خوێنەری کورد کە ئەمانە هەموویان کەمێکی ئەو مافەیەتی وەک قەرز بە ئەستۆمانەوەیە و من دەیدەمەوە. بەر لەوە دیراسەیێکی ژیان و باری مێژوویی زەرفی ئەو ژیانە و چەکمەسەریی و تاڵی و سوێریی و خۆشی و ناخۆشی و هەموو سەروبەرێکی بوون و ژین و مەرگی نالی بکرێت کەس ڕێی نیە بڵێ من دەتوانم مافی تەواوی نالی بدەم بە گیانی نالی وەیا بە میراتگرەکەی کە میللەتی کوردە. ئەم شیکردنەوەی هەموو لایەنێکی هاتن و بەسەرچوونی نالی لە پێویست پێویستترە بۆ تێگەیشتنی واتا و مەبەسە ورد و قووڵ و نهێنیەکانی گەلێک لەو بەیتانەی کە بەسەر زارانەوە سووک دێن و دەڕۆن. بە نموونە لێرەدا بەیتێکت بۆ دێنم بە شایەدی قسەکەم. نالی دەڵێ:

لە لای من با وجودی ناس و ئەجناس
کەسی تێدا نیە ئەم شارە بێی تۆ

بیستومە لە مرۆڤی نالیدۆست و شیعردۆست کە مەبەسی نالی لە وشەی «ئەم شارە» شاری ئەستەمبوڵە. ئەم ڕایە شتێکی تر دەسەپێنێ لە تاکە بەیتێکی تری برە شیعرەکە دەفامرێتەوە:

هەموو ڕۆژێ لەتاو هیجرانی ئەمساڵ‹٦›
تەمەننای مردنی پێرارە بێی تۆ

ئەگەر بسەلمێنین مەبەسی نالی لە «ئەم شارە» شاری ئەستەمبوڵ بووبێ دەبێ لەوەش ئاگادار بین بە هەمووی دوو ساڵ تێپەڕیوە بەسەر دوور کەوتنەوەی لە یارەکەی چونکە وشەی «پێرار» دوو ساڵ

رادەگەیەنێ. لەوەڕا دەبێ دان بەوەدا بنێین نالی کە سلێمانی بەجێ هێشت بۆ ئەو سەفەرە یەکجارەکیەی کە لێی نەگەڕایەوە بەرەو مەفتەن لە ماوەی دوو سالاَندا حەجی کرد و بە دوا حەجدا لە شام مایەوە و ئەوجار چوە ئەستەمبوڵ و لێی بوو بە مێوان و ئەم هەڵبەستەی تێدا هۆنیەوە. هەر نەختێک خۆ ماندوو کردن بە لێکۆڵینەوە و مێژوو بە یەکتر گرتن و تێخوێندنەوەی ڕووداوی بێگومان ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ئەم دوو ساڵە هەرگیزاوهەرگیز بایی ئەو شتانە ناکەن کە دەکەونە نێوان دەرچوونی نالی لە سلێمانی و نیشتەجێبوونی لە ئەستەمبوڵ.

لە نووسیناندا (لە هەلێکی تری ئەم نووسینە باس دەکرێت) ساغ بۆتەوە نالی ساڵی ١٨٥٤ لە شام ژیاوە کە ئەوسا دەمێک بوو سلێمانی تەرک کردبوو. دوو ساڵ و سێ ساڵ و چوار ساڵ بایی نیوەی ئەو کاتەش ناکەن کە بەسەر سەفەرەکەی نالی بەرەو حەج و شام و ئەستەمبوڵدا تێپەڕی بوو کەواتە لە هیچ ڕوییێکەوە و بە هیچ تەئویلێک نالوێ بیر بۆ ئەوە بڕوات کە «ئەم شارە» ئەستەمبوڵ بێ.

بەلای منەوە مەبەستی نالی نە ئەستەمبوڵە نە شام نە هیچ شوێنێکی دەرەوەی کوردستانی عێراق. وشەی «ئەم شارە» لە بەیتەکەدا بێ زیاد و کەم و بێنە و بەرە «شاری سلێمانی»یە. هەرچەند نازانین چ ڕووداوێک وەیا کام باری نالەبار وای کردوە نالی لە نشیمەنی خۆشەویستەکەی دوورکەوێتەوە و بۆ ماوەی دوو ساڵان نەتوانێ لێی نێزیک بێتەوە چونکە وەک گوتم بەسەرهاتی نالیمان لێ ونە و سەرەدەریی لێ ناکەین بەلاَم لە دوای ئەوەی کە مەعلوومان کرد ئیمکان نیە نالی ئەم شیعرەی لە شوێنێکی دەرەوەی کوردستاندا گوتبێ هەر «سلێمانی» دەمێنێتەوە بە تاکە ئیحتیمال کە شوێنی لێ هەڵبستنی شیعرەکە بێت. دەزانین نالی ماوەیێکی درێژ لە سلێمانی ماوەتەوە، هەرچەند سەرەتا و کۆتاییەکەشی زۆر ڕوون نەبێ –بە تایبەتی سەرەتاکەی–، لەگەڵ هەندێک لە میرانی بابان پێوەندیی دۆستایی هەبوە تەنانەت ئەو مامۆستایانەی دەرسیشیان پێ گوتوە لە سلێمانی دەناسرێن و مزگەوتی لێی خوێندوون ئەوانیش ناویان ون نیە. وشەی «شار»یش بۆ خۆی تا ڕادەیێک پەنجە بۆ سلێمانی درێژ دەکات چونکە تا ئێستاش خەڵقی سلێمانی کە بەرەو ماڵ دەبنەوە لە شوێنی تری وەک کەرکوک و بەغداوە دەڵێن «دەچینەوە شار». خولاسە بە لای منەوە گومان لە واتای «ئەم شارە»دا نیە.

ئەم بزریەی زەرفی هەڵبەستنی بڕە شیعرەکە وا دەکات لە مرۆڤ نەتوانێ ڕووی سۆز و پەرۆشی خۆی لە نیشانەیێکی دیار و ناسراو بکات، هەر دەڵێی تیری سۆزەکەی بێ ئامانج بەرەو بۆشایی دەڕوات چونکە شیعرەکان لەوانە نین دەربڕینێکی عادەتی عیشق بێت و بەس، سەرەڕای دەربڕینی عیشق باسی ڕووداوێکی ڕاستەقینەی دوورکەوتنەوەی دوو ساڵانەی نالی دەکات لە خۆشەویستەکەی ئیتر ئەگەر دوورکەوتنەوەی نالی هی ئەو دەمە بێ کە هێشتان کوردستانی عێراقی بەجێ نەهێشتوە دیارە شیعرەکە عیشقێکی ئاگرینی سەرەتای عومری نالی نیشان دەدات کە بۆ کچێکی کوردی مەڵبەندی بابانی هەست پێ کردوە. خۆ ئەگەر ئەو ڕووداوەش زانرابا کە نالیی ناچار کردوە دوو ساڵان لە یاری دوورکەوێتەوە – کێ دەڵێ ڕۆژەک لە ڕۆژان دوای ئەو ڕووداوە نالی چاوی بە یارەکەی کەوتۆتەوە؟ ئێمە لە تاریکیداین و هیچی ئەو ڕووداوەمان لێ دیار نیە. ئەوسا گەلێک پتر هەستی سۆز و حوزنمان دەجۆشا و چەژێکی ترمان لە بەیتەکان وەردەگرت، لە نیگا و نیم نیگای وشە و ڕستەکانیشیان باشتر حاڵی دەبووین. بەلاَم کە گوتت شیعرەکەی لە ئەستەمبوڵ گوتوە، ساغیش بۆتەوە کە ئەو گەلێک پتر لە دوو ساڵان بە حەج و دانیشتنی لە شام خەریک بوە بەر لەوە بچێتە ئەستەمبوڵ، ئەو ئیحتیماڵە نامێنێ بڕە شیعرەکەی لە

گەنجایەتیدا گوتبێ وەیا مەبەسی کچێکی کوردی بابان بێت، ئیتر چارت ناچار دەبێ بگەڕێی بە دوا ئیحتیمالێکی تری جێگری «سلێمانی و کچێکی بابان» خۆ دیاریشە تا لە دۆزینەوەی ئەو جێگرە دەبیتەوە، کە هەر لێی نابیتەوە، پەکی ئەوەت دەکەوێ پەرۆش بۆ کەساسی و حوزنی نالی هەڵبگریت.

تێبینی و وردە لێکدانەوەی تر لەبارەی ئەم برە شیعرەوە زۆرن من چیتری لەسەر نارۆم و دەگەڕێمەوە سەر مەبەستی بنجی لەم درێژە پێدانەدا کە بریتیە لەوە کەس ناتوانێ مافی تەواو بە نالی و شیعرەکانی بدات بەر لەوە رۆژگار و ژیان و بەسەرهاتەکانی روون بکرێتەوە. ئەو هێندەی من لەم نووسینەدا دەیکەم بە کزە چراییێک بەدیار ئەدەبی نالیەوە گەشتێکی شەوکوێرانەیە بە کوتەکوتی وەکازەوە لە ناو باغ و مەزرای هێندە پان و پڕ میوە و گوڵ و رەیحان کە سەرەتای هەیە و برانەوە نا! بە داخەوە ئەم توێژینەوەیە لە کات و بەسەرهات و رووداوەکانی ژیانی نالی نە کەس کردوەتی و نە دیارە هیچ کەسێک بیکا، وردە وردە لەگەڵ تێپەڕینی کاتیش وای لێ دێ بەکەس نەکرێت لەبەر دوورکەوتنەوە و نادیار بوونی رۆژگارەکە، کە ئەمە راستەوخۆ دەبێتە کوێر بوونەوەی سەرچاوەی روون کردنەوە و رەواندنەوەی تاریکایی دەوروبەری نالی و ئەدەبەکەی.

بەڵگەیێکی یەکجار بچووکی راست بوونی ئەم تێبینیانەم لەم خەبەرەی یەکجار کورتیلەدا بە دەستەوە دەدەم: لە جیلی پێش خۆمم بیستوە موفتی زەهاوی فەرموویەتی نالی مەبەستی شەخسی ئەو بوە لەم بەیتەی سەرەتای قەصیدەی:

ئەحوەلی تەفرەقە نەزەر تەقویەتی سەبەب دەکا
عارفی وەحدەت ئاشنا لەم قسەیە ئەدەب دەکا

دەبینی بەیتەکە ئەو کەسانە دەشکێنێتەوە کە باوەڕیان بە کاریگەر بوونی «اسباب» هەیە و بەمەدا پەیرەویی رێبازی «اختیار» دەکەن لە ئاییندا، ئەو کەسانەش دادەنێ بە مرۆڤی چاو خێل کە مەشوورە یەک شت بە دوو شت دەبینن، واتە لە تەک ئیرادەی خوادا «اسباب»یش بە کاریگەر دەزانن. دەشیا ئەگەر قسەکەی موفتی زەهاویی لە نێواندا نەبا بگوترابا نالی لەوانەیە بە رواڵەت خۆی دابێتە پاڵ مەزهەبی «جبر» وەک کوڕێنی کردن لە مەیدانی ئاییندا، بەڵام کە بێت و مەلاییێکی گەورەی وەک موفتی زەهاویی عەیبدار بکا بە پەیرەویی کردنی «اختیار» ئیحتیمالی کوڕێنی و خۆهەڵدانەوە لە بەیتەکەدا دەسڕێتەوە و بە تەواوی لێمان روون دەبێ کە وا نالی لە ناخی دڵدا دژی «اختیار» بوە، ئیتر هەر جارە کە بەیتێکی «توحیدکارانە»مان خوێندەوە لە دیوانی نالیدا دەرلەحزە دەسەلمێنین مەبەسی دانهێنان بوە بە یەکایەتی کاریگەر بوونی خودا لە جیهاندا. هەروەهاش دڵمان بۆ ئەوە دەڕوا کە شیعرە تەصەوف ئامێزەکانی، ئەوانیش قسەی رواڵەتی نین بەڵکو بڕوای دەروونن، سەرلەنوێ ئەوەش دەسەلمێنن کە نالی مەیل و مەشرەبی لە تصوفدا بەرەو قادریی بوە و دژایەتی لەگەڵ صوفیەکانی نەقشبەندیی لە عەقیدەوەیە نەک دوشمنایەتی شەخسی وەیا شۆخی کردن لە هەڵبەستدا. قسەکەی موفتی زەهاویی لە لای خۆیەوە ئەوەشمان پێ دەڵێ کە زەهاویی خێل بووە وەیا عەیبێکی ئەوتۆ هەبوە لە چاوییدا کە بشێ پێی بگوترێ خێل.

ئەوەندە ئەنجام بەدەستەوەدانە لە تاکە یەک خەبەری کورتیلەی مەبەستی نالی لە «احوال» بۆ خۆی بەسە ببێتە بەڵگەی بایەخدار بوونی زانینی زەرفی هەڵبەست، لە هەمان ڕێگەیشەوە دەمانخاتە سەر بیرکردنەوە لەوە کەوا ڕەنگە مەبەستی نالی لە «عارفی وەحدەت ئاشنا»ش هەر واتای وشەکان نەبێ بەڵکو لەوێشدا پەنجە بۆ مرۆڤێکی دینداری سەردەمی خۆی درێژ دەکا کە نالی بە خواناس و «موحد»ی تەواوی داناوە و کردوەتی بە نوقتەی بەرانبەری موفتی زەهاوی لە عەقیدەدا.

ئەگەر نالی مرۆڤێکی وەهای مەبەست بووبێ من نازانم کێیە چونکە بە بیستن لە کەسم نەبیستوە بە لێکدانەوەش خۆم خەریک نەکردوە بزانم کام شابازی ئاسمانی «توحید» لەوانەی نالی دیتونی وەیا ناسیوونی لێی دەوەشێتەوە ئەم «عارفی وەحدەت ئاشنا»یەی ناو هەڵبەست بێ! گومانیش نیە لەوەدا کە نالی خواناسێکی کۆن وەیا غەیری کورد مەبەس نیە لەم وەحدەت ئاشنایە، ئەگەر ڕاست بێ کەسی مەبەس بووبێ، چونکە زەوقی هەڵبەست بە تێکڕایی و شاعیریەتە زۆر سازگارەکەی نالی بە تایبەتی وا داخوازیی دەکەن کوردێکی زیندووی ئەو سەردەمەی مەبەس بووبێ تاکوو یەکجاریی و لە هەموو سەرێکەوە ببێتە هاوتای تەرازووی موفتی زەهاوی، ئەگینا ئەگەر لە پەراوێزی هاوسەنگی موفتی دەرچووین یەکسەر دەبێ مەسەلەکە ببەینەوە لای خودا خۆی و ئەو بە نارەزای «تقویەی سبب» دانێین و بیکەینە بەرپەرچ دەرەوەی یەک بە دوو دیتنی چاو خێل.

کە من و یەکێکی تر دێین و پایەی هەرە بەرزی بوێژیی لە کوردیدا بۆ نالی ڕەچاو دەکەین بێ ئەوە زانینی زەرفی ژیانی خۆی و دانانی شیعرەکانی یارمەتی بدات لە دیار کردنی ئەو پایەیەدا، لە تێکڕای هەڵبەستەکانیەوە بڕیاری وەها بنجی و یەک جارەکی دەدەین هەرچەند لەو هەڵبەستانەدا بەشێکی زۆری، جارێ، واتایان ئاشکرا نەبوە و گەوهەرەکانیان لە قتووی مصرعی بەیتەکان دەرنەهێنراون، لەمەشدا دەڵێی ئەو کەسەین کە بڕیاری زێدە بەرز بوونی کەژێک دەدا بێ ئەوە گەیشتبێتە تۆقەڵەی سەری، بەڵام بەفرە سپیەکەی چوار کژی ساڵ کە مێژەری هەمیشەیی کەژەکەیە ئازای دەکا لەو بڕیارەیدا و بێ پەروا دان بەوەدا دێنێ کە وا لە هەموو ئەو کەژانە بەرزترە بەفریان بەسەرەوە نامێنێ. من کە لە واتای هەندێ، وەیا زۆری، شیعری نالی تێش بڕ ناکەم، لە دڵدا متمانیم پەیدایە کە تێبرنەکردنی من بەڵگەیێکی زێدە مەتانەتی شیعرەکەیە... کە دەستم نەگەیشتە بەفری تۆقەڵەی سەری کەژ، دیارە سەبەب زێدە بەرزیی کەژەکەیە، بەفرەکەش بۆ خۆی چ گومان لە بوونی ناکرێ هەرچەند دەستیشم نەی گاتێ، بە تەواویی وەک واتای هەڵبەستەکانی نالی.

من لەبەر تیشکی ئەم لێکدانەوەیە و هی وەک ئەو کە لە دڵدا گڕێ دەگرێ و ڕێی دەربڕینیشی نادۆزمەوە لە ترسی درێژەکێشانی بێئەندازە، سەیری شیعرە سەخت و سەرکەشەکانی نالی دەکەم و بەرانبەریان سەری ڕێز و بە گەورەگرتن فروو دێنم. لە ناخی دڵ و قووڵایی نەستمدا وتووێژی مرۆڤایەتیم، هەروەک گڵی زەویی کە لەبەر لێزمەی باران دەتوێتەوە، ئەویش بەم جۆرە ورتەی وردە سەرپێچی و بۆرە گلەیی و سووکە ڕەخنەی لێ دەبڕێ و دەبێتە دەنگێکی یەک ئاهەنگی ستایش و پەسەندکردن و شاگەشکە بوون لە عاست هەڵبەستە سەرکێشەکانی نالی:

برق البصر لە بەر برق و تلاءلؤي لآلی
خسف القمر لە إشراقی قیامەتی جمالی

داهێنانی «قیامة» بە خۆی و نیشانە مەشوورە قورئانیەکەیەوە کە «حتی اذا البصر و خسف القمر»ە لە ڕێی نەخشەکێشانی تەئسیری قیامەتی جوانی یار و بریق و باقی لولوەکانی ئارایشی گەردەن و سینەی، هەرچەند بە گوتەیێکی کوردیی عەرەبی ئامێز بێ هەر دەبێتەوە بەو بابەتە ئەدەبیە بەرزە کەوا نەک هەر لە ڕیزی هەرە پێشەوەی ئەدەب ڕادەوەستێ بەڵکو لە ڕیزی هەرە پێشەوەش باری هەرە هەورازی ڕیزەکە دەگرێ. سرنج بگرە «برق البصر» کە یەکێکە لە نیشانەکانی قیامەت دەشێ بریسکانەوەی چاوی تەماشاکەران بێت. تەماشاکەرانیش چ ئەوانە بن لولوەکانی سەر گەردەن و سینەی یار دەبینن چ ئەوانە بن لە ڕۆژی قیامەتدا چاو ئەبڵەق دەبن فەرقێک ناکات. لە هەمان کاتدا مومکینە «برق البصر» لە هەرسێ حاڵدا دەبێتەوە نیشانەی قیامەت چونکە بۆ خۆی لە مصرەعی یەکەمدا پێشەکی ئەو قیامەتەیە کە وا بە وشەی صریحی «قیامەتی جمالی» ناوی هاتووە لە مصرعی دووەمدا. هەروەها یەکەم نیشانیە لەم بەیتەدا هەروەک لە قورئاندا یەکەم نیشانەیە، دووەم نیشانەکەش «خسف القمر»ە هەم لە مصرعی دووەمی بەیتەکە و هەم لە ئایەتی قورئانیشدا.

نالی کە هاتووە ئەم دوو نیشانەیە زۆر بەرچاو و مەشوورەی قیامەتی ناو ئایەتی قورئانی هێناوە بە زەمینەی مەدحی جوانی یار، یەکجار هونەرکارانە و دەستڕەنگینانە وشەی «قیامەتی جمالی» لە مصرعی دووەمدا کردوە بە هۆی دروست بوون و لێ سەلماندنی هێنانەوەی ئەو دوو نیشانەیە و بەمەدا خۆی ڕزگار کردوە لەو بێهێزییەی واتا کەوا ڕەنگ بوو لە بەیتەکە بووبایە عەیب ئەگەر تەنها جوانی یار «خسف القمر»ی پێکهێنابا، چونکە ئەوسا بەیتەکە لە عاست «قیامەتی جمال»دا دوو جاران کورتی دێنا:

جارێکیان لە ڕووی ئەوەوە کە دەبوو بێ بەڵگە بسەلمێنین جوانیەکە ئەوەیە کە مانگ لە تەکیدا بێ شەوق خۆ دەنوێنێ، جارێکی تریش لە ڕووی ئەوەوە کە ئەگەر بە خاتریش بسەلمێنین جوانی یار جوانی مانگی شاردۆتەوە ئەوسا هەر نەدەکرا تەئسیری جوانیەکە لە مصرەعی دووەمەوە بگەیەنینە «برق البصر»ی مصرعی یەکەم چونکە هۆی بریسکانەوەی چاو لە مصرەعی یەکەمدا یا هی لولوەکانی ئارایشتە یاخود هی فرمێسکەکانی نالییە و چ دەخلێکی «جوانی» یاری بەسەرەوە نیە، بەڵام کە «قیامەتی جەمالی» هاتە ناوەوە قورئان بڕیار دەدات «برق البصر»یش وەک «خسف القمر» هی جوانی یارە ئیتر لزوم نامێنێ من و تۆ بەهانان پەیدا کەین بۆ ئەم مامڵەتەی مارەکردنی «برق البصر» لە جوانی یار، ڕێی کەسیش نامێنێ گومان باوێتە بەر مومکین بوونی «برق البصر و خسف القمر» کە دەزانین نە ماڵی ئادەمیزاد بوە و نە لە دەسەڵاتی جوانی هیچ کەسێکیشدا بوە بەر لەوەی مامە نالی بەم سیحرە حەڵاڵەی دەسەڵاتی لە حەدبەدەری خۆیەوە بیانکات بە ئامانجێکی ئاسان و دەست هەڵێنجی دەریای شۆخی و نازداریی یارەکەی.

تۆ سەیری، ئەم هێنان و بردنەی زیهنی خوێنەرەوەی بەیتەکە بە ناو سنووری مومکین و نامومکیندا بە هۆی فڕینی واتا بە باڵی ئایەتی قورئانەوە، ئەوجا تێکەڵ کردنی جوانی لەگەڵ ئارایشت... لەگەڵ فرمێسک، ئەوجا هەڵچەقاندنی قیامەت لە ناوەڕاستی جیهانی واقیع... ئەوجا سەر لە نوێ بە بەیتەکەدا وەرەوە بێ ئەوەی مەبەستی قیامەتی تێدا بێ چونکە دەشێ «قیامەتی جەمالی» بە واتای «هەڵستانەوەی جەمالی» بێ، ئەوساش سەرلەبەری «برق البصر و خسف القمر» و هەرچی هەیە دەبنەوە مەدحی عادەتی و پێوەندییان لەگەڵ موعجیزە و ڕۆژی قیامەت دەبڕێت: کە بڵێی «خسف القمر و برق البصر» مومکین نین، وشەی «قیامەت» وەرامت دەداتەوە. کە بڵێی کوا قیامەت لە حاڵێکدا دنیا چ بەڵای بەسەردا نەهاتوە؟

ئەوسا وەرامت دەدرێتەوە بەوە کە بگوترێ کێ باسی قیامەتی کردوە؟ قیامەتی چی و حیکایەتی چی؟ قیامەت وشەیێکی فەرهەنگە بە واتای «هەڵستان» ئەگەر نەبووبایە زاراوەی ئایین چ پێوەندی بە ژیانەوەی دوای مردنەوە نەدەبوو. کە ئەم هەموو وردە حیسابانە کۆکەیتەوە سەر یەکتر و مافی هاتنە ناو هەڵبەستیان بدەیتێ دەزانیت کارەکە بەم داڕشتنە کوردیی قورئانییە نەبێ ناشێ و نالوێ و ناگونجێ و نابێ و ناکرێ. فەرموو ئەمە گەز و ئەمە مەیدان.

سەیرێکی پارسەنگ کردنی بەیتەکەش بکە لە لایەن موسیقای وشەوە: «برق البصر و خسف القمر» کە ڕستەی قورئانن هەر بەم شێوەیە لەنگەر دەبەستن لە بەیتەکەدا کە نالی پارسەنگی کردوون بە «برق و تلاءلؤي لآلی» و «إشراقی قیامەتی جمالی». دەتوانم بڵێم پارسەنگ بوونی «إشراقی قیامەتی جمالی» ئەوەندە تێر و پڕە لە کۆتایی بەیتەکەدا خەریکە باری لەنگەرەکە بە لای خۆیدا دەشکێنێتەوە.

وشەی «اشراق» سەرەڕای زرینگەی وشەیی کە تای «خسف القمر» دەکاتەوە لە واتاشدا لەنگەری خۆی ڕاگرتوە لەگەڵ پاکی و تەواویی ئەو جوانییە کە ماکی فرتەنەی ناو بەیتەکەیە. ئەوەندەشت لە بیر بێ نالی ئەم قیامەتەی بە زۆر بەسەر ئێمە و بەیتەکەدا نەسەپاندوە، گەلێک لە شاعیر و غەیری شاعیریش لە کوردان وشەی قیامەتیان بەکارهێناوە بۆ وصفی جوانی. کەیفی جوانڕۆیی «قامەتە یا قیامەتە»ی لە هەڵبەستدا گوتوە، ڕەنگە خۆشت لە وتووێژدا شتی وەهات گوتبێ.

لە بەیتەکەدا، ئەوەی ڕاستی بێ لە سەرانسەری غەزەلەکە، ڕەقص و هەڵبەزینەوەیێکی ناوەکی داڕشتن هەیە کاتێک هەستی پێ دەکرێ کە بڕگەی «تفعیل»ەکانی دیار بخرێن:

برق البصر – لە بەربەڕ – قی تەلەئلوئی – لەئالی
خسف القمر – لە ئیشڕا – قی قیامەتی – جەمالی

مرۆڤی شیعر و مۆسیقا دۆست لە تام و لەزەتی ئەو هەڵپەرکێیە تا بڵێی هەستی خۆشی دەکات. زۆر جاران جەزبەی سۆز بە ئاسایی دەکەوێتە سەر باری ئاهەنگێک و بەیەکەوە وەها جووت دێن هەر دەڵێی بە سکێک لە دایک بوون. جەلالەددینی ڕۆمی لە دیوانەکەی خۆی کە بە ناوی «شمس تەبریزی»یەوە دایناوە لە بڕە شیعرێکی مەجزوبانەی دێوانانەدا یەک بەیتی سەرلەبەری بریتیە لە «تفاعیل»ی بێواتا و بە زۆریی وشەیێک دووبارە دەکاتەوە کە جەزبەگرتوان لە گۆرانیدا دەیڵێنەوە:

تەنەنەنتەن  تەنەنەنتەن  تەنەنەنتەن تەنەنەن
تەنەنەنتەن  تەنەنەنتەن  تەنەناها یاهو

لە دیوانەکەی نالی، چاپی هەولێر، بەیتەکە بە جۆرێکی تر نووسراوە یەک جوولەی کەمترە لەمەی سەرەوە چونکە ئەمەیان شازدە جوولەیە و هی ناو دیوانەکە پازدە:

برق البصر لەبەرقی – تەلەئلوئی لەئالی
خسف القمر لە شەرقی – قیامەتی جەمالی

بەیتەکانی تر سەرلەبەریان لە دیوانەکەی چاپی هەولێریشدا شازدە جوولەن. ئەوەی ڕاستی بێ بەیتەکەی ناو دیوانی چاپی هەولێر دوو وشەی «برق و شرق» تێیدا گەلەک پاراو و شەنگن، لە لایەن واتاشەوە بێ کەم و کەسرن بەلام لەبەر دوو هۆی گرنگ ڕەنگە ڕاستی بەیتەکە ئەوە بێ کە من لە پێشەوە نووسیم:

یەکەم: سەرلەبەری غەزەلەکە شازدە جولەیی بێ شاعیرانەترە نەک یەک بەیتی تێدا تار بێ لەوانی تر.

دوەم: ئەو هەڵپەڕکێیەی کە باسم کرد، لە بەیتەکەدا نامێنێ ئەگەر جوولەیێکی لێ کەم کرایەوە.

بەهەمە حاڵ ئەمە بیروباوەڕی منە ئیتر خوێنەریش ئازادە لە باوەڕدا. لێرەدا چەند بەیتێکی غەزەلەکە دەنووسم بۆ تاکە مەبەستی دیارخستنی مۆسیقای هەڵپەڕکێکە:

نیەمەردومی – چ دیدە – نیەدیدەیی – چ مەردوم
لەفروغی خەد – دی فارغ – لەخەیالّی خا – لّی خالّی
سەری هەدوکولّ – می ئاخۆ – گولّی نەوبەها – ڕەیا خۆ
طەرەفی نەها – ڕەزولفی – زولف من ال – لیالی
بەصباحتی – تبسم – هەمو زەمزەمی – مەلیحی
بەملاحتی – تکلم – هەمو کەوثەری – زولالی
روخی توو گولێ – کە صەد بەر – گ و هەزاری عا – شق ئەمما
لە هەمو چەمەن – دیارە – بە اصولی نا – لە نالی

ئەم برە شیعرە کە گۆیا بۆ مەبەستی بیستنی مۆسیقاکەی هاتە ناو نووسینەوە جڵەوی ئیرادەم لە دەست دەردێنێ و ناچارم دەکا یەک دوو ئیشارەی خێرا بۆ چەند لایەنێکی وردی و جوانی هەندێک لە بەیتەکانی بکەم و، وەک مرۆڤی زێدە تینوو، بری خۆمی لێ بشکێنم هەرچەند سەرلەبەری بەیتەکان لە هەموو ڕوییێکەوە شاکار و پێشەوا و پێشاهەنگن، بەلام من لێرەدا بە دەست بێ دەرفەتیەوە وەتەنگ هاتووم و هەڵسووڕ و داسوورم بۆ ناکرێ.

لە لایەن مصرعی دوەمی بەیتی دوەمەوە «لە فروغی خەددی فارغ» بە دەست خۆم نیە دڵم بۆ ئەوە دەچێ دەبوو سەلیقەی نالی کە زەڕڕەبین و موقلاشە بڵێ «لە فروغی فرعی فارغ» چونکە ئەمیان هاوتای «خەیاڵی خاڵی خاڵی» بە تەواویی دەکاتەوە، هەرچەند دەزانم وشەی «خد» بە ئەصل مناسبی «فروغ –ڕوناکی»یە کەوا هەم سپێنەی چاو و هەم بریسکانەوەی سەرلەبەری چاوەکە ڕادەگەیەنێ. لە لایەن مۆسیقای وشەوە، دیسانەوە، دەزانم دەنگی «خ» نزیکە لە دەنگی «غ» و بەمەشدا بەیتەکە لە مصرەعی یەکەم و دوەمدا لەنگەری ئاوازی خۆی دەبەستێ. بەلام لەگەڵ ئەمەشدا وا دەزانم کە بێین و مصرەعی یەکەم و دوەم بەرانبەر یەکتر ڕاگرین وشەی «فرغ» باشتر لە وشەی «خد» چەسپاوتر دەبێ لە نێوان دوو وشەی «فروغ، فارغ»دا کە ڕاگیرابن لە عاست «خەیاڵ، خاڵ، خاڵی». وشەی «فرغ» بۆ ئەمە ببێتە خزمی تەواوی شکڵی «فروغ، فارغ» یەک نوقتەی پێویستە بۆ سەر پیتی «ع»ەکەی. کە دیققەت بگری ئەم نوقتەیە لە ناو تابلۆی تصوردا ڕاستەوخۆ لە «مەردومی چاو» کە بیبیلەی چاوە و لە «دانەی خاڵ» کە هەر خۆیەتی

دەبێتەوە نوقتەی بیبیلەکە، هەڵدەبەزێتەوە بۆ سەر «ع»ەکە و لە شکڵدا دەیکاتەوە هەم جینسی تەواوی «فروغ و فارغ». لە واتاشدا چ کەمایەتی پەیدا ناکا بۆ بەیتەکە چونکە «فرغ» کە مووی زوڵفە ئاورینگ و درەوشانەوەی هەیە، تەنانەت شاعیرێکی وەک «نزار قبانی» گوتوەتی:

یا شعرها علی یدی
شلال ضوء اسود

ئەم ئاورینگە ڕەشتاڵیەش لە صەدی صەد هەم ئاهەنگی ڕەشکێنە و برژۆڵە و برۆی چاوە. من ئەم تێبینییە بە جورئەتە لێرەدا دەردەبڕم لە ئەنجامی هاندان و پاڵپێوەنانی بەیتەکانی نالی خۆیەوە... تۆ بڵێی لە سەرەتاوە نالی «فرغ»ی نەنوسی بێ و دواتر نوسخەنوسان کردبێتیانە «خد»؟

لەگەڵ بەیتی باشتردا تەنها بە تەرکیبە «اضافی»یەکەی «طرفی نهار»ەوە خۆ خەریک دەکەم لەبەر کەم ماوەیی: ئەم تەعبیرەی نالی لەوانەیە کە ئیعجازی بەکارهێنانی تاکە وشەیان تێدا دەرکەوێ. نەهار دوو «طرف»ی هەیە. بەیانی و ئێوارە. لە هەردوو حاڵدا شەوقی ڕۆژ پێی دەگوترێ «زەردەپەڕ» کە مناسبی ئەو گوڵە نەوبەهارەی مصرعی یەکەمە کە گۆنای یاری پێ تەشبیه کراوە چونکە گوڵە بەهار ڕەنگی زەردە، لەم بەیتەشدا زەردییەکە هی بێهێزی نیە چونکە وشەی «نەو–نەوبەهار»ی بۆ بەکار هاتوە سەرەڕای ئەوە کە گۆنای زەرد یەکێکە لە دەقی ئەو مەدحانەی کورد پەسەندی کردوە.

ئەم «طرف نهار»ە جارێکی تریش خۆی گەیاندوە بە پایەی ئیعجاز بەوەدا کە ئەگەر ناوی زولف و شەویش لە هەڵبەستدا نەبا بەهۆی «طرفی نهار»ەوە هەر دەهاتنە حیسابەوە چونکی هەروەک ئەم لاو ئەو لای دوو کوڵمی یار موە ڕەشەکانی دوو زوڵفەکەیەتی هەروەهاش ئەم لاو ئەو لای دوو «طرف»ی نەهار دوو شەوە وەک زوڵفەکان.

شەوێکیان هی پێش ڕۆژهەڵات ئەوی تریشیان هی دوای ڕۆژاوا، کەواتە ئەگەر بگوترێ «سەری هەر دو کوڵمی طرفی نهارن» و قسە کۆتایی بێت، زولف و شەو لە خۆوە دێنە بەر هەست و زیهنی مرۆڤەوە و بەیەکتر دەگیرێن. لەم بەیەکتر گرتن و تەشبیهەشدا بایی سەری موویێک فەرقی لایەنێکی تەشبیهەکە لەوی تر ناکرێت چونکە هەروەک دوو زولفەکە لە هەموو ڕوییێکەوە تای یەکترن، هەروەهاش دوو شەوەکەی ئەم لا و ئەو لای «طرف»ی نەهارەکە بە تەواوی وەک یەکن – خۆ دیارە دوو شت چەنگ ناکەون بەقەدەر دوو شەو لە یەکتر بکەن مەگەر ئەو دوو زوڵفەی ناو هەڵبەستەکە. تەنانەت کە بێین و لەیەکترچواندنەکە خورد کەینەوە تا دوا پلەی خوردکردنەوە لەیەکچوونێکی ئەوتۆمان دێتە بەرچاو گەلێک پتر بێ لە هی «دو کەرتی سێوێک» کە بەسەر زارانەوە باوە بۆ دەربڕینی لەیەکترچوونی دوو شت.

لە زەردەپەڕەی سبەینەوە بگەڕێوە بەرەو شەوی پێش نوێژی بەیانی بەو قۆناغەدا تێپەڕ دەبیت کە لە زەردەپەڕی ئێوارەوە بەرەو شەوی دوای نوێژی خەفتنان دێتە بەرت. لە سەری هەردوو کوڵمیشەوە نیگات ڕاگوێزە بەرەو شەوی زوڵفانی ئەم لاو ئەو لادا وردە وردە لە ڕوناکایی تەواوەوە دەچیتە ناو سێبەری زولفان کە لاجانگەکانیان لێڵ کردوە وەک کاتی پێش ڕۆژهەڵات و دوای ڕۆژاوا تا دەگەیتە ڕەشایی زولفەکان خۆیانەوە کە شەوی ڕاستەقینەن. سەیری، ئەم «طرفی نهار»ە چ فرتەنەیێکی بەرپا کردوە!

به صباحتی تبسم هەموو «زمزمی» مەلیحی
به ملاحتی تکلم هەموو کوثری زلالی

لەم بەیتەدا نالی ئاڵوگۆڕێکی زۆر سەیری واتایی و وشەیی کردوە لە تەرکیبی مصرعی یەکەم و دوەمدا، بەرانبەری یەکتریشی ڕاگرتوون تا لە هەریەکەیان تیشکێکی پێویست باوێژێ بۆ ناو ئەوی تر. هێناوەتی «صباحتی تبسم»ی کردوە بە بنگەی تەشبیھ بۆ «زمزمی میلح» لە حاڵێکدا گرژینەوەیێک کە «صباحە»ی تێدایە بێ بە زاهیر لەگەڵ «کوثری زلال» پتر دەگونجێ چونکە لە «صباحە» کە وشەیێکە لە «صبح – بەیانی»، سبەینە» وەرگیراوە ئەو ڕوونی و شیرینیە هەست پێ دەکرێ کە لە «کوثری زلال»دا هەیە. زەمزەمی ملیح لە ڕاستە وشەکانەوە سوێرایی ئاوی کانی زمزم ڕادەگەیەنێ کە وا لە واقیعیشدا نەختێک سوێرە.

نالی کە ئەم «تحدی»یەی واتای ڕواڵەتی وشەکانی کردوە و لە ناو زەرفی هەڵبەستدا نەگونجانی لێ سەندۆتەوە، یەکجار شاعیرانە و ئوستادانە جارێکیان لە واتای وشەی «ملیح» سوودی وەرگرتوە کە وێڕایی سوێرایی، ئەو جوانییەش ڕادەگەیەنێ کە بەتام بێ. لە وشەی زمزمیش سەرەڕای واتای پیرۆزیی و قودسیەتی بیری زەمزەم کە هەموو جۆرە تەشبیهێک بەرەو بەرزیی و پاکی دەبا، واتای زەمزەمەش هەیە کە ئاهەنگ و ستارن ڕادەگەیەنێ. وشەی زمزمی ملیح بە ڕێنووسی کۆن «زەمزەمی مەلیح و زەمزەمەی مەلیح» دەخوێندرایەوە. لەم واتایەدا دەنگی پێکەنینی یار دەبیسترێ کە لە «تبسم»دا پەیدا دەبێ.

صەباحەتی تەبەسوم و پێکەنینت هەمووی ئاوی زەمزەمی بەتامن یاخود هەمووی ئاهەنگی جوان و بەتامە. چەند کارێکی هونەروەرانەیە کە گرژینەوەی زار لە هەمان کاتدا بە سەرچاوەی زمزمێکی بە تام و ئاهەنگی شیرین و بەتام تەشبیھ کرابێ. دەم و زارەکە بە خۆی و ڕوونی و جوانی و تەڕایی کە تێیدایە ئەو زەمزەمە مەلیحەیە کە لە حەوشەی کەعبەدا تەقدیس دەکرێ. دەنگی پێکەنینەکەش وەک ئاهەنگ و مۆسیقا وایە کە زەمزەمە بە دەستەوەی دەدات. کەواتە نالی لە هێنانەوەی «زمزمی ملیح» هەر دەڵێی «کوثری زلالی» هێناوە و لەتەک «صباحتی تبسم»ی داناوە هەرچەند جێگەی «کوثر»ەکەش لە کۆتایی مصرعی دوەمە.

ئەوەی کە لە مصرەعی یەکەمدا لەگەڵ «صباحی تبسم و زمزم ملیح»ی کردوە هەمان فەندیشی بەکارهێناوە لەگەڵ «ملاحتی تکلم و کوثری زلال»لە مصرعی دوەمدا. لە هەمان ڕێگەوە کە تازە بەسەریدا ڕۆیشتین نەگونجان و ڕێکنەهاتنی نێوانی «ملاحە» و «کوثری زلال» دەبنەوە ئەو ڕێکی و گونجان و شیرینی و بەتامییە کە لە نێوانی «صباحە» و زمزمی ملیح»ماندا دۆزیەوە. نامەوێ چیتر خۆم باوێمە نێوانی خوێنەر و نازداریی بەیتەکەوە نەکا بەشێکی دیمەنەکەی لێ بشارمەوە.

لە کۆتایی غەزەلەکەدا وشەی «هزار – هەزار» بە زۆری خەڵقی لێ بەهەڵە دەچن و دەیخوێنینەوە «هزار – هوزار» و وا دەزانن ئەگەر وا نەبێ وشەکە دەبێتە کوردی وەیا فارسی بە واتای ۱۰۰۰.
ڕاستییەکەی، عەرەب کە هاتوە بە بولبولی گوتوە «هزار» وشەکەی لە فارسییەوە وەرگرتوە لە بنەڕەتیشدا هەر ئەو هەزارەیە کە بە ژمارە ۱۰۰۰ دەنووسرێ، مەبەستیش لەو هەزارە ئەوە بوو کە بولبول مەلێکە هەزار داستان و ئاهەنگ دەخوێنێ ئیتر لە بەکارهێناندا هەزار ماوەتەوە. لە بەیتەکەی نالیشدا جوانی

داڕشتنەکە لەوەوە دێ کە «هەزار – هزار» بە واتای بولبول و ژمارەی ١٠٠٠یش دێ چونکە کە بولبول مەبەس بێ دیارە مەشوور ئەوەیە بولبول عاشقی گوڵە، کە ژمارەی هەزاریش مەبەس بێ واتاکە بۆ زۆریی ژمارەی عاشقان دەگەڕێتەوە. بە داخەوە ئەم هەڵەیە لە هەردوو چاپی دیوانەکەی نالی کە لە ساڵی ١٩٦٢ و ١٩٧٤ لە چاپخانەی کوردستانی هەولێر دەرچوە دووبارە بۆتەوە و هوزار نووسراوە بە ڕێنووسی کوردی.

لە دراوسێیەتی وشەکانی بەیتەکەوە نالی بێ ماندوو بوون ئارایشتێکی بە زیادەوەی خستۆتە سەر تێکڕایی جوانی بەیتەکە بەوەدا کە هاتوە سێ پلەی ئەژماری ناوبردوە: کە دەڵێ «روخی تۆ گوڵێکە» لە وشەی گوڵێکە ژمارەی یەک هەیە. دواتریش کە دەڵێ «صەد بەرگ» ژمارەی صەد پەیدایە. زانیشمان ژمارەی ١٠٠٠ لە وشەی هەزاردا ئەو بەرچاوەیە کە باسمان کرد.

کەواتە پلەی یەک صەد هەزار لە خۆوە هاتوونەتە ناو هەڵبەستەوە وەک بەرهەمێکی لاوەکی کە لە ڕواڵەتدا دەخلی نیە بەسەر ناوەڕۆکی هەڵبەستەوە، کەچی بەڕاستی ئەوەندەی بتەوێ هێز و هونەری خستۆتە ناو واتای بەیتەکەوە و بوە بە بەشێکی بنجی ناوەڕۆک و بنگەی مەدحی جوانی ئەو تاکە گوڵە: نالی ڕووی یاری داناوە بە تاکە گوڵ، دیارە تاکو ئەو شتەی وەیا ئەو کەسەی مەدح دەکرێ تاقانە و کەم ئەژمار بێ پەسەندتر و جوانتر دەبێ بۆیەیەی ژمارەی یەک کە لەو کەمتر چنگ ناکەوێ ئە پەڕی مەدحی تێدا بێ، لە ژمارە یەکیش کەمتر بێ دەبێتە کەرتی ژمارە کە شتێکی ناتەواو دەردەچێ.

مەشوورە دەگوترێ «الدر اليتيم – دوری هەتیو» کە بەو لولوە دەڵێن یەک دانەی لە قەپێلکێکدا بێ.
خولاسە یەک بوونی مەدح کراو بنگەی تێهەڵکشانە بۆ مەدح کردن. لە پاش ژمارەی یەک کە تایبەتی مەدح کراوە ئیتر ژمارەکانی تر کە دەبنە بەشێک لە ناوەڕۆک و کەرستەی مەدحەکە هەتا زیاد کەن مەدحەکەش زیاد دەکات. نالی کە هاتوە ژمارەی ١٠ی هەڵبواردوە کە یەکەم پلەی هەوراز ژمارەی یەکە لە پلیکانی «نیزامی دیدەیی» و بازی هاویشتوە بۆ ژمارە «صەد – صەد بەرگ» ویستوەتی مەدحەکەی لەو مەودا کورتەی نێوان یەک و دەوە ڕاگوێزێ بۆ مەیدانە بەرینەکەی نێوانی یەک و صەد.

ئەم «صەد بەرگ»ە دەشێ جۆری گوڵەکە نیشان بدات کە پەڕەکانی صەد ڕیزن و ئێستا لە سلێمانی پێی دەڵێن «شەست پەڕ» هەروەها دەشێ بەو واتایە بێ کە صەد بەرگی جوانی تێ ئالاوە یاخود لە صەد بەرگی جۆر جۆری جوانیدا خۆی دەنوێنێ. بە دوا ژمارەی «صەد» دا ژمارەی «هەزار» هاتوە کە ئەویش پلەیێکی نیزامی دەییە و لە هەمان کاتیشدا ڕێگایەکی دوور لە ژمارە صەد بەرەو هەورازی مەدح تێهەڵکشیوە.

بە دوا ئەم ورد بوونەوەیەدا، سەرلەنوێ، دوو ورد بوونەوەی تری زۆر گرنگ پێویستە کە ئەگەر نەخرێتە بەرچاو بەشێکی جوانی واتای بەیتەکە بزر دەبێ.

لە ڕستەی «صەد بەرگ و هەزاری عاشق»دا داڕشتنەکە هەڵدەگرێ هەزار عاشقەکە هی هەر یەکێک لەو صەد بەرگانە بن نەک تەنها هی گوڵەکە سەرلەبەر. ئەمەیەکێک لە دوو ورد بوونەوەکەیە کە پێی ناوێ پتری درێژە پێبدەین. ورد بوونەوەی دوەم هەندێکی تریش لە تێکڕای مەدحەکە زیاد دەکا.

نالی کە دەڵێ «گوڵێکە صەد بەرگ» جارێ خەریکی خودی گوڵەکەیە و ژمارە یەک و صەدی لە تەکوینی گوڵەکە خۆی وەرگرتوە. بەلام کە دەڵێ «هەزاری عاشق» لێرەدا هۆی مەدحی لە دەرەوەی شەخسی مەدح کراو هێناوە. ئەم ڕاستییەی خزم بوونی دوو ژمارەی «یەک و صەد» و بێگانە بوونی

ژمارە هەزار وای لە واتای بەیتەکە شیرین هێناوە کە مەودای نێوانی یەک و صەد کەمتر بێ لە هی صەد و هەزار، مەبەسم ئەوەیە بڵێم جێی خۆیەتی نێوانی یەک و صەد ٩٩ بێ و هی صەد و هەزاریش ٩٠٠ بێ چونکی گوڵەکە و صەد بەرگەکە بە یەکتر ئاشنا ترن تا صەد بەرگەکە و هەزار عاشقەکە.

خوێنەری بەڕێز ئەم تەرزە وردەکارییەم لێ بە زیاد نەگرێ، لە چەندین کتێبی شەرحی دیوانان شەرحدەرەکان بۆ قوڵایی و بەرینایی گەلێک پتر چوون لەوەی من کردوومە. خۆ ئەوەی ڕاستی بێ لە عاست ئەم بەیتەدا کە وا لێرەدا پێوەی خەریکم جارێ یەک وشەم نەگوتوە لە واتا و جوانی مصرەعی دوەمی بەیتەکە:

لە هەموو چەمەن دیارە بە اصولی نالە، نالی

مەرجە دەست لەم مصرەعە نەدەم و بۆ زەوقی خوێنەری بەجێ بهێڵم، بۆ خۆی بیخاتەوە ڕیزی مصرەعی یەکەم و لە واتا و جوانیەکەی سرنج ڕاگرێ.

وەک لێرەدا بە پێشەوە گوتم بەشێکی بەرچاوی دیوانەکەی نالی بریتیە لەم شێوە شیعرەی واتا سەختی وشە سەرکەشی داڕشتن مەحکەم، وا هەیە غەزەلێک وەیا قەصیدەیێکی سەرلەبەری بەم شێوازە داناوە وەک قەصیدەی:

ئەی جلوە دەری حسن و جلەوکیشی تەماشا
سەر ڕشتەیی دین بێ مەدەدی توو نیە حاشا

وەیا قەصیدەی:

حەلقە دەرگۆشی کەفی ڕەنگینی تۆیە ئەم دەفە
یا نە نالێ، لێی مەدە عن لطمە کف الکفە

ناوناوەش لە غەزەلێک وەیا قەصیدەیێکدا بەیتێک وەیا چەند بەیتێکی لەم بابەتە سەخت و سەرکەشن وەک قەصیدەی:

بولبولی طبعم ئەوا دیسان ثنا خوانی دەکا
نوکتەسنجی بذلەگویی گەوهەر ئەفشانی دەکا

بەشێکی زۆری تێکڕایی ئەم هەڵبەستانە تا ئێستا بە تەواویی، بگرە بە نیوەچڵیش، ساغ نەکرانەوە و واتایان وەک تارمایی دیار و نا دیاری ناو تەم و تاریکاییە. بە نموونە سەیرێکی ئەم دوو بەیتە بکە:

صاحبی علم الکتابە مطربی هودهود نەفەس
یا سلیمانە لە اخوان الصفا اصف صفە

جامی تاقی مەیکەدە مشکاتی قندیلی دڵە
شیشە پڕ قرقف لە ڕفرف شاهی عالی ڕفرفە

دەزانین ئەم «صاحبي علم الكتاب»ە هەمان کەسە کە بە دوا گێڕانەوەی حیکایەتی سەبا و بەلقیس و عەرشە گەورەکەی دا لەلایەن هودهودەوە لەسەر تەکلیفی «سلێمان پێغەمبەر» بە پێی باس کردنی قورئان کە دەفەرموێ «وقال الذى عنده علم من الكتاب اني اتيك به قبل ان يرتد اليك طرفک» هەستا و عەرشەکەی بەلقیسی بۆ هێنا، بەڵێ ئەمە دەزانین، فکرمان بۆ ئەوەش دەچێ کە گۆرانی بێژەکە هودهود نەفەس بێ دەبێ خۆی لە گۆرانیدا وەک هودهود باسی بەلقیس و عەرشەکە و سەبای کردبێ. لە هەمان کاتدا ئەم گۆرانی بێژە هەر خۆی «صاحبي علم الكتابة» واتە یا بەڕاستی یا بە ئاهەنگی گۆرانی عەرشی بەلقیسی حازر کردوە لە کۆڕی بەزم و گۆرانیدا. ئەوەندەش لە بەیتی دوەم هەڵدەکرێنین کە سلێمان–ی پاشا و پێغەمبەر دەبێ لە نێوان «اخوان الصفا – برادەرانی ڕێکی و خۆشی» دا واز لە پاشایی و گەورەیی بێنێ و بێتەوە ریزی «اصف» کە وەزیری خۆیەتی و لە کاتی ڕوودانی ڕووداوەکە ئەو «الذى عنده علم من الكتاب» بوە. لەوەش زیاتر واتا ڕوون دەکەینەوە بەوەدا کە کۆمەڵەی مەشووری «اخوان الصفا»ی سەردەمی عەباسیەکان بە خۆیان و ناوە نەرم و نۆڵ و لە بارەکەیانەوە جێگە هەموار دەکەن بۆ یەکێکی وەک سلیمان پێغەمبەر کە بەهۆی چوونە ناو ریزیانەوە ئەویش ببێتە ئەندامێکی ئەو گروپە چاک و دڵپاکە و خۆی بە هاوڕێی اصف بزانێ.

جارێکی تریش لە مەبەس نزیک دەبینەوە کە دەزانین لە نێوان «اخوان الصفا»دا پیاوێک هەیە ناوی «ابو سلیمان»ە، لەمەوە بە جارێ «سلیمان پێغەمبەر» ئەندامەتی گروپی «اخوان الصفا»ی لێ دەبێتە بەشێکی کەسایەتی ڕاستەقینە، نەک لە ڕێی تەشبیە و مەجاز و واتا تێکهەڵکێشانەوە. ئەمانە و شتی تریش هەن لە بەیتەکەدا کە ڕێی پێ دەبەین و تێی دەگەین و حیسابی بۆ دەکەین و جێگەیشی لە پەراوێزی واتایدا دەکەینەوە، بەڵام دیسان جارێ دوورین لەوپەڕی واتاکەی چ دووریی ئاسۆیی بێ بەرەو پانایی، چ دووریی ستوونی بێ بەرەو بەرزایی وەیا قوڵایی بەیتەکە. لە بارەی بەیتەکەی تریشەوە:

جامی تاقی مەیکەدە مشکاتی قندیلی دڵە
شیشە پڕ قەرقەف لە ڕەفرەف شاهی عالی ڕەفرەفە

دەزانین جامی تاقی مەیخانە وەک «مشکاتی قندیل»ی دڵ وایە: خوا لە قورئاندا بە نوری خۆی گوتوە «مثل نوره كمشكاة فيها مصباح» کەواتە شەرابی ناو جامەکەی مەیخانە وەک «قندیل – مصباح»ی ناو «کمشکاة»ەکە وایە بۆ دڵی نالی، دیارە ئەم شەرابە هەمان شتە کە پێی دەڵێن «خمرة الحب الالهي» و لەوەوە ئاشکرایە کە نالی خەیاڵێکی متصوفانەی هێناوەتە ناو هەڵبەستەوە. لە بەیتی دوەمیشدا «شیشەی پڕ قەرقەف» هەر ئەو جامە پڕ شەرابەیە کە لە تاقی مەیخانەدا وەک مشکاتی قندیلی دڵ بوو، وشەی «ڕەفرەف – ڕفرف» ئەویش هەڵدەگرێ «رفرف» بێ کە وشەیێکی عەرەبییە و واتاکەی لە فەرهەنگی «المنجد»دا بە چەند شتێک لێکدراوەتەوە یەک دوانێکیان مناسبی واتای بەیتەکەن:

١– الرفرف ما تهدل من الشجر و والنبات – واته ئەو درەخت و گیایە کە شۆڕدەبنەوە.
٢– البساط، الفراش، الرقیقی من ثیاب الدیباج. هەڵیش دەگرێ «رەف، ڕەف» بێ کە دووبارەکردنەوەی وشەی «ڕەف – ڕەفت، تاق» ە. شاهی عالی رفرف دەشێ خاوەن مەیکەدەکە بێ لەوە بەولاوە مومکینە بگەڕێتەوە بۆ «شیخ الطریقة» و پێشەواکەی ئەو تصوفە کە لە «الخمرة الالهیة» بۆمان دەرکەوت یاخود هەر خوا خۆی بێ کە لە ڕاستیدا ئەو ڕووناکی ناو «کمشکاة» و قندیلەکە بوو.

وشەی ڕفرف لە قورئاندا بۆ مەزرای ناو بەهەشتیش بەکار هاتوە کە ئەمە زیاتر واتاکە بەرەو خوا دەگێڕێتەوە، بەڵام کە وشەکە بکەیتە «رەف، ڕەف» کە ڕەفت و تاقەکانی مەیخانە نیشان دەدەن و شیشە پڕ شەرابەکانیان تێدا دانراوە، ئەوسا زیاتر بۆ پیری موغان و خاوەنی مەیخانەکە لەبارتر دەبێ. بە ورد بونەوە گەلێک شتی تریش لە بەیتەکەوە خۆ دێننە بەر چاوی زیهنەوە، لەگەڵ ئەمشدا هێشتان دوورین لە واتای تەواو و شێوەی ڕاستەقینەی ناو بەیتەکە.

من جارێ بەڕێوەم لە گەشتی بەرەو کۆتایی و ئەنجامی ئەم بەیتانە. بێگومان نالیش لە دەمی هۆنینەوەیاندا هەستی کردوە بە زەحمەتی و سەختی و سەرکەشییان، هەر بۆیەیشە لە کۆتایی قەصیدەکەدا دان بەو توندی و ڕەقییە دادەنێ بەڵام یەکجار ئوستادانە توندی و ڕەقییەکە دەکاتەوە بنگەی مەدحی خۆشەویستەکەی وەیا گەورەیی سەرچاوەی تصوفەکە:

طبعی نالی توندە ئەمڕۆ یا بە نەشئەی نیم نیگاھ
مەستی «رحراح» و مەی و «راح و قراح و قرقف» ە

سەیری چۆن نیم نیگایێکی دۆستەکەی (وەیا نیم نیگای تجلی خودا وەیا توجهی ڕابەری تەریقەت) کردۆتە هۆی مەست بوونێک کە لەو پێنج شتەی ناوی بردوون پەیدا دەبێ هەموشیان بە واتای شەرابن. دیارە ئەگەر ڕێی تەصوفی تێدا بگرین هەر پێنج شەرابەکە دەبنەوە شەرابی ئیلاهی. ئەم بەیتە لە نوسخە چاپەکانی دیوانی نالی بە هەڵە نووسراوە، چی لێرەدا نووسراوە ڕاستی بەیتەکەیە، بە ئانقەستیش وشەکانی «رحراح، ڕاح، قراح، قرقف»م خستە ناو جووت کەوانەوە تاکوو باشتر بخوێنرێتەوە و بشزانرێ کە ئەمانە وشەی عەرەبین و تەنها وشەی «مەی» لە بەیتەکەدا فارسی وەیا کوردییە.

من گەلێک جاران ڕای خۆم دەربڕیوە لە عاست شاعیریەتی نالی و چی باوەڕم پێی بوە ئەوەم گوتوە دەربارەی، لێرەدا ئەوەندە دەڵێم، وەیاخود باشترە بڵێم دوبارە دەکەمەوە، ناتوانین پایەی ڕاستەقینەی بلێمەتی نالی دەستنیشان کەین ئەگەر:

١– کات و زەرف و باری ژیانی خۆی و هی هەڵبەستەکانی بە چاکی نەزانین.
٢– هەموو گەوهەرەکانی لە قتووی هەڵبەستەکانی دەرنەهێنین.
٣– بەتایەبەتی ئەگەر هەڵبەستە سەخت و سەرکەشەکانی لە هەموو ڕوییێکەوە شی نەکرێنەوە و مەهارەتی داڕشتن و تێکهەڵکێشان و پاراستنی مۆسیقا و تێبردنی زەقی و ڕەقی لەو هەڵبەستانەدا با چاکی ڕوون نەبێتەوە.
٤– بە شاعیرە مەشوورەکانی کورد و غەیری کورد نەگیرێ بۆ بەراوردیی کردن لە نێوان چەند و چۆن و شێواز و تصور و وردەکاریی و هەموو سەروبەرێکی هەڵبەستەکانی ئەم و ئەواندا، چونکە جوانی وەیا

گەورەیی وەیا مەهارەت وەیا هەر ڕەوشتێکی تر بێ بە بەراورد کردنی لەگەڵ خۆیدا دەرناکەوێت. تۆ ناتوانی بزانی قورسایی شتێک چەندە ئەگەر بە تەرازوو هەڵینەکێشیت.

بێگومان ئەم کارەش بەندە بە چەند شتێکەوە:

یەکەم: ڕاست کردنەوەی هەڵەی دیوانەکەی.

دوەم: تۆژینەوەی مێژوویی لەو ڕووداوانەی کە لە سەردەمی نالی ڕوویان داوە لەو جێگایانە کە خۆی تێیاندا ژیاوە لە کاتی ڕوودانەکەدا.

سێیەم: هاریکاریی گشتی نێوان هەموو ئەو ئەدیبانە کە سەرەدەریی دەکەن لە شیعری نالی وەیا شاعیری وەک نالی، کە ئەمەش پێویستی هەیە بە شارەزا بوون لە ئەدەبی ئیسلام بە شێوەیێکی فراوان، تا بشلێی ئەرکەکەی گرانە.

چوارەم: بڵاو کردنەوەی شیعری بڵاونەکرایەوەی نالی. بێگومان ئەو هێندە شیعرەی کە لە دیوانەکەیدا هەیە بەشێکە، یا کەم یا زۆر هەرچەند مەیلم بۆ ئەوە دەڕوا بڵێم «کەم»، لە هەموو شیعرەکانی چونکە ناچێتە عەقڵەوە نالی لە ڕێی ئەو میقدارە کەمەوە گەیشتبێتە ئەم میقدارە زۆرە لە بەرزیی و قووڵی و سیحردا.

وەک ئاشکرایە ڕۆژ بە ڕۆژ ئەم ئەرکەی شیکردنەوەی شیعری نالی بەرەو زەحمەتترییەوە دەڕوات چونکە ئاشنایانی ئەم جۆرە ئەدەبە کەم دەبنەوە و بابەتەکەشی بێگانەتر دەبێ بەلای چینی تازە پێگەیشتوودا. بۆیە ئەگەر کەس هەیە خۆی بە دڵسۆزی ئەدەبی نالی بزانێ، خێرا خێرا شارەزایی خۆی بە شیعری نالی بخاتە بەرچاوی نالی دۆستانەوە، چی لە شیعر و خەبەر و بەسەرهاتی نالیش دەزانێ ئەویش بەم بازاڕەی «نالی زانی»یەوە ڕابگەیەنێ.

ئێستەکەش فرصەتە گەلی یاران<br>
کەپەنەک بۆ چییە لە پاش باران

لێرەدا بە ناچاری گوتارەکە کۆتایی دێت چونکە دوا بڕیاری لیژنەی گۆڤاری کۆڕ ئەوەیە گوتار زۆر لە پەنجا لاپەڕە تێپەڕ نەکات.

چەند لایەنێکی باسەکە مایەوە بۆ دەرفەتێکی تر، بە تایبەتی باسی ناوەڕۆک لە شیعری نالیدا کەوا لە یەکەم ئاڵقەی زنجیرەی گوتارەکانەوە بوە بە قەرز بە سەرمەوە ئیتر یا لە ئاڵقەیێکی تردا پێشکەش دەکرێت یاخود دەبێتە ئاکامی کتێبێک کە بە پێشەکییەکەوە زنجیرەی گوتارەکان کۆ دەکاتەوە بۆ ئەوە ئیمکان هەبێ بەسەریەکەوە بخوێنرێتەوە، ئەوەی ژمارەکانی گۆڤارەکەشی چنگ نەکەوتوە بتوانێ لەم کتێبەدا گوتارەکان ببینێ.

دەمەوێ عوزرێک بخوازمەوە لە خوێنەرەوەی ئەم گوتارانە عوزرەکەش دوو لاییە: یەکیان لەوەدا کە وەها بوە شیکردنەوەی بەیتێک لە بەیتەکانی نالی بۆ خۆی پێویستی بە شیکردنەوە هەبوە. لەمەدا نەختێک خۆم خەتابارم کە دەبوو ڕستەی ئاسانتر بدۆزمەوە بۆ ڕاگەیاندنی مەبەست، نەختێکیش خەتاکە دەگەڕێتەوە بۆ زەحمەتی ئەو فکر و داڕشتن و وێنەکێشانەی کە نالی بەیتەکانی پێ فرووسماندوون.

لایەنی دوەمی عوزرەکەش بۆ ئەمەیە بەشێک لە نموونەکانی شیعری نالی کە لە کۆتایی ئەم ئاڵقەیەدا

هاتوون بە تەواوی شی نەکراونەوە و بەجێهێڵراون بۆ سرنجی خوێنەران، بۆ سرنجی خۆشم کە لە دوارۆژدا پێیانەوە خەریک بم. ئەوەی ڕاستی بێ دەمتوانی بە دوو جۆر لەم عوزرهێنانەوەیە خۆم ڕزگار کەم بەڵام نەمکرد. یەکەمیان بەوەدا کە نموونەکانم نەهێنایەوە. دوەمیشیان لە ڕێی وشەبازیی و چاوبەستەکێوە نوقسانی واتاکان تێببەم وەیا بیشارمەوە. لەم چاوشارکێیەدا نە کەس سوودمەند دەبێ نە منیش لە خۆم گەورەتر دەبم، ئیتر خۆ لێ بەسەهوو بردن و خۆ لێ گێل کردن بۆچی بێ!

گەلێ تکای تریشم هەیە سەری خوێنەریان پێ نائێشێنم بەڵام چارم ناچارە داوایان لێ بکەم بەیتێکی بە هەڵە نووسراوی ئالقەی دوەمی گوتارەکەم بۆ ڕاست کەنەوە: لە لاپەڕە ١٢٧ ی ئەم کتێبەدا بەسەر ژمارە ١٠ ی زنجیرەی نموونەکانەوە ئەم بەیتە بە هەڵە نووسراوە:

عاشقی صنعی حەقم قوربانی دەستی قودرەتم
چاوی ماویی خاڵی شین کوڵمی سپی زولفی سیا

ڕاستی بەیتەکە ئەمەیە:

عاشقی صبغی حەقم قوربانی ڕەنگی قودرەتم
چاوی ماویی خاڵی شین کوڵمی سپی زولفی سیا

ئەم دوو سەهوە یەکێکیان هەڵەی چاپە یەکێکیشیان پەلەی منە.

نالی لە زەمینەی عوزری گوناهان ئەم بەیتەی خوارەوەی گوتوە، منیش لێرەدا دەیکەم بە گوڵاوپژانی ئەم بەشەی گوتار و هۆی دەردەست کردنی بەخشین و چاوپۆشیش لە خوێنەرانەوە:

خوشترە عوزری گونەهکاران لە صەد زکری ریا
ئەم بەنەرمی «عفو، عفو» ە ئەو بە توندیی عەفعەفە

## بەشی چوارەم

لە سێ بەشی لێرە بە پێشەوەی ئەم نووسینەدا، بە دەم شیکردنەوەی تاک تاکە بەیتی دیوانەکەی نالییەوە، چەند جاران بە پێش دەرفەتی گوتار هەوڵم داوە ئەو تایبەتیانە دەربخەم کە نموونەکانی شیکردنەوە ڕایان دەگەیەنن وەک: تایبەتی لەنگەربەستن و پارسەنگ بوون، فرەواتایی، نەرم کردنی وشە و تەعبیری سەخت، وێنەگریی، پەیوەست بوون بە کۆمەڵایەتی و خاسیەتی ئەوتۆیی. ئەم بەرەنگاربوونە لە منەوە بۆ خاسیەت و تایبەتی شیعری نالی هەر ئەوەندە ئازاییە و هەڵمەت بردنەی تێدایە کە ئامانجە بچووکەکەی ناو عینوانی «چەپک...» لێمی داخوازی دەکات. من چەپکم هەڵبەستوە، باغم هەڵەڕن نەکردوە، پێشم هەڵەڕن ناکرێ... واشدەزانم بە کەسی تەنها کەس ناکرێ.

ئەوەی ڕاستی بێ، لە بێژنگ دانی دیوانەکەی نالی بە نیازی وەدەستهێنانی هەموو سامانەکەی گەلێک لەوە ئەستەمترە کە ڕواڵەتی «مامڵەت لەگەڵ وشە» نیشانی دەدات، چونکە وەک بۆ چاوی وردبین و زەینی بەبڕشت دەردەکەوێ نالی «وشەسازی» عادەتی نەکردوە، «واتاسازی» عادەتیشی نەکردوە، ئارایشتی حازربەدەستیشی بەکار نەهێناوە، فەند و فێڵە ساکارە میراتیەکەی شاعیرانیشی نەگرتۆتە بەر. کە ئەمانەی نەکردوە بەوەندەش ڕازی نەبوە شێوە بەرزەکەی لە عادەت بە پشتەوەی ئەم هونەرانەش بکا بە ناواخنی هەموو شیعرەکانی، وێڕای ئەمانە نالی کاری گرنگتر و هونەرکارانەتر و ساحیرانەتریشی کردوە.

نالی بە ناو ڕایەڵی ئەو هونەرە بەرزانە و هی تریشدا هاتوچۆی بە زاتە هەستیارە جۆشاوە سیحربازە دەستڕەنگینە بلیمەتەکەی خۆی کردوە و بەهۆی دەسەڵاتی هونەرمەندانەی یەکجار دەوڵەمەندیەوە لە ناخی دڵ و قوڵایی گیانەوە کلافەی ڕەنگاوڕەنگی ئاوێتە لە سۆزی ئاگرین و پوختەیی تێروتەژیی لەو ڕایەڵانە ئاڵانداوە و پارچە هەڵبەستی گەوهەردار و ئاورینگاریی لێ هۆندوونەوە، هەرگیز داوی کلافەکانیشی کورتیان نەهێناوە بەبەر قەڵافەتی پەیکەری خولیاوە، من و تۆش لە دەرەوەی تان و پۆی

تەلیسماویی سیحرهۆنیەوە دەمەتەقەی عادەتی ئەدەبی لەسەر هەڵدەستێنین و بە زمانی سافیلکەی شیعردۆستانەمان مەعنای سەراو و پڤدراو بەسەر ورشە و تریفەکانیدا گلۆر دەکەینەوە، هەر دەڵێی ئێمەین نالی بە تەورییە و تەشبیهـ لەم بەیتەدا وێنەی هەرزەکاریمان لە مەیدانی دوڕناسیدا لە ڕێی کامێرای وشەوە دەکێشێت

منجم کەر گەس و «لاشی» لەکن شەیئێکە نەیزانی
کە ئەم ئەفلاکە چەند لاکە کە ئەم گەردوونە چەند دوونە

بێ هەموو مەبەستێکی پێداهەڵگوتن و بەرزکردنەوەی نمایشتکارانە دەڵێم «نالی» بەڕاستی ئوستادی شیعرە، ئەو ئوستادەی کە بەشاعیری تری بگرێت لەوانەیە پێی نەڵێی شاعیر چونکە هونەر و تەعبیرێکی ئەو بەکاریهێناوە کالای تاک تاکە هونەرمەندی بلند پەروازە کە سێبەری بەسەر مەڵبەندی شیعری عادەتیدا دەکشێت. دەزانین سەرەژوورچووون خۆی لە خۆیدا کارێکی بین برە، ئەی بە باری گەوهەرەوە بەرەو تۆقەڵەی هەرەبەرزی ئاسۆی هونەر؟

تا سنبولی زولفت لە نیهالی قەدت ئالا
من دوودی هەناسەم گەییە عالەمی بالا
من گریە وەتۆ خەندە بە یەکدی دەفرۆشین
من لەعلی بەدەخشان و ئەتۆ لوئلوئی لالا
طورڕەت وەکو تۆماری شکستە و سەری کوڵمت
بۆ نوری سەودام بوەتە شەمعی موتالا
ئەو چاوە غەزالە فەتەراتی سەر و ماڵە
ئەو نیرگسە کاڵە نە منی هێشت و نە کالا
شیققەی فەلەکولئەتلەس و ئەستوونەیی زەڕڕین
بێ بیکە بە تارایی سەر و سرکەیی والا
نالی بە ئومێدی زەفەری تەوقی تەڵەسمت
ماری سەری زولفت لە سەر و گەردەنی ئالا

تاکە بەیتێکی ئەم برە شیعرە «شیققەی فەلەکولئەتلەس...» بەر لە سی ساڵ زیاتر سەرچاوەی ئیلهامی جوانەمەرگ «دڵدار» بوو لە دارشتنی بەشێکی غەزەلە درێژەکەی «خەندەکەی بایی...» لەو شوێنەدا کە دەڵێ:

دەهەڵسە با بیناکەین مەعبەدی پیرۆزی دڵداریی
لە تیشکی ڕۆژ لە شەوقی مانگ لە ڕەنگی پەلکەڕەنگینە

لە پۆلی سێ وەیا چواری حقوق بەیەکەوە لە ژوورێک بەسەرمان دەبر کە تریفەی خەیاڵی «خەندەکەی

بایی» لە گۆشەیێکی هەست و سۆزی دڵدارانەیەوە هەڵڕژایە ناو هەڵبەست و ئاورینگێکی ئاسمانی نالی لەم بەیتە دەست نیشان کراوەوە کە دەمێک بوو ئاسۆی خەیاڵی «دڵدار»ی هەڵایساندبوو شکایەوە بەسەر هەڵبەستەکەیدا. من لە ژان و ژواری ئەم غەزەلەی ئاگادار بووم، ناوناوە پرسێکی برادەرانەی پێ دەکردم لە هەڵبژاردنی وشەیێک و بەلاوەنانی وشەیێکی تر بۆ ڕێک هاتنی هارمۆنی واتایی و وشەیی.

لە بیرمە ویستی لە جێگەی وشەی چەپک لەو دێڕە شیعرەدا کە دەڵێ «کە هەر چەپکەی خەمی مل کەچ...» وشەیێکی لەبارتر بدۆزێتەوە کە تاکە یەک تاڵی وەنەوشە بە دەستەوە بدات نەک یەک بەستە، بەڵام نە خۆی پێی دۆزرایەوە نە منیش توانیم یارمەتی بدەم... هەر لە بیرەوەری ئەو ڕۆژانەی بەیەکەوە ژیانمان، یادی گوتەیێکی تری دڵدار دەکەمەوە کە دەیگوت حاجی قادر لە بەهاریەکەیدا شوێن پێی «قوربانی تۆزی ڕێگەتم...»ی نالی هەڵگرتۆتەوە و ئەوسا من ئەمەم لە دڵدار نەدەسەلماند، کەچی ئێستا وەک بەدیهیە ئاشکرایە لەبەرچاوم چی دڵدار دەیگوت ڕاستە هەروەک ڕاستە کە شەوە مەشوورەکەی «مصباح الدیوان»یش لە قەصیدەکەی «مستورە»ی نالییەوە گەشاوەتەوە کە لە مەشدا نەکەمایەتی و نە هیچ ڕەخنە لێگرتنێکیش یەخەگیری حاجی و مصباح دەبن.

گەلێ جار شاعیر بە نیازی خۆ تاقیکردنەوە نەک هەر ئیلهامی گشتی لە قەصیدەیێکی مەشوور وەردەگرێ بەڵکو لە کێش و قافیەی قەصیدەکەشەوە شیعر هەڵدەبەستێ کە ئەمەش لە عەرەبیدا پێی دەڵێن «معارضە»... هەر نەیسە!

بەڕاستی کە بمانەوێ هەموو تایبەتیەکانی شیعری نالی بژمێرین و یەک و دوو و سێی لێ بکەینەوە زنجیرە دەبێ بە ژماراندا بڕۆین و ڕیزیان کەین چونکە پڕ سامانیی شیعرەکانی لەوانەیە بەیتا و بەیت خاسیەتی نوێ بە دەستەوە بدەن لەو ڕووەوە کە زەینی تیژ و سەلیقەی سازگار و تێگەییشتن و پێگەییشتن بە بەریانەوە هەیە دەم نادەم ئاوس بن و لە نۆژەن بزێنەوە بە بەرهەمێکی بێ سابیقە. لە مەیدانی فیکردا، کە داهێنان پێویستی بە کەرستەی مادی دەرەوەی ویژدانی خاوەنەکەی نیە، ئەوەش پێی دەڵێن «عبقریة – بلیمەتی – هەڵکەوتوویی» لە هەنگامەی جۆش و خرۆش و کوڵان و وروژانی عەمەلیەتی یەق کردنەوەدا جار لە جارێ وێنە و ورێنەی تازە لە خۆیدا دەدۆزێتەوە، وەیاخود ڕەنگە ڕاستتر ئەوەبێ بلێم توانای خەڵق لەو بلیمەتیەدا، بێ پەک کەوتن لەسەر نموونە و پڕۆڤە، مۆدێلی هونەراویی نوێکرد دەکا بە بڵقی جۆش و کەفوکوڵی خرۆشان کە چ ئەرکی ڕێکخستن و گونجاندن و هەناسەسواری تێدا بە خەرج نەچوە هەروەک قوڵپی بورکان پەیتا پەیتا لە جەهەنەمی دەروونیەوە بە پاڵەپەستۆی سروشت بەڕێ دەکرێ. زۆر بە سەیری، لەم کاتەدا، وا دەزانم نالی مەبەستی وێنەکێشانی ژان و ژواری عەمەلیەتە پڕ تاولەرزەکەی ترکانی پزدانی هونەرگەی خۆی بوە لەم دواندنە بلێسەدارەدا کە لەگەڵ «بادی خۆش مرور»ی کردوە:

گاهێ دەبی بە دەم دەدەمێنی دەمی غرور

چونکە ئەگەر لە کولانەی نەفسی خۆیەوە سەیری بای نەکردبێ و تێکهاویشتن و چەخماخەی فرتەنەی ناو ئەو نەفسەی بە بایەکە نەبەخشیبێ، بای کەڕ و لاڵ لە خۆوە چ ناکات و چ دەمان نادەمێنێ، دواتریش نازانێ بەرەو شارەزوور بێتەوە و قرچەی هەناوی نالی لە هەناوی خۆیدا هەڵگرێ بە چرە دوکەڵی سووتانی غوربەتەوە لەگەڵ بادەی پڕ فرمێسکی تلانەوە بە دەست سۆز و بێ ئۆقرەییدا بیکا بە دیاری یادکردنەوەی بریندار و بە سفتوسۆ:

سووتا ڕەواقی خانەیی صەبرم دڵ و دەروون
نەیماوە غەیری گۆشەیی ذکرێکە یاصبور
هەم هەمعینانی ئاهم و هەم هەمریکابی ئەشک
ڕەحمێ بەم ئاه و ئەشکە بکە هەستە بێ قصور
وەک ئاهەکەم دەوان بە هەتا خاکی کۆیی یار
وەک ئەشکەکەم ڕەوان بە هەتا ئاوی پردە سوور
بەو ئاوە خۆت بشۆ لە کدوراتی سەرزەمین
شاد بن بە وەصلی یەکدی کە تۆی «طاهر» ئەو «طهور»

ئیتر بە دەم هەنیسکی گریانەوە ڕاسپاردەی دڵی هەڵقرچاوی بۆ هەموو دار و بەرد و شیو و کانی و شار و دێی وڵات تەسلیم بە با دەکات تا لە کۆتایی شیوەنی هەڵبەست ئەم چەند دڵۆپە فرمێسکە گەرم و گەورەیە لە جێی مۆر و ئیمزادا دادەنێت:

زارم وەکو هیلال و نەحیفم وەکو خەلال
ئایا دەکەومە زار و بە دڵدا دەکەم خطور
لەم شەرحی دەردی میحنەتە لەم سۆزی غوربەتە
دڵ وەختە بێ بە ئاو و بە چاوما بکا عبور
ئایا مەقامی ڕوخصەتە<٧> لەم بەینە بێمەوە
یا مەصلەحەت توقفە تا یەومی نەفخی صور

وەک دەزانین، مەصلەحەت و نامەصلەحەت، تا ڕۆژی فوو لە صور کردن ئەو «توقف»ە دامەنی نالی گرت و بەری نەدا، خۆی و حەسرەت و سۆز و سووتان و غەریبی، هەموویان بە گەرووی عەدەمدا چوونە خوارێ، مەگەر گڕ و گەرمایی لە فرمێسک و هەناسەی من و تۆدا تارماییەکیان بێنێتەوە سەر دنیای ڕوون.

قسەم لەوەدا بوو کە ژماردنی تایبەتی لە بەرهەمی بەردەوامی «عبقریە – بلیمەتی» وەک نامومکین وایە چونکە جار لە جار خۆی نوێ دەکاتەوە و بە پێی نوێ بوونەوەش تایبەتیەکانی زیاد دەکەن. نەزۆکیی و خۆکوتانەوە و دووبارە کردنەوە لەو جۆرە یەق کردنەوەیەدا دەبێ کە بە فکری قاڵب گرتوودا بێت وەیا لە ئاکامی کێشان و هەڵسەنگاندنی ژیربێژانەوە «منطقي» زەنە بکات. گەلێک جار ئەم خۆهێنان و بردنە ژیربێژانە بە دوا واتای کێوییدا وا دەکا لە قەصیدەدا «وحدە» نەمێنێ چونکە جوانکاریی لە جیهانی زانستدا، ئەو زانستەی بەرگی هونەر لەبەر دەکا، نەفسی کورتە وەک هەناسەی هەناوێکی سووتاو نیە کە سات لە سات بلێسەی زمانە درێژتر دەکا. سەیرێکی دیوانەکەی نالی بکەیت دەبینی زوربەی هەڵبەستەکانی «وحدە»ی تێدایە، لە ناو ئەو زوربەیەشدا بەشێکی بەرچاوی لە سەرەتاوە تا کۆتایی دەوری تاکە یەک فکرە هەڵدێت. ئەم غەزەل و قەصیدانەی وا لێرەدا سەرەتاکەیان دەنووسم نموونەی هەڵبەستی «وحدە»دارن لە دیوانی نالی:

پێم دەڵێن مەحبووبە خێل و قیچە
ئەی جلوە دەری حوسن
ئەحوەلی تەفرەقە نەزەر
طەبعی شەککەر باری من
بولبولی طەبعم
جانەنی وەک جینان کردم
ماتەم وەکو زولفەینی سیەهـ
ئیلتیقای پۆلا و ئاسن
قوربانی تۆزی ڕێگەتم
هەی کەرێکم بوو
کە تۆ هاتی لە «نەوم ی دی» نەومیدیی نەما باس
لە کن ئەو جەوهەرە فەردە
مووی سپی کردم بە شوشتن
ئەی شۆخی بێناز
گەر دەپرسی من لەبەرچی کەم دەخۆم

ئەمانە کە لە یەکەم سێیەمی دیوانەکەیدا دێنە بەرچاو، دەیان هەڵبەستی تریش دوای ئەمانە، هەموویان خەریکی تاکە فکرەن. سەرلەبەری موناجات و نەعتەکانی کە لە چەشنی قەصیدەی درێژ دەژمێردرێن ئەوانیش «وحدە»ی تەواو و بێ کەلەبەریان هەیە. «مەستورە»ش پێویستی بە باس کردن نیە.

دابەشبوونی دیوانی شاعیر، نالی و غەیری نالی، بۆ هەڵبەستی «وحدە»دار و هەڵبەستی بێ «وحدە» دەخلی نیە بەسەر فکرەی «تایبەتی»یەوە، چونکە وحدە پێوەندیی بە هەموو قەصیدەوە هەیە لە لایەن دروست بوونیەوە کە لە عەرەبیدا پێی دەڵێن «بناء القصيدة» بەڵام «تایبەتی» لە ناو قەصیدەی بە وحدەوە و بێ وەحدەدا دەتریسکێتەوە و لەوانەیەی شاعیر پێی بناسرێتەوە. لەگەڵ ئەم ڕاستیەشدا ئەوەندە بەسە بۆ نرخی زۆربوونی «وحدە» لە شیعری شاعیرێکدا کە بەڵگەیە بۆ پڕبوونی مێشک و بڕندەیی سەلیقە و جۆشی دەروون.

یەکێک لە تایبەتیە هەرە بەرچاو و ڕەسەن و ڕەگداکوتاوەکانی نالی ئەوەیە کەوا وەک ساحیر لە کەوانەی یەک وشەوە چەند تیری واتا دەهاوێژێ. هەریەک لەو تیرانەش ئامانجی سەربەخۆی خۆی هەیە لەهەڵبەستدا. گوم کردنی ئەم دیاردەیە بەشێکی یەکجار نرخدار لە شاکارەکانی نالی تێدەبا و ئەدەبەکەشی دادەلەنگێنێ، بەمەشدا کەلەبەرێکی گەورە دەکەوێتە نەخشەی سەرجوملەی ئەدەبی کوردیی بەرزەوە. دەست پاراستن لە کوژاندنەوەی ئەو گەوهەرانە دەستخاوێنی و ئەمەکدارییە بەرانبەر هەموو ئەدەبی کورد. هەر یەکێک لە ئێمە کە دەستی نەڕۆییشت فتیلەی چراکانی نالی بەرزترکاتەوە وەیاخود ئاگرێک بە فتیلە هەڵنەکراوەکانیەوە بنێ چ گلەیی نایەتە سەر بە مەرجی «دەست نەڕۆییشتن و نەتوانین» چونکە دیارە تەکلیفی لە توانابەدەر لە کەس ناکرێت. ئەوەی دەستی بڕوا و دەستەکەی خۆی کۆتا کاتەوە گلەیی کەمتەرخەمیی و گوێ نەدان و بێباکی دەهێنێتە سەر خۆی. ئەوەی دەستی کوژاندنەوەی ئانقەست

درێژ کات دەبێتە دژ و ناحەزی بێ دەمەتەقەی ئەدەبی کوردی. ئەم ڕاستییانەش کە هەمووی ڕوو لەو کەسانە دەکات کەوا لە ڕیزی «سلبی» دەوەستن یەک زەڕرە لە گوناهی ئەو کەسەش کەم ناکاتەوە کە لە لاوە فتیلەی هەڵکراو بێنێ بۆ ناو هەڵبەست هەرچەند لە ڕیزی «ایجابی»ش وەستابێ.

لێرەدا یەک دوو نموونەی پێوانەی ئەم ڕایانە دەکەین بە حەکەم: نالی دەڵێ:

نەی کە صاحیب سیرڕە سەرتاپا بە «ایە»ی کن کونە

باطنا «قف قف علی سری» بە زاهیر قەف قەفە

لە پێشەوە با سرنجی خوێنەر بۆ وشەی «ایە» ڕابکێشم کە لە بەیتەکەدا «ایە» نووسراوە نەک «ایە» کە بە کوردی ئایەت دەنووسرێت. ئەگەر لە بەیتەکەدا «ئایەتی کن» با، ڕێی ئەو واتایانەی تری دەبەستەوە کە دەڵێم لەیەک کەوانەوە بەرەو ئامانج دەڕۆن. دیارە لەم بەیتەدا کێش ڕێ نادات «ئایەتی کن» بگوترێ چونکە لەنگی دەکات.

تۆ نەختێک زمانی خۆت ڕەهاکە لەو گرێیەی کە نووسین پەیدای دەکا لە خوێندنەوەی گوتەی نووسراودا، خەریکی گوتنەوەی بەیتەکە ببە وەک کە لە زارەوە دەدرێت، دەبینی مومکینە وەها بخوێندرێتەوە:

نەی کە صاحیب سیرڕە سەرتاپا بە ئایای کون کونە

دەزانیت «ئایای» یەکێکە لە گۆرانیە مەشوورەکانی کوردیی وەک خاوکەر و خورشیدیی و ئەڵڵاوەیسی و تێکهەڵکێش. کە وشەی «ئایای» هاتە ناوەوە ئەوسا دەبێ ڕستەی دواتر ببێتە «کونکونە» کە کوردی پەتییە لە حاڵێکدا کە وشەی «ئایە» بە واتای ئایەتی قورئان بەکاربێت دەبێ ڕستەی دواتر ببێتە «کن کونە» کە یەکەمیان «کن»ی عەرەبییە لە «کان» وەرگیراوە و مەبەستیش لەوەدا ئایەتی «کن فیکون»ە دوەمیشیان «کون»ی کوردییە کە دەزانین حاڵی بلوێر باس دەکات بە خۆی و کونەکانیەوە.

نالی لە کەوانەی وشەی «ئایەی – ئایای» دوو تیری واتای هاویشت یەکێکیان لە قورئانەوە بەر نیشانەی «کن فیکون» کەوت ئەویتریشیان لە گۆرانی کوردییەوە قەد و باڵای بلوێری پێکا کە سەرتاپای «کون کونە».

تارمایی واتایەکی تریش لە بەیتەکەوە بەرەو نیشانەی «کون کون» دەڕوات کە بێین وشەی «ئایەی – ئایای» پتر لەبەریەک هەڵوەشێنین و بڵێین «ئای ئای» کە هاواری دەردەدارە بە دەست ئێشەوە. «ئای ئای» بەبەریەوە هەیە مشتوماڵێک بدرێت و هەمزەی دوەمی بسوێت و بگوترێ «ئایای» کە هەر واتای تلانەوە بە دەست ئێش و ئازارەوە ڕادەگەیەنێت. لەمەوە دەزانین بەیتەکەی نالی لە کەوانەی تاکە وشەیێکەوە سێ تیری واتای هاویشتوون:

نەی بە ئایەتی «کن فیکون» کون بوە

نەی بە ئاهەنگی «ئایای» کون کون بوە

نەی بە ناڵەی «ئای ئای» کون کون بوە

لەم لێکدانەوەیەدا پەردە لە رووی گەوهەرەکانی نالی هەڵدراوەتەوە و بەس، لە لاوە واتای بۆ قەرز نەکراوە، هەر جۆرە ئیعترازێکیش لەم شێوە لێکدانەوەیە بگیرێت سووچی بەیتەکەی نالی و بۆچونەکەی من نیە، سووچی کەم ئاگاداری ئیعتیرازگرەکەیە لە فەند و فێڵ و تویکڵداری و دەرودووهۆدەیی ئەدەبی رۆژهەڵاتی موسڵمان بە تایبەتی هی فارس و کورد.

ئا ئەمەش نموونەیێکی وردتر و سەختتری بەرێکردنی دوو تیری واتایە لە تاکە وشەیێکەوە. نالی دەڵێ:

مساوی «وکیک و لوول»ن لە هەردوو لاوە زولفەینی
نموونەی عەکسی حەرفی نون و میم و واوە زولفەینی

وشەکانی «وک یک و لوول» خرانە نێو کەوانەوە چونکە بە رێنووسی کۆنم نووسی لەو رووەوە کە واتاکان لەم رێنووسەوە وەردەگیرێن.

واتاییێکی ئەمەیە کە هەردوو زوڵف، هەریەکە لە لایێکەوە مساوین لەگەڵ یەکتر، وەک یەکن، لوولن. لێرەدا وشەی «مساوی» زولفەکان بەیەکدی دەگرێت، وشەی «لە هەردوو لاوە»ش بۆ زولفەکان دەگەڕێتەوە چونکە هەر زولفە لە لایێکەوەیە .

واتایێکی تری ئەمەیە کە خۆی واتای بنجییە لە بەیتەکەدا:

هەردوو زولف مساوین بە «وک یکو – لول». وشەی «وکیکو» لە هەرلایێکەوەی بخوێنیتەوە هەر خۆی دەردەچێت، هەروەهاش وشەی «لوول» ئەویش لە خوارەوە بۆ سەرەوە خوێندنەوەی ناگۆرێت. لەم واتایەدا گوتەی «لە هەردوو لاوە» بۆ زوڵفەکانیش دەست دەدات بۆ «وکیک و لوول»یش دەست دەدات چونکە زولفەکانی لە هەردوو لاوەن، «وکیکولوول»یش لەملاو لەولاوە بخوێنرێتەوە فەرقێک ناکەن. ئەم مساوی بوونەی دوو زولفەکان لەگەڵ «وکیکولوول» پتر خۆ دەسەپێنێ کە سرنج بگرین لە مصرەعی دوەمی بەیتەکە چونکە لەوێدا زولفەکان بەسێ شت تەشبیە کراون کە ئەوانیش لەهەر لایێکەوە بخوێنرێتەوە فەرقی ناکەن. دیارە سێ شتەکە پیتی «نون، میم، واو»ە، سەیریش لەوەدایە وشەی «نمونە» کە لە بەرایی مصرەعی دوەمدا هاتوە هەر سێ پیتی تێدان، هاتینشیان بە دوا یەکتر لە وشەی «نمونە»دا وەک هی ناو بەیتەکە وایە، نوونەکە لە پێشەوەیە و میمەکە لە ناوەڕاست و واوەکەش لە کۆتایی.

بەیتێکی زۆر بەناوبانگی تری نالی کە لەوێشدا وشە هەیە دوو تیری واتای لێ بەرێ کرابێ ئەمەیانە:

لە دوگمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان
بەیانی دا سفیدەی باغی سێوان

وا چاکە لێرەدا بەیتی دوای ئەمیشیان بنووسین چونکە لە نێوان هەردوویاندا واتابەندیی و بەیەکەوە بەسترانێکی ورد هەیە یەکجار لە جوانی و سامانی هەڵبەستەکەی زیاد کردوە. بەیتی دوەمیان ئەمەیە:

لە خەوفی تەلعەتت رۆژ هەروەکو شێت
بە رووزەردیی هەڵات و کەوتە کێوان

چەند ساڵێک لەمەوبەر لە نەدوەییێکی تەلەفیزیۆنیدا من ئەم دوو بەیتەم شی کردۆتەوە، ئەوسا دوو هونەری گەورەی هەردووکیانم باس کرد: یەکێکیان ئەوەیە کە نالی نەهاتوە وەک شاعیرانی تر شەو و بەیان بەیەکەوە کۆبکاتەوە لە هەڵبەستدا چونکە شەو «نقیض»ی هەرەدووری بەیان نیە ئەوەی نقیضی تەواوە ئێوارە «نوێژی شێوان»ە کە هەموو شەو دەکەوێتە نێوانیانەوە و هەرگیز بەیەکتر ناگەن، لە حاڵێکدا شەو بە ڕۆژەوە نووساوە واتە دراوسێی یەکترن. لە نموونەی شاعیرانی تر یەکێکی ئەحمەد شەوقی و یەکێکی وەفاییم هێناوە کە ئەوانیش شەو و ڕۆژیان لە هەڵبەستدا کۆکردۆتەوە. ئەحمەد شەوقی دەڵێ:

و دخلت فی لیلین فرعک و الدجی
ولثمت کالصبح المنور فاک

وەفایی دەڵێ:

بەس عومری من بە با دە
ڕووت بێنە زولفت لادە
دڵ بۆیە نامرادە
بەم شەوە ڕۆژ گیراوە

هونەرە گەورەکەی تری نالی لە بەیتەکاندا ئەوەیە کەوا بە هۆی وشەی «دوێنێ» کە لە بەیتی یەکەمدا هاتوە هەر دوو واتای وشەی «هەڵاتن» ساحیرانە جێگەی بۆ کراوەتەوە لە هەڵبەستدا. واتایێکی وشەی «هەڵاتن» دیار کەوتنی ڕۆژەکەیە لە ئاسۆی ڕۆژهەڵاتەوە، واتاکەی تریشی بەزین و فیرارکردنی ڕۆژەکەیە لە ئاوابووندا. ئەمەش هەردوو واتای «شروق» و «فیرارکردن»ی ڕۆژە لە بەیتەکاندا:

دوێنێ نوێژی شێوان کە لە دوگمەی سینەتەوە سفیدەی بەیان دەرکەوت ڕۆژ بە ڕووزەردیی فیراری کرد و وەک شێت کەوتە کێوان.

دوێنێ نوێژی شێوان کە لە دوگمەی سینەتەوە سفیدەی بەیان دەرکەت، ڕۆژی ئەم سبەینەیە لە ترسی طەلعەتت بە ڕووزەردیی شروقی کرد و وەک شێت کەوتە کێوان. دیارە ئەم ترسەی ڕۆژ لە کاتی شروقدا پاشماوەی ترسی دوێنێ نوێژی شێوانە کە بەیانی باغی سێوان سفیدەی دابوو و ڕۆژی ترساندبوو.

دەبێ ئەمەش بخەینەوە سەر جوانی بەیتەکانەوە کە ترس دەبێتە هۆی ڕووزەردیی، شێتیش دەکەوێتە کێوان. لایەنی جوانی و ئارایشتی تریش هەیە لە بەیتەکەدا کە لێرە پێویست نابینم خوێنەری پێوە خەریک بکەم.

چەند ساڵێک بەسەر ئەم شیکردنەوەیەدا ڕۆیشت، تا لەنکاو بیرم بۆ وێنەیێکی نەدۆزرایەوەی ناو بەیتی یەکەم کشی. دۆزینەوەی وەها لەنکاو زۆر جاران بۆ من و بۆ تۆش ڕوودەدات. وا دیارە خەریک بوونی بەردەوام بە شتێکەوە وا دەکا هۆشی وون «عقل باطن» لە لای خۆیەوە ئەویش پێوەی خەریک بێت و دەوری گرێکانی پرسیارەکە هەڵبێت تا دەیانکاتەوە ئیتر لە دەرفەتێکدا گرێیەک بە کراوەیی دەداتەوە دەست هۆش وەک ئەوەی کە لە غەیبەوە کارەکە کرابێت، ئەم ڕایەشم لە زانایانی سایکۆلۆجی وەرگرتوە و باوەڕیشم پێی هەیە.

له مصرەعی دووەمی بەیتەکەدا کە دەڵێ:

بەیانی دا سفیدەی باغی سێوان

وشەی بەیان واتاییێکی ئاشکرا و یەکێکی شرایەوەی هەیە. واتا ئاشکراکە لە هەموو کەسێکەوە دیارە و لە سەرلەبەری بەیتەکە و بەیتی دواتریشدا بنج و ماکی وێنەی ناو هەڵبەستەکەیە، هەر تازەش لە شیکردنەوەی بووینەوە.

واتایە شرایەوەکە ئەمەیە. وشەی بەیان دەشێ ڕێژە جەمعی وشەی «بەی» بێت کە میوەیێکی ناسراوە. کە ئەم واتایە تێبخوێندرێتەوە وشەی «بەیان»یش دەبێتەوە ئەو کەوانەیە کە نالی دوو تیری واتای لێوە داوێت بۆ دوو ئامانج. بەیان کە بە واتای فجر بێت ئامانجی سفیدە دەپێکێت لە بەیتەکەدا کە ڕووناکایی فەجرەکەیە، کە ڕێژە جەمعی «بەی»ش بێت ئامانجی باغی سێوان دەپێکێت چونکە بەی بۆ خۆی میوەی باغە و لە وێنەشدا خزمی سێوە – مەمکی کچانیش بە سێو و بەی تەشبیە دەکرێت.

ئەم واتایە شرایەوەی بەیان کە ڕێژەی جەمعی بەی بێت، دەمەتەقەی لەسەر هەڵستا لەو ڕووەوە کە گۆیا لە نالی ناوەشێتەوە ڕستەی وەها لاواز بەکاربێنێت لە شیعردا چونکە هاتنی جەمعی وشە لە سەرەتای ڕستەوە کوردییەکی ڕەوان نیە. دەبێ لە پێشەوە ئەوە بڵێم ناشێ بیر بۆ ئەوە بڕوا کە بەیان جەمعی وشەی بە وەیاخود بەهێ بێت، چونکە ئەوەی نالی گوتوەتی و من واتام لێ دابۆوە وشەی بەیانە کە ڕێژە جەمعی وشەی «بەی»ە نەک «بە، بەهی». نالی لە چەند شوێنێکی تری دیوانەکەیدا وشەی بەی بەکارهێناوە بە واتای بەهێ کە دەڵێ:

کێ دەستی دەگاتە «بەی»و ناری نەگەیشتووت

وەیاخود کە دەڵێ:

سەروی هێناوە لە سێو و «بەی»موتربەی کردوە

لەلایەن هاتنی وشەی وەک «بەیان» لە سەرەتای ڕستەوە وەرام زۆرن بەڵام پێویست بە درێژەپێدان نیە، ئەم چەند تێبینیە بەسن:

١– ڕازی بین و نەبین وشەی بەیان وا لەسەرەتای بەیتەکەی نالیدا هەیە و بەکەس ڕەش ناکرێتەوە.

٢–لە پاش هەبوونی وشەکە دەبینین لە بەیتەکەدا وشەی تریش هەن موناسبی واتای ئەو بن وەک «باغ، سێو» کە ناچارمان دەکا بسەلمێنین هاتنی وشەکە بەو جۆرە لە سەرەتای بەیتەکەوە ڕێکەوتێکی کوێرانە نەیهێناوە، کوردیی گوتەنی، تەقڵەی مامە حەمە نیە «بەیان، باغ، سێو» لە نیوەی دێرە شیعرێکیدا کۆبوونەتەوە بە تایبەتی کە خاوەنی بەیتەکە یەکێکی وەک نالی بێت بە خۆی و هەموو دەسەڵاتی بێسنووری لە فرەواتاییدا.

٣– هەروەک لە عەرەبیدا زۆر مەشوور بوە کە «یجوز للشاعر ما لا یجوز لغیره» لە کوردیی و زمانی تریشدا جەوازی شیعر هەیە بەتایبەتی ئەو جەوازەی کە هیچ دەستووران تێک نەدات، لێرەشدا هەرئەوەندە کراوە وشەی «بەی» لە تاکەوە بوە بە جەمع. لە کوردییدا هاتنی ڕێژە جەمع لە سەرەتای ڕستە زۆر باوە

چ فاعل بێ چ مەفعوول وەک کە بڵێی: «ئەسمەران خوێنیان شیرینە» لێرەدا ئەسمەران جێگەی فاعیلی گرتۆتەوە. لەم ڕستەی خوارەوەدا وشەی سەرەتا ڕێژەی جەمعە و مەفعولیشە وەک وشەی «بەی – ان»ی ناو شیعرەکەی نالی: «هەنجیرانیش دەخوا و درۆیانیش دەکا» وەیاخود ئەم ڕستانە: مەڕان دەلەوەڕێنێ – داران دەبڕێتەوە – چرایان پێ دەکا... هتاد.

ئەوەی لێرەدا بە فەرق حیساب بکرێ لەگەڵ ڕستەی شیعرەکەی نالی هەر ئەوەیە کە لەم نموونانەدا وشەکان کەوتوونەتە پێش فیعلی مضارعەوە لە حاڵێکدا «بەیانیدا» فیعلی ماضی بەکارهێناوە. لەمەشدا ڕەخنە نامێنێ چونکە دەشێ بگوترێ «کچانی قبووڵ کرد و کوڕانی قبووڵ نەکرد لە مەکتەب» لەم ڕستەیەدا فاعیل دیار نیە بە پێچەوانەی بەیتەکەی نالی کە لەوێدا فاعیل «سفیدەی باغی سێوان»ە، بەڵام دەکرێ بگوترێ «کچانی قبووڵ کرد، مودیری مەکتەب» کە ئەمە بە تەواوی وەک بەیتەکەی نالییە، لە هەردوو ڕستەشدا جەوازێکی یەکجار کەم و بێهێز بەکار هاتووە کە بریتیە لەوەی فاعیلەکان لەجیاتی پێشەوە، لە دواوەی مەفعولەکانەوە هاتوون «مودیری مەکتەب کچانی قبووڵ کرد – سفیدەی باغ بەیانی دا...».

کە خەریک بین بەدوا جەوازەکانی شیعری کوردی بەسەر زۆر شتی تردا دەکەوین گەلێک پتر چاوپۆشی لێکردنی دەوێت لەمەی بەیتەکەی نالی، کەسیش بە عەیبی دانەناوە. خۆ لە بابەتی فۆلکلۆریدا ئەم جەوازانە هەر بەجارێ...

٤– لەمانە بترازێین دەبێ ئاگاداری شتێکی تر بین: یەکێک لە تایبەتیەکانی یەکجار گرنگی مەهارەتی نالی لە فرەواتاییدا ئەوەیە کەوا گەلێک جاران لە پۆپی دەسەڵاتی بوێژیی خۆیەوە دێت و لەودیو وێنە ئاشکراکەی هەڵبەست سێبەری وێنە و واتایێکی تر وەک سەرابی دیار و مەوهووم دەخاتە پشت پەردەی ئاورینگداری وشە و ڕستە بەرچاوەکانی هەڵبەستەوە بێ ئەوە خۆی و پارچە شیعرەکە قەرزدار وەیا هاومەبەستی ئەو سەرابە بکات. پاش خوانێکە و لەبەر سفرەی شرِ خواردەمەنی ماوەتەوە... ئاوێکە و لە حەوزی پڕ واتای هەڵبەست سەرەڕێژی کردوە... تیشکێکە و لە ئاوێنەیێکی خەیاڵیدا دووبارە بۆتەوە نە هیچی تێچوە و نە کەسی ماندوو کردوە و نە چ جێی بە واتا و وێنە بنجییەکەی ناو هەڵبەست تەنگ کردوە لە هەمان کاتیشدا چەندی بڵێی وەستایانە و شیرن و ڕەنگینە هەر دەڵێی ئەو نەقش و نیگارەیە کە شتان دەڕازێنێتەوە و لە نرخ و بایەخیان زیاد دەکات و هەست و مەیلی تەماشاکەران دەبزوێنێ لە حاڵێکدا دەزانین شتەکە بێ نەقش و نیگاریش هەر هەیە و هەر دەبێ. بە نموونەی ڕوونکردنەوەی مەبەست تەماشای ئەم دوو بەیتە بکە:

وەرە قوربان بە جان هەردوو برابین
کە تۆ بێ مادەر و من بێ پدەر مام
بەلاگەردانی باڵات بم ئەگەر چووم
فیدای هیندوویی خاڵت بم ئەگەر مام

واتای بەیتەکان هەرچی دەبێ با ببێ بە دۆزینەوەی وێنەی سەرابی و شرایەوە لە بەیتەکاندا واتاکە کەم ناکات. نالی هاتوە بێ ئەوەی پێوەی دیار بێ کە خەریکی هەڵنانی واتایێک وەیا ئارایيشتێکی

سەرەڕێژ کردوە وشەکانی «برا، مادەر، پدەر، خاڵ، مام»ی کۆ کردۆتەوە کە ئەگەر لە حیسابانی دەرباوێیت نالی و شیعرەکە زەرەریان نەکردوە بەڵام کە هەستت بە دیاردەکە نەکرد دیمەنێکی ئەدەبی جوانت دۆڕاندوە. ئەمەش نموونەیێکی تری هەڵنانی واتا و وێنەی سەرابی:

خاو و بێ خاوی دوو زولفی خاوم ئەز
چاوەچاوەی یەک غەزالە چاوم ئەز

لە مصرەعی یەکەمدا «خاو، بێ خاو» دوو وەصفن بەرانبەر دو زوڵفی خاو وەستاون، کەچی لە مصرەعی دوەمدا ژمارە «یەک» هەیە کە دەڵێ «یەک غەزالە». بوونی ژمارە «یەک و دوو» شتێکی بەرچاوە و نەدیتنی وەک شەوکوێریی وایە، بەڵام لەودیو ئەم یەک و دووەوە، لە ناو ئاورینگی وشەکاندا دیمەنێکی تری سەرابی هەیە کە نەدیتنی زەرەر بە بەیتەکە ناگەیەنێ بەڵام تەماشاکەرەکە لەزەت و خۆشییێکی مەعنەوی گەورەی لە دەست دەچێ، سەرەڕای ئەوە کە مەعلووم دەبێ کوڕی مەیدانی نالی نیە، لە ڕستەی «چاوە چاوەی یەک غەزالە چاو»دا وشەی «چاوەچاو» دوو جاران «چاو»ی تێدا گوتراوەتەوە بەڵام یەک واتای هەیە کە «ترقب»ە کەچی «یەک غەزالە چاو» لە ڕواڵەتدا ژمارە «یەک»ی تێدا گوتراوەتەوە بەڵام لە مەعنادا دوو چاوان ڕادەگەیەنێ چونکە دەزانین یەک غەزال دوو چاوی هەیە:

چاوەچاو: بە وشە دوە بە واتا یەکە
یەک غەزالە چاو: بە وشە یەکە و بە واتا دوە.

نالی بەم داڕشتنە لەجەرگەی «یەک»ەوە ژمارە «دوو»ی هەڵێنجاوە و لەنگەری ژمارە دوەکەی مصرەعی یەکەمی پێ ڕاست کردۆتەوە تۆش حەز دەکەی مەهارەتەکە ببینە و مافی خۆی پێ بدە، حەزیش دەکەی ئینکاری بکە و چاوی لێ بچووقێنە تا ئیفلاس بە زەوقی خۆت بکەیت.

ئەم جۆرە مەهارەت و وەستاییە لە شیعری نالیدا هێندە زۆرە وەک بەردی بەست وایە، نیشانەییکیشە لە نیشانەکانی پێشرەویی و پێشەنگی ئەدەبەکەی و ناشێ لێی بەخەبەر بین و تێی نەخوێنینەوە چونکە تێخوێندنەوەی دەبێتە دارنینی بەرگێک لە بەرگەکانی ئارایشت و سامان لە بەشێکی شیعرەکانی، ئەوەی ڕاستیش بێ ئەم لایەنەی دۆزینەوەی واتا و وێنەی «سەرابی – ئەگەر تەعبیرەکە دروست بێ» خۆی لە خۆیدا یەکێکە لەو لێکۆڵینەوانەی کە دیراسە لەبارەی نالییەوە داخوازیی دەکات، ڕەنگە هێندەشی بە بەرەوە هەبێ ببێتە کارێکی سەربەخۆ نەک ئەرکێکی لابەلایی کە لەوانەبێ ببێتە ئاڵقەی زنجیرە وەیا داوی ڕایەڵ.

یەکێکی تر لە نموونەی ئەو وشانە کە وەک کەوان، پتر لە تیرێکی واتایان لێوە هاوێژراوە وشەی «انوار»ە لەم بەیتەدا:

سەحرا بە تەجەللی دەکەنە وادی یی ئەیمەن
قامەت شەجەر و مەزهەری «انوار»ی ئیلاهن

وشەی «انوار – ئەنوار» ڕێژە جەمعە بۆ دوو وشەی عەرەبی یەکێکیان «نور – بە واتای ڕووناکی» ئەوی تریان «نور (نەور) – بە واتای غونچە» سرنج بگرە دەبینی «ئەنوار» لە بەرەو پێشەوەی «شجر – شەجەر» هەیە لە دواوەشیەوە «اله – ئیلاھ» هەیە، لەمەوە ڕاستەوخۆ و بێ گرفت و تێفکرین دێتە بەر هەست و هۆشمانەوە کە نالی لە «نور – نەور – غونچە»وە تیری واتا بەرەو «شەجەر – درەخت» داوێژێ چونکە درەخت غونچە و پۆقژەی هەیە، لە «نور – ڕووناکی»شەوە تیرێکی بەرەو «ئیلاھ – خوا»وە دەڕوات کە ئەمە شتێکە دووبارەکردنەوە و گوتنەوەی ناوێت هەم لە ڕووی نیسبەتی نێوانی ڕووناکی و خوا، هەم لە ڕووی «اضافە»ی وشەی «نور» بۆ وشەی «اله – ئیلاھ» لە بەیتەکەدا.

نوری ئیلاھ بە واتای ڕووناکی خوا ئەویش سەرلەنوێ دەشێ بێیتەوە تیرێکی واتا و بەرەو «شجر – شەجەر – درەخت» بکشێ چونکە ئەو ڕووناکییەی کە موسا لە «وادی ئەیمەن»دا دیتی لە درەختێکەوە دەدرەوشایەوە مەعلوومیشە ڕووناکایی خوا بوو.

وشەی «شەجەر – درەخت» ئەویش جارێکیان بۆ قامەتی سەربازەکانی «تاقمی مومتازی شاھ» دەچێتەوە، جارێکی تریش بۆ «وادی ئەیمەن» دەگەڕێتەوە چونکە ئەو درەختەی کە نووری خوای لێوە دەدرەوشایەوە لە «جانب الطور الایمن» بوو، پێشتریش زانیمان درەختەکە نیسبەتی لەگەڵ «نەور – غونچە» و لەگەڵ «نور – ڕووناکی» دا چیە. بەیتەکە گەلێک لێکدانەوە و قووڵبوونەوە و شیکردنەوەی تر هەڵدەگرێت «وەک ئەوەی کە قامەت درەخت بوو و خۆی بە سەحرا نیشان بدات، سەحراکە دەکاتە وادیی ئەیمەن کە جێگەی درەختە» بەڵام لێرەدا ئیشمان بەو زێدە وردەکارییە نیە، تەنها شتێک هەبێ پێویست بە گوتن بکات ئەوەیە کە وشەی «انوار – ئەنوار» ناشێ بە وشەی «الطاف – ئەلطاف – ئیلطاف» بگۆڕێتەوە کە لە هەندێ نوسخە دەسخەتدا نووسراوە چونکە بەم گۆڕینەوەیە بەیتەکە ڕووت دەبێتەوە و سامانێکی زۆری لە دەست دەچێت، وشەی «الطاف» یش چ ڕێژە جەمعی «لطف» بێت و چ چاوگی فیعلی «الطف» بێت – بە واتای چاکە لەگەڵدا کردن وەیا دیاریی بۆ ناردن– بایی فلسێک لە واتاکانی «انوار» تێناهێنێتەوە. لەبەر ئەمەیە دیارە ئەو نوسخانەی کە لە جێگەی «انوار»دا وشەی «الطاف»یان نووسیوە سەهوێکی سادە و سافیلکانەیان کردوە. ئەگەر یەکێک بێت و بلێ لەوانەیە نالی وشەی «الطاف»ی بەکارهێنابێت، بەڵام نوسخەنووسان کردبێتیانە «انوار»، وەرامی بەم دوو سێ تێبینییە دەدرێتەوە:

یەکەم: بەزۆری وشەی «انوار» ڕۆیشتووە. بە عادەت ڕیوایەتی کەم شۆرەی کاتێک بەسەر هی مەشووردا تەرجیح دەدرێت کە ئەو لە مەشوورەکە گونجاوتر بێ لەگەڵ مەبەست وەیا داخوازیی و پێویست. لێرەدا ڕیوایەتە کزەکەی «الطاف» چرایان دەکوژێنێتەوە و مەبەست لاواز دەکات.

دوەم: وشەی «انوار» لە بەیتەکەدا وەها دامەزراو و واتابەخشە، هێندەی بەدیهیە ئاشکرایە خۆی زادەی بەیتەکە و هەناوی نالییە.

سێیەم: ناشێ بیر بۆ ئەوە بڕوات کەوا نالی هەردوو وشەی «انوار، الطاف»ی بەکارهێناوە چونکەم ئەمە شتێکە نەدەکرێ و نە هیچ بەڵگەییکیش بە دەست کەسەوە هەیە ئەوە بسەپێنێ کە نالی بە پێچەوانەی عادەت و مەنتیق کارێکی وەها نالەباری کردوە.

چوارەم: کە گوێ نەدەینە ئەم هۆیانەی تەرجیح و هەر سوور بین لەسەر بایەخدان بە وشەی «الطاف» دەتوانین زۆرینەی میراتی شاعیرەکانمان بەم شێوەیە ڕەفتارمان شەت و پەت بکەین وەک ئەوەی کە بەیتەکەی پێنج خشتەکی شێخ ڕەزا بەسەر غەزەلی کوردییەوە بکەینە «لە هیجرانی شەقم برد» لە جیاتی

«لە هیجرانی تەقم کرد» کە مەشووری هەموو جیهانی کوردەوارییە وەیاخود دێڕە شیعری گۆران بگۆڕین و بلێین «نازانم کامتان لامن» لە جیاتی «نازانم کامتان کامن...» و هەزارانی تری وەک ئەمانە.

باسی ئەم بەیتە و وشەکانی، وا داوا دەکات شتێک بلێم لەبارەی غەزەلەکەوە کە نەختێک دەمەتەقە لەسەر واتا و مەبەستی هەڵستاوە لەو ڕووەوە ئایا «تاقمی مومتاز» حەرەسی تایبەتی پاشای بابانە یا کۆمەڵە کیژە!

هەرچەند، بەلای منەوە، سەرلەبەری بەیتەکان هاواریانە کە وەصفی پێشخزمەتەکانی پاشا دەکەن، ئەم ڕاستییەش بەولای گومانەوەیە، بەڵام کە هەر هاتین بەڵگە بێنینەوە بۆ سەپاندنی ڕاستییەکە ڕەوا نیە بەسەر بەیتی یەکەمی غەزەلەکەدا باز دەین چونکە لە مصرەعی دووەمدا، بەدەم مەهارەتەوە، پاتەوپات ئەم لایەنە باسکراوە و بەسەریش چوە. نالی دەڵێ:

ئەم تاقمە مومتازە کە وا خاسەیی شاهن

ئاشووبی دڵی مەملەکەت و «قلب»ی سوپاهن

تۆ سەیری سەراحەت بکە: ئەم «قەلبی سوپاه»ە لە کۆتایی بەیتەکەدا هێندەی تۆپ و تفەنگ و بۆریەی عەسکەریی زەق و بەرچاوە کە تاقمە مومتازەکە، نەک هەر تیپێکی عەسکەری تایبەتی شاهن، بەڵکو لەنێوان لەشکریشدا سەروکاریان لەگەڵ «قلب»ی لەشکرەکەیە نەک «مەیمەن» و «مەیسەرە» و «جناح»ەکانی کە ئەمانە زاراوەی یەکجار مەشوورن و لەوانە نین چاو بەسەریاندا تێپەڕێت و نەیانبینی چونکە کە ئەم دیمەنە زۆر زەق و بەرچاوە لە هەڵبەستدا هەستی پێ نەکرێت ئومێد یەکجار بێهێز دەبێ بە دیتنی شتی مەیلەو شرایەوە و وردپێو کە ئەمە ڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی دەمەتەقە کردن لەسەر هەموو واتاییکی ورد و هێمایی وەیاخود ڕەنگە ببێتە هۆی ئینکار کردنی ئەو تەرزە واتایانە. با دوور نەڕۆین، هەر لێرە لە ئاست ئەم «قەلب»ی سوپاهەدا هەمان ئیحتیمالی نەسەلماندن هەیە چونکە ئەو کەسەی لەبەر درشتبینی خۆی، لە زەمینەی مەدحی تاقمی مومتازی شاهدا، هەست و هۆشی بۆ ئەوە نەڕوا کە قەلبی سوپاه زاراوەییکی عەسکەریی سەردەمی نالی و لەویش کۆنترە و تا ئێستاش هەر باوە و بەسەر زمان و خامەی نووسەرانەوەیە، ئیتر بۆ لە من و تۆ بسەلمێنێ و دان بە نەزانینەکەی خۆیدا بێنێ لە حاڵێکدا نەسەلماندن ئەو کارە ئاسانەیە کە هیچی تێناچێت و چ زیانان بە نەسەلمێنەکە ناگەیەنێ وەک ئەوەی کە تا ئێستاش خوێندەواری ئەوتۆ هەیە ناسەلمێنێ مرۆڤ چۆتە ناو مانگ و سوورە لەسەر هێندی کە سمینی «ئاسمان» مومکین نیە چ زەرەرێکیشی نەکردوە.

چەند دێڕێک لەمە بەرەوپێش گوتم تاقمە مومتازەکە «سەر و کاری لەگەڵ قەلبی لەشکرەکەیە» نەمگوت خۆی قەلبی لەشکرە: لەمەدا ویستم فرەواتایی بەیتەکە کوێر نەکەمەوە چونکە دەشێ تاقمە مومتازەکە ئاشووبی دڵی مەملەکەت و ئاشووبی قەلبی سوپاهیش بن، دیارە لەم حاڵەدا مەملەکەتەکە و سوپاهەکە هی بێگانە و دوشمنە. بەڵام لە هەمان کاتدا دەشێ تاقمەکە ئاشووبی دڵی مەملەکەت بن بەو هەموو جوانییە و ڕێکییەی کە لە بەیتەکەدا بۆیان دیارکراوە، لەم حاڵەدا مەملەکەتەکە دەبێتە شاری سلێمانی کە دڵی دانیشتوەکانی پڕ ئاشووب بوە بە جوانیی لاوچاکەکانی تاقمی شاه، تاقمەکەش خۆی دەبێتە «قەلبی سوپاه» واتە لە لەشکرەکەدا جێگەی قەلبی گرتوە نەک جەناح، کە ئەمە جێگەی ڕاستەقینە و ڕەوای

خۆیەتی چونکە دیارە «شاھ» ھەمیشە لە قەلبی لەشکرا دەبێ... نالی زۆر ئوستادانە وشەی دڵی بۆ مەملەکەت بەکارھێناوە وشەی قەلبیشی ئیزافەی سوپاھ کردوە ھەرچەند لە واتادا ھەردوو وشەی دڵ، قەلب یەک شتن بەڵام دیارە لە زاراوەدا ھەر قەلب بۆ سوپاھ بەکارھاتوە. بەم لەبەریەک ترازاندنەی واتای دڵ و قەلب ھەموو مەبەستەکانی نالی لە مەدحکردنی تاقمە مومتازەکەدا چ لەلایەن جوانییەوە بێ و چ لەلایەن جەنگاوەرییەوە بێ کەوتوونەتە سەر خوانی ھەڵبەست، ھەر دەیەوێ من و تۆ لێی وردبینەوە و مەھارەتەکە ببینین. بەیتەکە لە فرەواتاییدا، جگە لەوەی من تازە باسم کرد، گەلێک مەیدانی تریشی بڕیوە کە پێویست نیە لێرەدا بیان کوتینەوە چونکە مەبەستمان ھەر ئەوە بوو بزانین غەزەلەکە چ تاقمێکی مەدح کردوە، بەلام پێویست دەبینم لایەنێکی ڕێزمانی سەر بەواتاکانەوە لێرەدا ڕوون کەمەوە چونکە ئەویش لەوانەیە وەک وشەی «بەیان» بدرێتە ھەر دەستوورێکی ڕێزمانی وەھاوە کە ڕێگەی فرەواتاییەکە و زێدە جوانی بەیتەکە کوێر کاتەوە.

دەشێ یەکێک بێت و بڵێ ڕستەی «ئاشووبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاھن» ھەر ئەوە ھەڵدەگرێ کە تاقمە مومتازەکە ئاشووبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاھ بن، واتە وشەی ئاشووب ئیزافە بکرێ بۆ دڵ و قەلب چونکە واوی عەطف کە لە بەینیاندایە ھەردووکیان دەخاتە بەر یەک حوکم ئەویش ئیزافەی ئاشووبە بۆ ھەردووکیان، بەمەشدا بەیتەکە ھەر ئەوە ڕادەگەیەنێ کە مەملەکەتەکە و سوپاھەکە ھی دوشمن بن.

ئەم بۆچوونە ھەندێکی زانستی ڕێزمانی پێکاوە، بەشێکی زۆریشی لە دەست داوە. «قەلبی سوپاھ» کە بە ڕواڵەت عەطف کراوەتە سەر «دڵی مەملەکەت» بە ھۆی واوی عەطفەوە، ھەڵدەگرێ عەطف کرابێتە سەر «آشوب»ی «دڵی مەملەکەت» کە خەبەری نیوە بەیتی یەکەمە، واتە عەطف کرابێتە سەر خەبەر کە دەیکاتەوە بە خەبەر نەک «مضاف الیە» کە دەزانین دڵی مەملەکەت بە دوا ئاشووبدا دەبێتە «مضاف الیە» نێزیک، سەرەتاییێکی ڕێزمانە بە تایبەتی ڕێزمانی عەرەبی کە نالی تێیدا سوارچاک بوو. بەم پێیە بەیتەکە ھەڵدەگرێ لایەنەکانی «معطوف علیە و مضاف الیە» وەک ئەمەی لێ بەسەر بێ:

ئەم تاقمە مومتازە ئاشووبی دڵی مەملەکەتن

ئەم تاقمە مومتازە قەلبی سوپاھن

لەمەدا «قەلبی سوپاھ» بوو بە خەبەری «تاقمی مومتاز» ھەروەک «ئاشووبی دڵی مەملەکەت» خەبەرە. بەم جۆرە دەشێ تاقمە مومتازەکە ئاشووبی دڵی سلێمانی بن و لەھەمان کاتدا قەلبی سوپاھی شاھیش بن.

بە تەئویلێکی تریش «قەلبی سوپاھ» دەبێتەوە خەبەری مصرەعی یەکەمی بەیتەکە بەوەدا کە بڵێین ڕستەی قەلبی سوپاھن ڕستەیێکی تازە دەستپێکراوە کە لە زاراوەی عەرەبیدا پێی دەڵێن «جملة مستأنفة». لەم حاڵەتەدا واوی عەطف ھەر ئەوەندە دەکات کە ڕستەکە دێنێتە ناو ئاخاوتنەوە بێ ئەوە بە وشەی پێشووتری ببەستێتەوە لە ھیچ ڕووییێکی ڕێزمانەوە. بەو پێیە ڕستەکە نابێتە «مضاف الیە» بۆ وشەی «آشوب» وەک کە ڕستەی دڵی مەملەکەتن بۆتە «مضاف الیە».

ئەم لەبەر یەک ھەڵوەشاندنە ڕێزمانییەی بەیتەکە کە لێرەدا بۆ مەبەسی ڕوونکردنەوە دێتە ناو حیسابی واتا لێکدانەوەوە، شتێکە لەلاوە خۆی بە ملی بەیتەکەدا دەدات و لە بنەڕەتدا شیکردنەوەی ڕێزمانی ھەبێ

یان نەبێ وەیاخود ڕێزمان دانرابێ وەیا دانەنرابێ واتاکان لە هەڵبەستەکەدا هەن و زیهنیش بۆیان دەچێت و تێیان دەگات. ئەو هەڵبەستانەی پێش دانانی ڕێزمانان دەهۆنرانەوە چ کەم و کورتییەکیان لێ پەیدا نەبوو، خەڵقیش لە هەموو واتاکانیان دەگەییشتن چونکە دەستوورەکانی بنچیی ڕێزمان لە هەڵبەستەکاندا هەبوون بێ ئەوەی جارێ زانای زمان و ڕێزمان هەڵیهێنجابن و زاراوەی «فعل» و «مضاف الیه» و «جملة مستأنفة»ی بۆ بەکارهێنابن. بەڵام دەبێ ئەوەندە تێبینییە ڕەچاو بکرێ کە زۆر بوونی دەستوور و پێوە خەریک بوونیان دەنگ و ڕەنگێکی دێنێتە ناو گوتەوە چ لە پەخشاندا بێ و چ لە هەڵبەستدا. ئەم دیاردەیەش لە هەموو مەیدانەکانی چالاکی مرۆڤدا دەدیترێت نەک هەر لە گوتە و نووسین. بە نموونە دەڵێم مەلەکردن لە سەرەتای پەیدا بوونی مرۆڤەوە چالاکییەکی بێ دەستوور بوو، ئەو کەسەش بە مەلەوانی چاک لە قەڵەم دەدرا کە خێرا پەڕیبایەوە و درەنگ ماندوو بووبا بەڵام دوای پێشکەوتنی مرۆڤ لە ژیانی کۆمەڵایەتییدا بەرەو ڕێکخستن و یاسا دانانەوە، مەلەکردنیش دەستوور و یاسا و مەرج و ڕەوا و ناڕەوای بۆ دانرا و ڕەهایی جارانی نەما ئیتر مەلەوان ئەگەر بەقەدەر ماسیش خێرا و بەردەوام بێ، لە هاڤرکێی ڕەسمیدا قبوڵ ناکرێ کە بێت و گوێ نەداتە یاسا و دەستوورە سەلمێنراوەکانی هاڤرکێ.

ئێمە کە بە ناچاری قسەمان گەییشتە دەستوور و یاسا لە کاری ئەدەب و هونەردا دەبێ لەوەش ئاگادار بین کە هەڵبەست دوو جاران دەستووری تێدا ڕەچاو دەکرێت. جارێکیان دەستوورەکانی ڕێزمان کە لەمەدا هاوبەشی پەخشانە، جارێکیشیان دەستوورەکانی «عروض» کە تایبەتی شیعرە. سەرەڕای جووتە بەندی ڕێزمان و «عروض» کە لە ڕەهایی شیعر کەم دەکەنەوە، پێویستی مۆسیقاش جارێکی تر شیعر لە پەخشان جودا دەکاتەوە و بەندێکی سێییەمی لێ زیاد دەکات هەرچەند گەلێک نووسینی پەخشانیش هەیە هێند زرینگەدارە لە بەشێکی زۆری هەڵبەستی بەرزتر دەکاتەوە بەڵام ئەمە سنووران لە نێوان پەخشان و هەڵبەستدا نابەزێنێ و تایبەتیەکانیشیان تێکەڵ بەیەکتر ناکات. تەنانەت ئەو ڕاستییەش ناشارێتەوە کە پێکهێنانی مۆسیقا و زرینگە لە پەخشاندا دەرفەتێکی فرەوانتری هەیە تا هەڵبەست لەو ڕووەوە کە پەخشان جووتە بەرهەڵستی «کێش و قافیە» نەفەسی نابڕن و مەودای لێ کورت ناکەنەوە. تەنها شتێک لێرەدا کە یارمەتی هەڵبەست دەدات ئەوەیە کە کێش و قافیە زرینگەیێکی تایبەتی خۆیان هەیە دەیخەنە ناو هەڵبەست و هەندێکی بۆ تێدێننەوە لە ئەرکە قورسەکەی دروست کردنی مۆسیقا لەو مەودایەی کە کێش و قافیەکە تەسکیان کردۆتەوە، ڕەنگە ئەمەش بابەتێک بێت لەوەی پێی دەڵێن «وحدة الاضداد».

نالی ناوناوە لەو هونەرەی بەڕێکردنی دوو سێ تیری مەعنا لە کەوانەی یەک وشەوە، تێهەڵدەکشێ بەرە و بەرزایی دەسەڵات و مەهارەتی لە ڕادەبەدر. لەو تەرزە جێگایانەدا مرۆڤی شیعردۆست ڕاستەوخۆ دەکەوێتە کەڵکەڵەی بەیەکدی گرتنی نموونەکانی نالی لەگەڵ شیعری شاعیرەکانی هەموو ڕۆژهەڵاتی موسوڵمان نەک تەنها هی کورد.

یەکێک لەو نموونە هەرەبەرزانە کە خۆی لە ڕیزی چەند بەیتێکی تری یەکجار بەرزدا دێت ئەم بەیتەیە:

حەڵاڵی بێ نیکاحی حوری «عینم»
بە جووتە نازیری شەرع و فەتاوا

ئەم بەیتە دەبێ بە ڕێنووسی سەردەمی نالی بنووسرێتەوە تاکو هەموو واتاکانی بێتە بەرچاو:

حلالی بی نکاحی حور عینم
بە جوتە ناظری شرع و فتاوی

جارێ با لەپێشەوە ئەوە بڵێم، سەرلەبەری بەیتەکان هەر لە یەکەمەوە تا کۆتایی، تا ئێستا بە نەزانراویی و شراوەیی ماونەتەوە. ئەوەندەی دیبێتم و بیستبێتم یەکێک مەعنای لێ دابنەوە خۆی لە شوێنە سەختەکان نەداوە و بە پێی دزیلکەی خۆ دەربازکردن لێیان دوور کەوتۆتەوە وەیا بە فەندی گرێ شاردنەوە تەگەرەکانی خستوونەتە تاریکاییەوە، واش هەیە تێکراییێکی مەعناکەی گوتوە بێ ئەوە بە وردیی واتاکان بەسەر وشە و ڕستەکاندا ببرێت. کەس نەهات بەڕاشکاویی پێمان بڵێ ئەم بەیتە بە ڕاست و ڕەوانی و بێ قۆرت و گرفت چی مەبەستە:

صداق و ڕوونمایی وەصلی شاهید
لەگەڵ شایی کەران بێ دەنگ و داوا

تەنانەت کەسم نەدیت قۆڵ و باسک لە ساغکردنەوەی داڕشتنی دوو مصرەعەکە هەڵماڵێ و بڵێ ئایا «صداق و ڕوونما»یە یاخود «صداقی ڕونما»یە یاخود «صداق و ڕونمایی وصل» وەیا «صداقی ڕونما و وەصل»ە وەیا شتێکی ترە، ئەگەر هەرکامێک لەمانە وەیا هی تر بێ واتاکەی چیە، شایکەر کێن؟ کە نالی وێنەی یار لە دڵدا دابنێ و پەردەی بووکێنی لە چاوی خۆی دروست بکات ئەم شایکەرانە چیان بەسەر ئەم مامڵەتە بێ دەنگ و داوایەدا هەیە؟ چۆن دەشێ شایکەری عادەتی لە مامڵەتی نێوانی حەبیبە و چاو و دڵی نالی بەشدار بن؟ کە بەشداریش بوون بۆچی بێ دەنگ و داوا بن؟ دەبینی ئەم تەرزە واتا لێکدانەوەیە نە لەگەڵ بەیتەکەدا ڕێک دەکەوێ و نە لەگەڵ واقیعی ژیان دەگونجێ نە بە هیچ جۆرێک لە نالی دەوەشێتەوە. خۆ خافڵاندن بەم شێوە واتایانە لە شیعری نالی نامان گەیەنێتە هیچ شتێک و بایی زڕە قەناعەتیش ناکات... من دیتوومە ئەم بەیتە بەم شێوەیە نووسراوە:

صداق و ڕوونما و وصلی شاهد
لەگەڵ شایکەران بێ دەنگ و داوا

لەمەدا «دەنگ و داو» دەبنە کەرستەی ڕاوکردن، واتە دانە و داو.

ڕەنگە وا بزانرێت هاتنی بزوێنی «ا» لە کۆتایی وشەی «داو»دا شتێکە پێچەوانەی دەستووراتی زمانی کوردیی، بەڵام ڕەواندنەوەی ئەم گرێیە زۆر ئاسانە، ئاسانیەکەشی لە ڕێی هێنانەوەی نموونەی تری وەک ئەم لە شیعری کوردیی پەیدا دەبێ. شاعیرێکی کورد «وا بزانم زیوەر» دەڵێ:

عەرەق نیە لە عالەما کە لابەرێ لە دڵ غەما

ئەم دێڕە شیعرە ڕاست و دروستەش وەک هینەکەی نالی، هاتوە لە کۆتایی وشەی «غەم» بزوێنێکی «ا»ی داناوە. بەیتەکە لە بنەڕەتدا دەبوو بەم شێوەیە بێت:

عەرەق نیە لە عالەما

کە لابەرێ غەم لە دڵا

شاعیر لەبەر قافیەی شیعر وشەی «غەم»ی گوێزاوەتەوە جێی «دڵ» و بزوێنەکەی دڵیشی پێ داوە کە کورت کرایەوەی «دڵدا»یە.

مەلای گەورە لە مەدحی هۆزی میراودەلی ئەمەی گوتوە:

شەقێکیشی گەیاندە ئینگرێزی

بە بازێ چوونە بەغداوە لە دەربەند

بە پێی دەستووری ئاخاوتن دەبوو بڵێ «چوونە بەغدا لە دەربەندەوە» ئەمیشیان کێش و قافیەی شیعر جێگۆڕکێی بە یەکێک لە ئەمرازەکانی کۆتایی وشەیێکی کردوە بۆ کۆتایی یەکێکی تر.

پێش مەلای گەورە و زێوەر، نالی ئەم فەندەی بەکارهێناوە لەو بەیتەدا کە لێرە باسی دەکەین، چونکە ئەمیشیان جێگۆڕکێی بە بزوێنی «ا» کردوە لە وشەیێکیەوە بۆ وشەیێکی تری، بە تەواوی وەک بەیتەکەی زێوەر. دیارە بەیتەکە وەها بوە بەڵام کێش و قافیە گۆڕیوەتی:

لەگەڵ شاییکەرانا بێ دەنک و داو

ئەم بزوێنەی «شاییکەرانا»ش وەک هینەکەی بەیتی زێوەر کورت کرایەوەی «شاییکەراندا»یە کە زۆر باوە لە شێوە ئاخاوتنی سلێمانی. نالی لە زۆر جێگەدا بە لەهجەی خەڵقەکە ڕەفتاری کردوە لە شیعردا وەک کە دەڵێ:

پەچەیی پەرچەمی و پرچی سیا

هەر دەڵێی مانگەشەوە و کوڵمی تیا

ئەم «تیا»یە کورت کرایەوەی «تێدا»یە بە پێی دەستووری تێبردنی دەنگی «د» لە شێوە ئاخاوتنی سلێمانی.

دەزانین لە سەردەمی نالی دەنگ و دەنک هەردوویان وەک یەک دەنووسران «دنک». لەبەر ئەمە هەڵدەگرێ ئەو کەسەی کە من دەسنووسیم دیوە ئیحتیماله مەیلەو ونەکەی شکڵی «دنک»ی پەسەند کردبێت و ئەوی بەسەر ئیحتیماله پەرەسەندوەکەی «دەنگ»دا تەرجیح کردبێت. بەهەمە حاڵ ئەم ڕواڵەتەی «دەنک و داو» وا لەبەرچاوانە، جا ئەگەر لەبەیتەکەدا خۆی سەپاند کوا واتاکەی، کێ دەڵێ کە «دەنک و داو» خرایە بەر شیکردنەوە، گوتەی «شاییکەران» – شاییکران بە ڕێنووسی سەردەمی نالی – ئەویش

ڕواڵەتێکی تری نابێ کە «شاییگران»ە؟ کە هاتین نیوە بەیتەکەمان کردە «لەگەڵ شاییگران بێ دەنگ و داوا» واتاکە چی لێ دێ؟ شایی گر ئایا هەر ئەوانەن کە شایی دەکەن و دەستی یەکتر دەگرن یاخود وشەی «شایی» واتایێکی تری هەیە کە دەیکاتە شتێک لەوانەی بە دەنگ و داو یا بێ دەنگ و داو دەگیرێن. دەزانین واتایێک لە واتاکانی وشەی «شایی» جۆرێک پارەیە لە کۆندا باوی هەبوو وەک: مەتالیک، پەنابات، پوول... هتاد. کە ئەم واتایە وەرگیرێ دیارە وشەی «شایی» لە «شاهی»یەوە گۆڕاوە هەروەک وشەی «شایی» بە واتای هەڵپەڕکێ لە «شادی»یەوە هاتوە. جا ئەگەر «شایی گر» بێتە ناو هەڵبەستەوە دەشێ مەبەست ئەوانە بن کە پارە وەردەگرن لە شایی و کەیف و هەڵپەڕکێدا وەک زوڕنائەنگێو و دەهۆڵ لێدەر و شاباشکەر، شایی گرتنەکەش دەنگ و داوی تێدا بەکار نایەت.

دەبینی چەند زەحمەتە بڕیارێک بدەیت لەبارەی واتای سەرلەبەری بەیتەکە، لە حاڵێکدا پێت نەکرێ بڕیار بدەیت بۆ واتای تاکە وشەیێکی ناو هەڵبەستەکە، گەر بڕیاریشت دا واتای وشەکە چیە ئەوساش بۆت ناکرێ بزانیت جۆری گونجانی لەگەڵ وشەکانی تردا چۆن دەبێ؟

بەکارهێنانی وشەی واتا مەیلەو بزرکارێکە نالی زۆر جارانی کردوە وەک کە لە بەیتێکدا وشەی «باخە»ی بەکارهێناوە کەم کەسیش نەبێ نازانێ بە واتای «کیسەڵ»ە. من خۆم ئەم واتایەم لە مامۆستا هێمن وەرگرت ئەویش لە فەرهەنگێکی فارسیدا دیتبوو، بەیەتەکەش ئەمەیە:

لەم دنی فراتە کە دەکا پەشە بە عەنقا

نەک لەم خمی نیلە کە دەکا باخە بە تیمساح

لە نوسخەکانی دیوانی نالی لە جیاتی «باخە» لە هەموویاندا «باغە» نووسراوە کە چ گومانێکی لێ دیار نادات لەگەڵ ڕواڵەتی تێکڕای بەیتەکە. وشەی «فراتە»ش لە دیوانەکاندا «قەرابە» نووسراوە کە دەزانین ڕواڵەتی «فرات» لەگەڵ «نیل»دا ڕێک دێت.

بە هەمە حاڵ ئەم وردەکارییانە تا ئێستا کەس نەیکردوە، منیش لێرەدا تەنها سرنجی نالی دۆستانیان بۆ ڕادەکێشم ئەوەندەش بە دەنگ دێم کە بڵێم براینە بە داخەوە من جارێ هەر ئەو ڕواڵەت و دیمەنانەم هاتوونەتە بەرچاو کە ڕەنگە هی تریش هەبن لە بەیتەکەدا، نەشم توانیوە بە مل مەعنای ڕاست و دروستیاندا دابڕم وەیا تەرجیحی ڕواڵەتێک بەسەر یەکێکی تردا بدەم. بەڵام هەرچۆنێک بێت هاتنی «دەنگ و داوا» ئەگەر تەنها وەک سێبەرێکی دوو وشەی «دەنگ و داوا»ش بێ لەناو هەڵبەستدا دەبێ تێبخوێندرێتەوە و لە کەس قبوڵ ناکرێ بڵێ کوا کەینێ ئەمن ئەم «دەنک و داو»ەم دیتبوو بەڵام بایەخم پێ نەدان بەهۆی ئەوە کە لە بەیتەکە بێگانەن، چونکە دیارە پاش ئەم هەموو دەنگ دانەوەی فرەواتایی شیعری نالی هەرکەسێک «دەنک و داوی» وەها لە هەڵبەستێکیدا ببینێت خێرا لێی دەچرپێنێ، بەڵکە خۆشی پێ هەڵدەداتەوە.

با بێینەوە سەروکاری «حەڵاڵی بێ نیکاحی حور...». من ڕاستی بەیتەکە وەها دەزانم وەک لە پێشەوە نووسیم:

حەلالی بێ نکاحی حور «عینم»

بە جووتە نازیری شرع و فەتاوا

دەستنووسم دیتوە مصرەعی دوەمی وەها نووسیوە: «بە جووتەی ناظری شرع و فتاوی».

بەهەمە حاڵ هەر کامێک لەم شێوە نووسینانە ڕاست بن فەرقێکی بنجی بە واتای بەیتەکە ناکا هەرچەند ئەوەی من پەسەندم کردوە ڕێکتر دێت لەوانی تر لەگەڵ یەکێک لەو واتایانەی بۆی چووم، کە ئەمەیانە: «حەلاڵی بێ نیکاحی، عەینم»

لێرە بە پێشوە هەرچارە وشەی «عینم»م دەخستە ناو کەوانەوە بۆ ئەوە ڕێم هەبێ، دواتر کە دەکەومە سەر شیکردنەوەی بەیتەکە، بە پێی داخوازیی واتا تلفظەکەی بهێنمە سەر ڕێنووسی کوردیی نوێ. لێرەدا وشەی «عەینم» کە یەکێکە لە خوێندنەوەی «عینم»ی سەردەمی نالی واتای بەیتەکە بەم جۆرە بە دەستەوە دەدات:

حەلاڵی بێت نیکاحی حور، چاوم

بە جووتە نازیری شەرع و فەتاوا

دەزانین «نیکاحی حور» لە بەهەشتدا حەلاڵە، ئەم حەلاڵییەش مەعلووم کراوە هەم لە شەرعدا و هەم لە «فەتاوا – فتاوی»دا. دەشێ «فتاوی» ڕێژە جەمعی وشەی «فتوی» بێ کە واتای فەتوادان بە گشتی دەگرێتەوە، مەبەست کتێبی «فتاوی»ی «ابن حجر» بێت کە یەکێکە لە کتێبە عومدەکانی ئیسلام.

«نکاح» بە واتای مارەکردنە، بەڵام لێرەدا کە نیکاحەکە لە نێوان حۆریی و چاودا بێت دیارە هەر دیتن مەبەستە. دیتنی ئافرەت لە ئیسلامدا حەرامە، وەک دەزانین، بەڵام لە هەمان ڕێی «شەرع و فەتاوا»وە دیتنی حۆری حەلاڵە کەواتە چ بێشەرعی و ناجایەزیی ڕوو نادات کە نالی تەماشای «حەبیبەی ماڵیاوا» بکات چونکە ئەویش حۆرییە.

ئەم حەلاڵ بوونە لە بەیتەکەدا بەهۆی دارشتنی ڕستەکانیەوە دەبێ، نەک من و تۆ یاریدەی بدەین بۆ نەهێشتنی ناتەواویی و کەم و کەسریی. نالی کە دەڵێ:

بە جووتە نازیری شەرع و فەتاوا

بەمەدا ڕاستەوخۆ گوتوەتی چاوم –کە دوو چاون– دیتنی حۆریان لێ حەلاڵ بێت، کە دیارە مەبەست دیتنی حەبیبەیە. حەلاڵ بوونەکەش زۆر بە ئاسایی و ئاشکرایی لە عیبارەتی بەیتەکەوە هەڵدەستێ کە دەڵێ «بە جووتە نازیری شەرع و فەتاوا». لێرەدا ئەم مصرعە سەرلەبەری دەبێتە وەصف وەیا حاڵ بۆ وشەی «عەینم – عینم» کە لە کۆتایی مصرعی یەکەمەوە هاتوە. واتە نیکاحی حور لە چاوەکانم حەلاڵ بێ کە هەردوویان بە جووتە تەماشای شەرع و فەتاوا دەکەن. وشەی «ناظر» بە واتای تەماشاکەر دێت، لەم تەماشاکردنەی شەرع و فەتاوادا چاوەکانم حەلاڵ بوونی نیکاحی حۆریان بۆ پەیدا دەبێت.

ئەم واتایە لەگەڵ ئەوەدا ڕێک دێت کە مەبەست تەنها دیتنی حەبیبە بێت بەڵام کە هەر بێین و بە وشە و واتای نیکاحەوە بلکێین ئەوسا شیکردنەوەیێکی تر لەگەڵ بەیتەکەدا دەکرێ.

وشەی «نازیر–ناظر» هاوواتای وشەی «شاهد–شایەد»ە. دەزانین نیکاحی مێینە لە نێرینە دوو شایەدی دەوێ. ئەم دوو شایەدە لە بەیتەکەی نالیدا بۆ حەلاڵکردنی مارەبڕینی حۆریەکە لە گوتەی «جووتە ناظری شەرع و فەتاوا» بە دەست دەکەون، ئەوسا شەرع و فەتاوا خۆیان دەبن بە شایەد لە بەستنی نیکاحەکەدا چونکە هەردووکیان «جووتەناظر، جووتەشاهد»ن.

واتای دووەمی بەیتەکە ئەمەیە کە لەم شکڵ نووسینەی خوارەوەدا دەدیترێ:

حەڵاڵی بێ نیکاحی حوری عینم
بە جووتە نازیری شەرع و فەتاوا

لە قورئاندا «حور عین» هاتوە.
وشەی «ناظر» بەو کەسەش دەڵێن کە حوکم و فەتوا دەردەکات، واتاکەش لەوەوە دێت کە دەگوترێ «نظر بین الناس». نالی بۆ خۆی ئەم وشەیەی بەو مانایە لە بەیتێکی تریدا بەکارهێناوە:

ئەهلێکی وای هەیە کە هەموو ئەهلی دانشن
هەم ناظمی عقودن و هەم ناظری امور

نالی دەڵێ: حەڵاڵ بوونی «حورعین» لە من بێ ئەوە نیکاح لەبەیندا بێت بە بڕیار و حوکمی جووتە «ناظر – حاکم»ی شەرع و فەتاوا هاتوە چونکە هەردوو «ناظر» کە یەکیان شەرعە و ئەوی تریان کتێبی فەتاوایە دەڵێن حۆری بێ نیکاح و مارە کردن بۆ پیاو حەڵاڵن.
جگە لەم واتایانە یەکێکی تریش هەیە مامۆستا مەلا شێخ کەریمی بیارەیی و کاک فاتیحی کوڕی بۆی چوون کە وشەی «حور» بە واتایی «ڕەشایی و سپیایی» چاو بێت وەک لە فەرهەنگدا دەڵێ «حور» زێدە ڕەشی ڕەشکێنە و زێدە سپیەتی سپیێنەی چاوە. لەم حاڵەدا بۆ وەزنی شیعر دەبێ وشەکە «حور – حەور» بخوێنرێتەوە واتای بەیتەکەش ئەمە دەبێ:
حەبیبەی ماڵیاوا نیکاحی «حور»ی چاومی لێ حەڵاڵ بێت... لەم واتایانە هەرکامێکی پەسەند کەیت ڕێ لەوانی تر ناگرێ هیچ یەکێکیشیان بە نەسەلماندنی سادە ناسڕێنەوە چونکە هونەری ڕەسەنی تێدا بەکارهاتوە کەوا دەمێکە لە ئەدەبی ڕۆژهەڵاتی موسڵماندا ڕەگ داکوتاوە. واتا لێدانەوەش چ هی ئەم بەیتانە بێت چ هی بەیتی تری نالی وەیا شاعیرێکی تر بێت هەر بەوەندە نابێ کە لە تێکڕای دەنگ و صەدای هەڵبەست واتا و وێنەیێکی گشتی وەرگرین و بڵێین ئەمەتە مەبەستی شاعیر وەک کە کابرای شارەزووریی لە کتێبخانەی مەلایێکدا گوتی ئەم کتێبانە گشتیان دەڵێن چاکە بکە و خراپە مەکە، بەڵێ ڕەنگە کابرا ڕاستی کردبێ بەڵام بەم ڕاستییە سادەیەی بێ ئامانج و سنوور نابێ بە شافعی...
پێویستی سەرشانی شیکەرەوەی بەیتی داخراو و سەرپۆش کراو و مەتەڵاویی ئەوەیە هەر وێنە و واتاییێکی کە ئیددیعای هەبوونیان دەکات لە هەڵبەستەکەدا بیان باتەوە بۆ ئەو وشەیە و ڕستەیەی کە لێیەوە ڕەنگ دەدەنەوە. نەختێک بەو چەند ڕوپەڕەی دواییەدا بگەڕێوە دەبینی گوتەی «حەڵاڵی بێت نیکاح، حەڵاڵی بێ نیکاح» هەر جارە ڕوو لە ئامانجێک دەکات و دەیپێکێت، ئەگەر لە بەیتەکەدا وەیا لە شوێنێکی تری هەڵبەستەکەدا ئامانج و ڕێ و جێ بۆ یەکێک لە شێوە خوێندنەوەکان نەدۆزیتەوە دیارە ئەو شێوەیان دەپووچێتەوە بەڵام دیسان دەبێ پەلە نەکەین لە پووچاندنەوەی ئەو شێوەیان چونکە لەوانەیە ئامانج و ڕێ و جێشی هەبێ لە شیعرەکەدا و ئێمە چاومان نەیبینێت وەک ئۆینی دامە و شەترەنج کە لەسەر تەختەی یاریەکە هەیە و شارەزا نەبێ تێیناگات، تەنانەت ئەگەر هیچ ئامانجێکیش نەدۆزرایەوە وەیا نەبوو کەوا

تیرێکی واتای تێبگیرێت، دەبێ نرخێک هەر بدرێ بە هێنانی شێوەیێک لە لاوە بۆ ناو هەڵبەست هەرچەند شێوەکەش خۆی بە واتاییکەوە نەبەستێتەوە وەیا بەسەر بنگەیێکەوە نەوەستێتەوە و وەک دووکەڵیش ڕەهەوا کەوێت چونکە هەموو وێنەیێک لە هەڵبەستدا دەبێتە هۆی تێروپڕیی و سامانی دارِشتنەکەی بە مەرجێک هەناسەسواریی و نالەباریی و عەیبی ئەوتۆیی پەیدا نەکات. شاعیر لە گەرمەی هەڵڕژانی سۆز و عاتیفەیدا لایەنی ئاراییشت و جوانکاریی و هونەر فەرامۆش ناکات و هەمیشە خەریکە بە پێی دەسەڵات و لوان، دراوسێیەتیی نێوان شێوە و ناوەڕۆک بکا بە پێوەندییێکی سوودبەخش، دیارە لەم مەیدانەشدا هەتاکو شێوە پڕڕەنگ و وێنە و نەقش و نیگار بێ پتر لێی دەوەشێتەوە ببێت بە زەرفی واتای ورد و ناسک و شەنگ. نالی خۆی لە بەیتێکی زۆر بەسۆزدا ئەمەی گوتوە:

لە جگەر گۆشەیی شیعرم مەدە مەعنایی خراپ
بێ خەتا کەس نیە ڕازیی کە لە ئەولادی درێ

مەعنا لێدانەوەی خراپی شیعریش لە سێ ڕێبازی ڕاستە شەقامەوە دێت جگە لە لارێ و کوێرەڕێی ئەوتۆ لێرەدا جێی باسکردنیان نابێتەوە، یەکێک لەو ڕێبازانە ئەوەبوە کە لێی دەدوام وا ئێستاش دێتەوە پێشمان:

ڕێبازی یەکەم: مەعنا لێدانەوەی هەڵە و چەوت و کەموکەسر.

ڕێبازی دوەم: لە لاوە خواستنەوەی واتا بۆ ناو هەڵبەست.

ڕێبازی سێیەم: کەم کردنەوەی مەعنا و سڕینەوەی جوانی و ئاراییشت، کە ئەمەیان یەکجار لە هی دوەم ناپەسەندترە.

ئەم ڕێبازەی سێیەمە کە پووچاندنەوەی نرخی هەڵبەست دەگرێتەبەر ئەگەر لە ئەنجامی نەزانینی سادەوە بێت عوزری نەزانین شەفاعەتی بۆ دەکات، زیانیشی زۆر کەمتر لەوەی بە ئانقەست وەیا بۆ هەر مەبەستێکی تری زاتی بێت پێرەویی بکرێت چونکە مرۆڤی نەزانی سادە ڕێگای تێگەیشتن و فێربوون لە ڕووی خۆی و حەقیقەت داناخات، بە خۆڕاییش بەردەوام نابێ لەسەر کزکردنەوە و کوژاندنەوەی تروسکەکانی واتا و ئاراییشتی هەڵبەست بە پێچەوانەی مرۆڤەکەی تر کە بڕیاری داوە چ ڕاستییان نەسەلێنێ مەگەر ئەو ڕاستییەی کە دڵخوازی خۆی و مەبەستە زاتییەکەی بێت.

لەبەر تیشکی ئەم بەدیهییە ڕووناکەدا ڕێمان هەیە بڵێین پێویستی هەرە سەرەتایی بەسەر شانی شیکەرەوەی شیعری شاعیرێکی ورد و مووقڵاش و قووڵی وەک «نالی»یەوە ئەوەیە چاو و دڵ و هەست و نەستی خۆی بۆی نەچوە، هەمیشەش لەم و لەو بپرسێ بەڵکو، کوردیی گوتەنی خوا و ڕاستان، مانایێکی شرایەوە ببیسێ لەوانەی بە پرسین نەبێ نەگاتە دەسەڵاتی مەحدودی خۆی.

بەولای ئەم پێویستییە سەرەتاییەوە پێویستی تری سەخت و زەحمەت زۆرن بۆ گەیشتن بە توانای پلە بەرزەکەی دیراسەی شیعری نالی وەیا هەر یەکێک لەو شاعیرە ناوادارانەی ئیسلام کە ناویان لە مەیدانی وردەکاریی و فرەواتایی و توێکڵداریی و صەد تۆژاڵیدا دەرکردوە. بە عادەت هەموو شیعرێک و هەموو هونەرێک و هەموو بەرهەمێکی جوان و ورد جۆرە داپۆشراوییێکی تێدایە کە جودای دەکاتەوە لە گوتەی بازاریی و بەرهەمی ساکار لە ڕووی ئاسانی و زەحمەتی تێگەییشتنەوە کە ئەمەش دیاردەیێکە نابێ چاو

و مێشکمان لێی بڕەوێتەوە و ببێتە دوشمنی، بە پێچەوانە دەبێ لێی ڕازیی بین و کەیفمان پێی بێت چونکە لە هەر زەحمەتێکی فکری و هونەرییدا جۆرە سەرەژوور چوون و پێشکەوتنێک هەیە کە جێی شانازیی پێوە کردنە نەک لێ زویر بوون.

تاوانبار کردنی بەرهەمی پێشکەوتوو خۆی لە خۆیدا تاوانێکی گەورەیە. کە بێین ئەم دەستورانە و مەبدەئانە بەسەر شیعرەکانی نالیدا بگرین دەبینین بەشێکی زۆری شیعرەکان بە مەیدان و دانگ پێش تێگەییشتنی ساکار کەوتوونەتەوە. بە نموونەی ڕوون کردنەوە دەڵێم بۆ تێگەییشتنی تەواوی واتای سەرلەبەری بەیتەکانی نەعتی «ئەی ساکینی ڕیازی مەدینەی مونەووەرە» دەبێ چەندین مەیدانی زانست و شارەزایی ئەو سەردەمە بڕابێت کە نەعتەکەی تێدا هۆنراوەتەوە:

١– شارەزایی بە سەراجوملەیێکی ئەدەبی کۆنی ئیسلام.

٢– شارەزایی بە زوربەی زانستەکانی ئیسلام.

٣– شارەزایی بە «منطق – ژیربێژیی».

٤– شارەزایی بە مەشرەب و شێواز و تایبەتیەکانی بوێژیی نالی.

٥– شارەزایی بە لەبەریەک هەڵوەشاندنی گوتە و واتای داخراو.

سەرەڕای ئەمانە و شتی تریش دەبێ سەلیقەیێکی ڕاست و زەکاییێکی زگماکیش یار و یاوەر بێت ئەگەرنا هەموو پەلەفڕە و دەست و پێ لێکدانێکی جیهان بایی یەک تۆسقاڵ سوودی نابێ بۆ تێگەییشتنی ئەم دوو بەیتە:

شوبهەی نیە کە شەمس و قەمەر سێبەری ئەون
نیسبەت بە هەردوو وەجهـ وەکوو نور و سێبەرە
بورهانە صورەتی بەشەری چونکە نورە نور
بێ ظیللە ماسیوای بە دوو نیسبەت موعەببەرە

دەبێ لێرەدا قسەی درێژ کورت کەینەوە بۆ ئەوە جڵەوی خامە بادەینەوە سەر لایەنی «خۆ لادان» لە ڕەوشتە ناجایەزەکەی ڕووتاندنەوەی هەڵبەست لە واتا و ئارایشت.

نالی کە ئاگاداری خۆیەتی چی کردوە لە جیهانی پڕ ئەفسوونی واتادا، چەندین جار پەردەی مێشک و گوێی ئەدیبانی لەراندۆتەوە بە گوتەی صەریحی پڕ بەدەم و پڕ هاوار بۆ ئەوەی ورد بنەوە لە واتای شیعرەکانی و دەستیان بگاتە گەوهەرە قەپێلک داخراوەکانی ژێر دەریای هەڵبەستی. لەم هاوارانەی نالیدا هەرچی عوزری خۆنەزان کردن و بێباکی و سەرڕۆیی و تەسکپێوی هەیە بە دەست کەسەوە نەماوە لە ئاست شیعرەکانی چونکە عەرەب گوتەنی «اعذر من انذر» وەیا کورد گوتەنی «ئەوی کەس بێ ئەلفێکی بەسە». سەیری چەند بە پەرۆشەوە لە بن گوێی ئەدیب و شیعردۆستی کورددا دەچریکێنێت:

بەحری غەزەلم پڕ لە دوڕ و گەوهەرە ئەمما
غەوواصی دەوێ یەعنی بە تەعمیقی بزانە

پڕ دانەیە ئەمما نە وەکو دانەیی چەڵتووک
بەحرم وتووە نەک وەکو گۆلی مەرەزانە

تەنانەت لە وشەی «بەحری غەزەل»دا دانە گەوهەرێکی واتای داناوە کە ئەگەر بۆی قووڵ نەبینەوە دەستمانی ناگاتێ. ئەم «بەحر»ە کە لەتەک گۆلی مەرەزەدا دابنرێت دەبێتە «دەریا» لە رووی قووڵی خۆی و تەنکی گۆلە مەرەزەوە، کە ئیزافە وەلای «غزل»یش بکرێت دەبێتە «بەحری عروض». سەیریش لەوەدایە کە بەیتەکان بە دوا بەیتێکی تردا دێن ئەویش لەلای خۆیەوە هێزێکی زیادیان پێ دەدا. پێشتر نالی گوتوەتی:

لەو شێخە بە کەم مەگرە کە شێخە نە مریدە
ئەم ریشە بە سەردار و رەئیسێکی بزانە

وشەی «بزانە» لە کۆتایی بەیتەکەدا بە رواڵەت واتای «اعلم»ی عەرەبی دەبەخشێ، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەم واتایە فڕی بەسەر ناوەڕۆک و مەبەستی بەیتەکەوە نیە چونکە نالی دەیەوێ هەجووی شێخەکە بکات نەک پێیدا هەڵ بڵێ. وشەی «بزان» جەمعی وشەی «بز»ی فارسیە بە واتای «بزن»، بەو پێیە بەیتەکە دەبێتە «ئەم ریشە بە سەردار و رەئیسێکی بزنانە» کە دەزانین بزنیش ریشی درێژە. کەواتە نالی حەقیەتی گورج پێمان بڵێ «بەحری غەزەلم...» هتاد چونکە تازە بە تازە وشەی «بزان»ی کردۆتە گەوهەر و خستۆتیە بەحری غەزەلەوە. ئێمە کە چاومان ئەم وردەکارییە نەبینێ خەتای چاومانە و لەبەر بێباکی وەیا درشتبینی خۆمانە لەوەشدا چ حەقێکمان بە دەستەوە نەماوە چونکە نالی رێی هەموو گلەیێکی لێ بڕیوینەوە. پێم بڵێ دەبێ هەڵوێستمان لە ئاست ئەم بەیتەدا چی بێ؟

نالی بە داوە شەعری دەقیقی خەیاڵی شیعر
بۆ ئەو کەسەی کە شاعیرە صەد داوی نایەوە

ئێمە کە بزانین نالی داوی بۆ ناوینەتەوە چۆن رەوایە سووک بەسەر شیعرەکانیدا تێپەڕین! ئەم سووک تێپەڕینەمان یەکسەر پابەندی داوەکانمان دەکات و چ عوزرێکیشمان بە دەستەوە نابێ چونکە وەک گوتم «لقد اعذر من انذر». بێگومان دەبێ هەر ئەم بەیتە خۆی داوی وەهای تێدا بێ کە ئەگەر ورد نەڕۆین پێیەوە بین. من یەک دوو داوم لێ هەڵگرتۆتەوە هونەرەکەش بۆ نالی دەگەڕێتەوە چونکە خەبەرداری کردمەوە لە داوەکانی. یەکێک لەوان ئەمەیە کە شیعرەکە بە شێوەیێکی تر بخوێنرێتەوە چونکە لە رێنووسی کوردیی کۆندا هەردوو خوێندنەوە جایەزە: «نالی بە داوە شیعری دەقیقی خەیاڵی شەعر»
بەمەدا خەیاڵی داوە موە باریکەکانی یار بۆتەوە داوە شیعری غەزەلەکە. وەصفی «دقیق»یش دەشێ بۆ شیعرەکە و بۆ شەعرەکە بگەڕێتەوە و هەردووکیان ببنە ئەو داوە کە بۆ شاعیرانی ناوەتەوە.
«خەیاڵی شەعر»یش هەڵدەگرێ «اضافەی بیانی» بێت نەک «اضافەی حقیقی» ئەوساش واتاکەی ئەمە دەبێ «ئەو خەیاڵەی وەک شەعر باریکە». ئەمەیان داوێک.
داوی دوەم لە کۆتایی بەیتەکەدایە. کە دەڵێ «صەد داو» لە نووسیندا دوو پیتی «د» دەنووسرێ بەڵام لە

گوتنەوەدا یەک «د»ی گوشراو دەدرکێنرێت. نەختێک زمان ڕەهاکە لە گوشینی «د»ەکە وشەکان دەبنە «صەداو – صەدئاو» مصرەعەکەش ئەمەی لێ دێتەوە «بۆ ئەو کەسەی کە شاعیرە صەد ئاوی نایەوە».

چاوێک بە غەزەلەکەدا بگێڕەوە دەبینی دەیان وشەی وەهای تێدایە کە هەمووی واتای «ئاو» ڕادەگەیەنن چ بە حەقیقەت بێ چ بە مەجاز وەیا تەئویل وەک وشەکانی «تەڕیی – بەهار – پشکۆکوژانەوە – گوڵگەشانەوە – خەڵووزکوژانەوە – فیض – نارمردن – خاکژیانەوە – هەنجیر – شیر – صاف – طفلی عینەب – ڕشانەوە– سونبول – شمشادی تازە – خضرا – برد العجوز – تەڕایی عیشق – بەفر – سارد و گەرمی خەجالەت – توانەوە – چاوە – زانەوە – ڕەوان – زەمزەم – فرات – نیل ...».

لەبەر تیشکی فنونی شیعردا هەموو ئەو وشانەی دژی ئاو و تەڕایین وەک «پشکۆ، مەجمەر، خەڵووز، وشکی، عاصی، نار، خاک...» لە ڕێی «مفهوم المخالفه»وە، ئەوانیش واتای ئاو و تەڕایی دەبەخشن وەیا تارماییان دەخەنە ناو بەیتەکانەوە. نالی زۆر ڕاستی کردوە کە دەڵێ بە داوەشەعری خەیاڵی شیعر صەد «ئاوی» نایەوە چونکە سەرلەبەری بەیتەکانی بە «ئاو» ئاوسن، من و تۆش لەسەر وردبینی و خوردکردنەوە و بۆچوونی شاعیرانە پەکمان کەوتوە بۆ دیتنی ئەم هەموو ئاو و تەڕاییەی کە خەریکە دامەنی خەیاڵی شیکەرەوە تەڕ دەکاتەوە.

لەم نووسینە بەرتەسکەی کە بە ئەسڵ بۆ گوتار دەستی پێ کراوە و لەژێر ئەو ناونیشانەدا کە سایەی بەسەردا هێناوە، چی تر مەودای بە دواکەوتنی تایبەتیەکانی شیعری نالی پەیدا نابێت چونکە هەوڵدانی گرتنەبەری هەموو ئەو تایبەتیانە وا داخوازیی دەکات لە پێشەوە ناونیشانەکە بگۆڕێت و لە جیاتیی «چەپک» وشەی «گوڵزار» خۆی ببێتە ناونیشان، نووسینەکەش لە گوتارەوە بکرێ بە دیراسەی دوور و قووڵ و پشوودرێژی چەند ساڵە. کوردیی گوتەنی، ئەم دەرنگە بەم زوە ڕاناگات، لەبەر ئەمە لێرەوە بە ناچاری جڵەوی خامە با دەدەمەوە سەر لاباسێک کە لەیەکەم ئاڵقەی ئەم ڕیزە گوتارەدا کردوومەتە بەڵێن و تا ئێستا وەک قەرز هەر بە سەرشانمەوەیە ئەویش لاباسی «ناوەڕۆک»ە لە شیعری نالیدا.

لە تێکڕای ئەم نووسینەدا، بە پێشەکی و ڕیزە گوتارەکانیەوە، تا ڕادەیێک زمانی خامە گفتوگۆیەکی لە بارەی ناوەڕۆکەوە کردوە هەرچەند ناوەڕۆکەکەش مەبەستی بنجی گفتوگۆیەکە نەبووبێ، وەیاخود بەشێکی کەم لە ناوەڕۆکی هەموو شیعرەکانی نالی باس کرابێت، چونکە شتێکی ئاشکرایە واتای هەر بەیتێک و غەزەلێک و قەصیدەیێک هەندێکی تێکڕای ناوەڕۆک بە بەر خۆی دەدات، جا بە ناوی ناوەڕۆکەوە بێت یاخود لە زیمنی مەبەستێکی تردا بێت وەیا هەر بە جارێ چ ناونیشانی نەبێت.

ئەوەی ڕاستی بێ ئەگەر لە باسی ئەدەبی، وەیا مرۆڤایەتی بە گشتی، خۆمان نەکەین بەو قەسابەی کوشتە پەل پەل دەکا و هەموو ئەندامەکانی لەیەکتر جودا دەکاتەوە، هیچ ڕێگەیێکی ڕاست و ڕەوا نیە لێمان بسەلمێنێ کاری ئەدەبی لەبەریەک هەڵوەشێنین و سەر و دەست و پێ و کەوڵ و هەناوی لەیەکتر جودا کەینەوە و بە خۆشمان بڵێین خەریکی کردارێکی خالقانەین چونکە بەرهەمی ئەدەبی هەمووی بەیەکەوە دەزێ و پێش زانیشی بەیەکەوە لە هەناوی خاوەنەکەی ڕسکاوە و فراژوو بوە. وا دەبێ ناوناوە بە ناچاریی باسی لایەنێکی یەک لەو بەرهەمە ئەدەبیانە دەکەین بە ناوی شیکردنەوەی ئەو لایەنە کە خۆی بەتەنها مەبەستە لە ڕوون کردنەوەدا ئیتر لە تێکڕای بەرهەمەکە دادەبڕێت و بە سەربەخۆیی باسی دەکرێت لە حاڵێکدا دەزانین هەموو لایەنەکان بەیەکەوە هاتوون و تێکڕایان بەشدارن لە هەڵنانی لەش و واتا و شێوە و شێوازی کارەکە، هەر تاکێکیش لەو لایەنانە مەیلەو تێکەڵ لەگەڵ ئەوانی تردا وەیا بە دوای

پێوەندیی بەوانی تروەوە بەستراوەتەوە کە ئەمە ڕێ نادا لەیەکتر جودا بکرێنەوە بێ ئەوە تێکەڵیەکە پەکی بخرێ وەیا داوەکانی پێوەندیی بپچرێن.

ئەم ناچارییەی پەلەپەلکردن دەبێ لە سنووری مەعقولدا بوەستێ، مەعقولیەتیش لەوەوە دێت زەرەری بێ پربوونەوە بە بەرهەمە پەلپەلکراوەکە نەگات، زەرەرەکەش بە زۆری بریتییە لەمانە.

١- نەهێلانی تێکەڵیەکە و هەڵبڕینی داوەکانی پێوەندیی بەو جۆرەی کە لە نرخ و بایەخی هەموو لایەکیان کەم دەکاتەوە چونکە دیارە تێنەخوێندنەوەی ئەو شتانەی کە هاوبەشن لە پێکهێنانی نرخێکدا دەبێتە شاردنەوەی نرخی هاوبەشیەکە کە خۆی بەشێکە لە نرخەکە.

٢- بێئاگایی لەوەی کە پەلپەلکردنی بەرهەم بە ناچاریی دەکرێت و ڕەوا دەدیترێت، چونکە بێئاگایی لەم ڕاستییە یەکسەر دەبێتە هۆی بێ پەروایی لە ئاست هارمۆنی و هاوبەشی و تێکبەسترانی ناوەکی سەرلەبەری بەرهەمەکە. چ فەرقێکیش نیە لە بەینی ئەوەی بێ پەروایی نرخی بەرهەم پێ شێل بکات وەیاخود تێنەگەییشتنی سادە، چونکە بە عادەت نەزانینەکە خۆی بنگەی بێ پەروایییەکەیە.

٣- دووبارە نەخستنەوە سەریەکی پەلپەلکراوەکان بۆ پێکهێنانەوەی سەرلەنوێی بەرهەمەکە. تۆ کە هاتی بەرخێکت کوشتەوە و ئەندامەکانیت لەیەکتر جودا کردنەوە و هەریەک لەوانت بە جۆری سەربەخۆ وەصف کرد، تێکڕای وەصفەکەت نابێتە وەصفی بەرخەکە چونکە بەرخ سەر و دەست و دونگ و کەوڵ... و قاچەکانی بەیەکەوەن، سەرەڕای بەیەکەوە بوونیان یەکتریش تەواو دەکەن، ئەمەش حاڵەتێکە هەموو شتی زیندوو تێیدا بەشدارە، نەک هەر زیندوو هەموو شتی زۆر لایەن و موتەکامیلیش وەک زیندوو وایە کە لێکدابڕینی کەرتە پێکهێنەرەکانی تەکامولەکەی دەکوژێ. بەو پێیە دەبێ دوای هەڵوەشاندنی ناچاریی بەرهەم، سەرلەنوێ بەیەکتردا بدوورێتەوە و بە دروستی و تەواویی و سەرلەبەریی تەماشای بکرێتەوە. لەمن بە پێشەوە نووسەر هەبووە ئەم ڕایەی دەربڕیوە، تەنانەت دابەش کردنەکە ناو دەنێ «دابەش کردنی میتافیزیکی». لێرەدا من قسەی غەیری خۆم دووبارە دەکەمەوە کە باوەڕم پێی هەیە.

لەم کارەی دابەش کردن و پەلپەلکردنی بەرهەمی ئەدەبی بۆ مەبەسی شیکردنەوە و تێگەیاندن، ئەوی لە هەموان قاچ خلیسکێنتره عەمەلیەتی لێکترازاندنی ناوەڕۆک و شێوازە چونکە لەمەدا دوو کۆڵەکەی سەربەخۆ لەژێر هەیکەلی بەرهەم دەردەکێشرێت، لە حاڵێکدا هەڵبڕینەوەی بەشەکانی ناوەڕۆک دەبێتە کەرتکردنی یەک کۆڵەکە هەرچەند گرنگ بێ وەیا گرنگتریش بێ لە کۆڵەکەکەی تر کە شێوازە. بەڕاستی لەیەکتر جوداکردنەوەی ئەم دوو بەشە پێکهێنەرەی بەرهەمی ئەدەبی کەمتر نیە لە ئیعدامی بەرهەمەکە چونکە ناوەڕۆک و شێواز وەک جەواڵ و گەنم وەیاخود کیسی کاغەز و بامیە نیە هەریەکە بە جوداوازیی لە لایەکەوە هاتبن و ناوەڕۆکەکە لە جەواڵ و کیسەی شێواز کرابێت و دواتر لێی دەربهێنرێتەوە چ زەرەریش بە هیچ لایەنێک نەگەیشتبێ. پێوەندیی شێواز بە ناوەڕۆکەوە پتر و بەهێزترە لە جۆش پێخواردنی دوو پارچە مەعدەن چونکە دەشێ دوای جۆش خواردن سەرلەنوێ لە جەمسەری نێوانیانەوە لەیەکتر جودا بکرێنەوە کەچی شێواز و ناوەڕۆک لە جەمسەرەوە بە یەکتر نەگەیشتوون بەڵکو وەک لەشی مرۆڤ و پێستەکەی بەیەکەوە نمایان کردوە و هەموو لەشەکە و هەموو پێستەکە، دەوراندەور و سەرلەبەر، جۆش خواردووی یەکترن، نەخێر پێستەکە درێژەکێشانی لەشەکەیە، بەڵام بەلای دەرەوە نەک بەلای ژوورەوە.

لە زۆر نووسیناندا دەخوێنیتەوە، نووسەر باسی شێواز و ناوەڕۆک دەکات وەک ئەوەی باسی مریشک

و پەڕەکانی وەیا مرۆڤ و تووکی لەشی بکات، زۆر جارانیش لەبەر ڕق هەڵگرتن لە ڕواڵەتی تەعبیری کۆن، ناحەزانە باسی شێواز «ڕوخسار» دەکات هەر دەڵێی میکرۆبی سیلی لە لەشێکی ساغدا دۆزیوەتەوە. بەڕاستی ئەم تەرزە بۆچوونە کارێکی دوور لە واقیعە و پێوەندیی بە ئەدەب و ڕۆشنبیرییەوە نیە.

چەند سەیرە یەکێک حەز لە خانوو بکات بەڵام ڕق لە دەرگە و پەنجەرە و کەفماڵی دیوارەکانی هەڵگرێت. هەر ئەم بۆچوونە هەڵەیە وای کردوە تەعبیری «وشەسازی» بەسەر زاری هەندێ کەسدا بێت لە کاتی باسکردنی ئەدەبی لێرە بە پێشەوە.

من لە نووسینمدا وابوە بە جۆری سەربەخۆ لە شێواز «ڕوخسار» دواوم بەڵام لەبەرخاتری ئامانجێکی تایبەتی بوە نەک لەبەر بروا کردنم بە ڕەوا بوونی لێکترازاندنی شێواز و ناوەڕۆک. من لەم نووسینانەمدا وەرامی هەندێ بیرورای چەوتم داوەتەوە کە دەیەوێ یەک جۆرە ناوەڕۆکی خۆی حەزی لێ دەکات بسەپێنێ بەسەر هەموو جیهاندا. لە ئاست ئەم تەرزە تەسک دیتنەدا گوتومە ناوەڕۆک هەرچی دەبێ بابێ، بای فلسێک نرخی نابێ ئەگەر شێوازەکەی بێ هونەر و جوانی بێت. من چی بکەم لە وەعز و پەندی فەیلەسووفانە کە بە قسەی شەت و پەت دەربڕابێ، وەیا گوناهی من و تۆ چی بێ لەوەدا جنێوەکانی شێخ ڕەزا هەند تەڕ و بڕن ئاویان لێ دەتکێ! بەرهەم و ناوەڕۆک و شێواز هەموویان تەواوکەری یەک شتن وەیاخود بە هەموویان دەبنە شتێک. هەڵبەت نابێ لە بیرمان بچێ ئەمانە لە ئاسمانەوە نەبارییون، زەنەی دەروونی مرۆڤن و تێکڕایان باسی ئەو دەروونە دەگێڕنەوە و وێنەی دەکێشن هەر لەو دەمەدا کە مرۆڤەکە لە ڕێی وشەوە دەیەوێ وێنەی واتا وەیا مەبەستێک بکێشێت.

بەرهەمی ئەدەبی وەیا هونەری کە بەچکەی هەست و هۆشن، پتر لەوەی ڕەنگدانەوەی ئالیی دەرەوەی نەفس بن لەو نەفس و هەست و هۆشەدا، قیاسیان لە بەرهەمی مادی، تەنانەت زانستی رووتیش، ناکرێ کە بریتییە لە ڕیزکردنی مادەی رووت بەسەر یەکەوە وەیا تەعبیردانێکی سارد و سڕ بێ لەوانەی بەڕاست دەزانرێن لە سروشتدا. بەرهەمی مادی (وەک فابریقە، خانوو، جلوبەرگ، کەپر، پێڵاو...) وەیا زانیاریی (وەک دەستووراتی هەندەسە، ئاسمان، ڕیازیات بە تێکڕایی، ڕاستیەکانی فیزیا و کیمیا...) تێکەڵ بە نەفس و ویژدانی دروستکەرەکەی وەیا دۆزەرەکەی نابێت، لەو نەفس و ویژدانەشەوە هەڵناکوڵێن چونکە بوونی سەربەخۆیان هەیە و بە پێی یاسا و دەستووری ناو کتێبان وەیا تاقیکردنەوان مرۆڤ لێیان شارەزا دەبێ. بەرهەمی ئەدەبی و هونەریی ئەو بوونە سەربەخۆیەی نیە، بە پێی یاسا و دەستووری قەراردادەش پەیدا نابێ، لە دەرەوەی نەفس و ویژدانی خاوەنەکەی قووت نابێتەوە.

بەڵێ ڕاستە کە بوونی مادی نەبوو بەرهەمی ئەدەبی و هونەریش نابێ، بەر لەوان ئەدەب و هونەریش نابن، بەر لەوان مرۆڤیش نابێ بەڵام ئەم پەک کەوتنە لەسەر مادە بۆ پەیدا بوونی ئەدەب و هونەر نابێتە بەشێکی ئەدەب و هونەرەکە هەرووک چەمەنتۆ و شیلمان دەبنە بەشێکی خانوو وەیا دەستووری ئەرخەمیدس دیاردەیێکی سروشتییە و کاری خۆی دەکات هەرچەند ئەرخەمیدسیش نەبا وەیا نەیدۆزیبایەوە. بەرهەمی ئەدەبی و هونەریی تێکەڵ بوون و تەفاعولی نەفسی خاوەنەکەیەتی لەگەڵ بوونەوەر «موجود»دا وەیاخود لەگەڵ ئەو وێنە و واتایانە کە پێشتر لە تەفاعولی ئەوتۆیی پەیدا بوون، زۆر جارانیش ژوورخانی فیکری ئەوەندە تەجریدی دەبێتە بنگەی ئەدەب و هونەر چ پێوەندیی ڕاستەوخۆی بە مادەوە نامێنێ وەک ئەوەی کە وڕێنەی بێ سەروپێی ناو ئەفسانان بکرێ بە بناغەی هەڵبەست وەیا

چیرۆک. ئەم ورێنانە هەرچەند لە بنەڕەتدا ڕەنگدانەوەی بوونەوەرن لە مێشکی کول و لێڵی گەلی دواکەوتوودا بەڵام دوای پەیدا بوونیان کاری سەربەخۆ دەکەن. بەشی زۆری ئەو کارکردنەش بە پێچەوانەی حوکمی سەرهەڵدانیان لە مادەوە، دژی مادە و دەستوورەکانی دەوەستن تا ڕادەی پەکخستن و بێ بایەخ کردن، وەک ئەوەی کە سوود وەرگرتن لە جانەوەرێک دەبێتە هۆی تەقدیس کردنی ئەو جانەوەرە، کە ئیتر سوودی لێ وەرناگیرێ، سوودەکە بوو بەهۆی تەقدیس، تەقدیسەکەش سوودەکەی کوشت. کورتەی قسەی درێژ ئەوەیە، ئەدەب و هونەر وەک زۆرینەی دیاردەکانی کۆمەڵایەتی و ئایین و باوەڕ و نەرێت... و هتاد، بەرهەمی زاتین لە ئاکامی تێکەڵ بوونی زات لەگەڵ مادەدا پەیدا دەبێ – باشتر ئەوەیە بڵێم تێکەڵ بوونی زات لەگەڵ تێکڕایی دەروبەر بە باری مادی و مەعنەوییەوە بە هەموو چاک و خراپیەوە لەوانەی دێنە بەر هەست و هۆشی مرۆڤەوە نەک تەنها «مادە» کە بەشی تەفسیری ڕاستەوخۆی ئەدەب و هونەر ناکات.

بێگومان یەکێک لە عامیلەکانی دەروبەر، ڕابەر و فێرکەر و مامۆستا و دەرسدەرە کەوا پتر لە مادەی کەڕ و لاڵ وەیا نەریتی قاڵب بەستووی بێگیان وەیا بەرژەوەند و سوودی دەورەدراو بە چەندین دیواری مەنع کردن و بە عەیب زانین، دەبنە سەرچاوەی کارتێکردن. چونکە ڕابەر و مامۆستا کە خۆیان بەقەدەر هەر مادەیێکی ئەم جیهانە مادەن، زمان و مێشکیشیان هەیە بەکاری دێنن بۆ ئیقناع کردن وەیا ترساندن وەیا بەهەڵە بردن وەیا ڕێی ڕاست نیشان دان «کە ڕابەرەکە بەڕاستی دەزانێ، لەوانەشە چەوتترین ڕێگا بێت» وەیا بە کوشت دان... وەیا... وەیا.

لەبەر تیشکی ئەم لێکدانەوانە و تێبینیانەدا من ڕێگە بە خۆم دەدەم باسی «ناوەڕۆک» بکەم لە شیعری نالی کە بە ناچاریی دەبێتە باسکردنێکی دابەشکەرانە و لەبەریەک ترازێنانە، لە حاڵێکدا ئەو بەشانە بەیەکەوە بەستراونەوە زۆر جارانیش لە یەک بەیتدا تێکئاڵاون ئیتر تێکئاڵانی دۆستانە بێ وەیا چەشنێکی تر بێ وەک ئەوەی لەم بەیتەدا دیار دەکەوێ:

مرادم زیللەت و پارانەوەی حاڵە نەوەک نەعتە
بە چەند بەیتێکی کوردانە کە قورئانت ئەنا خوانە

لێرەدا ناوەڕۆکێکی خۆ بە کورد زانین کەوتۆتە بەر دەست و پێی ناوەڕۆکی ئایینی، بەڵام دەبێ لەبیر نەکەین هەردوو ناوەڕۆک لە بەیتەکەدا بەیەکەوە جۆش خواردوون و بە زۆرەملێی وەک ئەم باس کردنە نەبێ لە یەکتر جودا ناکرێنەوە چونکە جودا کردنەوەیان هەم شیرازەی هەڵبەست هەڵدەوەشێنێ و هەم نەفس و ویژدانی نالیش دەکا بە چەند دەرگە و دەربوونە کە لە ڕاستیدا یەک نەفەس و یەک ویژدانە هەردوو ناوەڕۆک و سەرلەبەری بەیتەکە و قەصیدەکە و شێوازەکە و فنونی شاعیریەتەکەی لێهەڵکۆڵیوە وەک ئاوی سەرچاوە، چ پێککەوتنەوەیێک و نەگونجانێکیشی هەست پێ نەکردوە لە بەیەکەوە هاتنی دوو ناوەڕۆکەکەدا کەوا ڕەنگە کوردێکی دڵگەرمی ئەم سەردەمە لە کز بوونەوەی واتای کوردایەتی بەرانبەر ئایین لە هەڵبەستەکەدا هەستی ناڕاحەتی بکا چونکە چەندین هەڵبەست و نەشیدی ئەوتۆ دەبیەت هەموویان دژی ئەو قەناعەتەی ناو بەیتەکەی نالین:

ئەرێ ئەی کوردستان کوردستانی جوان
گەورەمی ژینمی خوامی بێگومان

ڕەنگە کوردێکی چینپەروەر لە کزبوونەوەی تێکڕای کورد بەرانبەر ئایین ناڕاحەت نەبێ بەڵام ئەگەر خەلە و خەرمان و فەلاح و کرێکاری کورد کز بوویایە نارازیی بوویایە و بە گژ نالیدا چووبایە. بێگومان کوردێکی دینپەروەریش بایی ئەرز و ئاسمان لەم بەیتەی «کوردستانی جوان» وەتەنگ دێت و بە کوفری بێدەمەتەقەی دەزانێ، مرۆڤی واش هەیە لە هیچ کامێکیان وەتەنگ نایەت، هی واش هەیە نەک هەر وەتەنگ نایەت بەڵکو لە هیچی ناگا تا وەتەنگ بێت وەیا ڕای لێ بێت.

ئەم هەڵوەستە لەیەک نەچوانە بەرانبەر تاکە بەیتێک ئاکامی تێکەڵ بوون و تەفاعولی نەفس و ویژدانی مرۆڤە لەگەڵ دەروبەر و بوونەوەردا. بابەت یەکێکە، بەڵام هەڵوەست زۆرە و گەلێکیش لەیەکتر جودان، جوداوازییەکەش لە دەربەست نەبوونەوە دەست پێ دەکا تا دەگاتە سنووری لە دژ وەستان و جەنگین. بگرە کوشتنیش. ئەم مەودایە بەرفراوانەی جوداوازیی هەڵوەست لە ئاست بیروباوەڕی ناو بەیتێکی هەڵبەستەکەی نالی بە تاکە هۆی «مادی» بەرهەست وەیا بەرژەوەند تەفسیر ناکرێ. لەونەیە دەوڵەمەندێک بەیتەکەی پێ خۆش بێ یەکێکی تر پێی هار بێ وەیاخود بابایێکی هەژار تێی نەگات و هەژارێکی تر جەزبەی بۆ بگرێت وەیاخود هەژارێک و دەوڵەمەندێک بەیەکەوە لەسەر بەیتەکە بکەنەوە و هەژار و دەوڵەمەندێکی تریش بەیەکەوە هێرش بینە سەر بەیتەکە و ئەو کەسانەی کە لە سەریشی دەکەنەوە.

پەیدا کردنی تەفسیری یەکسەر و کتوپڕی مادی بۆ جوداوازیی لە نێوان ئەو هەڵوەستانەی کە دەبوو بە هۆی یەک بوونی بەرژەوەندی خاوەنەکانیان وەک یەک وابن بە تەواویی وەک ئەوەیە تەفسیری یەکسەر و کوتوپڕ پەیدا کرێت بۆ لەیەک چوونی ئەو هەڵوەستانەی کە دەبوو بە هۆی جودابوونی بەرژەوەندی خاوەنەکانیان ئەوانیش جوداواز بن.

هەر دوو تەفسیر بە زۆرەملێ و پەکخستن و تۆبزیی نەبێ ناچێتە مێشکی مرۆڤی ژیر، چ مەنتیق و عیلمانیەتیش بە خۆیەوە ناگرێ. ئەو هەموو شتە لەیەک نەچوانە جێگەی بۆ نادۆزرێتەوە لە هۆش و گۆش و زانست و مەنتیقدا ئەگەر نەدرێنە بەر تەفسیری مادی فراوانی واقیع بە هەموو لایەنێکی مادی و نامادییەوە – فکری مادی بۆ خۆی بڕوای هەیە بەوە کە مادە سەرچاوەی هەموو ئەو شتانەیە پێیان دەڵێن مەعنەویی و من وشەی نامادیم بۆ بەکارهێنا.

جگە لە زۆر لایەنی ئەو کاریگەرانەی تاو دێنن بۆ ناو دڵی مرۆڤ، هەر مرۆڤەکە خۆی لێی دەوەشێتەوە بە پێی گۆڕانی باری زیهنی و نەفسی خۆی وەیا بە پێی داخوازیی هەڵوەستێکی کاتی وەیا زەوق و شەوقێکی ڕێکەوت وەیا بۆ تەماع وەیا لەبەرخاتر و خۆتر وەیا... وەیا... هەر جارە واتایێک و ناوەڕۆکێک بەکار بێنێت کە خزمایەتی نەبێ لەگەڵ واتا و ناوەڕۆکی هەڵبەستێکی تری.

ئەوەی ڕاستی بێ ئەم دیاردەیەی ناوەڕۆک زۆر بوون و جوداوازیی نێوانیان هەتا بڵێی شتێکی چاوەڕوان کراو بوە لە سەردەمی کۆندا چونکە ئەوسا شاعیرێکی وەک نالی وەیا شێخ ڕەزا ئەندامی ڕێکخراوێک نەبوە کە فەرمایشتی دەسەڵاتی لە خۆی بە پشتەوەتر بکاتە ناوەڕۆکی هەڵبەست و سەرلەبەری شیعری «٥» ساڵ و «٦» ساڵی وەک مۆدێلی ئۆتۆمۆبێلی «ڕۆزڕایز» یەکسان و نەگۆڕاو بێت.

یەک ئاهەنگیی واتا و ناوەڕۆک لە بەرهەمی ئەدەبی و هونەریی مرۆڤی سەر بە باوەڕی سیاسی کەوا شتێکی چاوەڕوانکراو و بەرچاوە لە ژیانی ڕۆژانەدا، شتێکی نامومکینە لە شیعری نالی و غەیری نالیدا کە چ تەبلیغاتی ڕەسمی و سیاسی نەهاتووە ڕاوێژی هەڵبەستەکانی بۆ ڕەنگرێژ کات و قاڵبی فکر و ناوەڕۆکەکانی بهاوێتە بەر ڕیشە و خامەوە.

نالی لەو پەراوێزەدا کە ژیاوە و بیری کردۆتەوە و هەڵبەستی گوتوە بە دڵخوازی خۆی ناوەڕۆکی هەڵبژاردوە و فۆرمی بۆ داناوە. هەروەک گەشت و گەڕانەکەی بە شام و تورکیا و حیجازدا لە ئاکامی بەیەککەوتنەوەی تەکانەکانی پەلەفرەی ژیانی خۆی لەگەڵ واقیعدا، بەبێ دەرچوونی ئەمری ئیداریی رووی داوە هەروەهاش ناواخنی شیعرەکانی لە تەندووری دەروونیەوە زمانەی کێشاوە، نە سولطانی تورکیا و نە پاشای بابان و نە دەرەبەگی هەولێر و نە توجاری شام و نە چینی هەژار و ناوەنجی و نە هیچ شتێکی وەها مادی و بەرهەست پێیان کردوە.

هەموو ئەو قسەوقسەڵۆکە بێ سەروپێیانەش کە دەڵێ شیعری نالی و ئەمسالی نالی خزمەتی دەرەبەگی کردوە وەیا فکری دەرەبەگی کوتاوەتەوە لە تاکە سەرچاوەی کەم زانینەوە هەڵدەقوڵن بە یارمەتی گرۆپفی ڕقهەڵگرتن لە ڕابردوو کە لەسەر هیچ بنجێکی زانست وەیا ئینساف وەیا خێرخواهی وەیا مرۆڤ دۆستییەوە هەڵنەستاوە. بە پێچەوانە چەندی بڵێی کاری سەلبی دەکاتە سەر دڵ و مێشک و عاتیفەی چینی نەوباوی خوێندەواران کە لە هیچە و بە خۆڕایی دەیانکا بە دوشمنی نرخدارترین میراتی کوردەواریی. لێرەدا بە موناسەبەی جێگە ناوی کتێبێکی زۆر مەشووری زۆر مێشک غەڵەتێنم بە بیر دێتەوە کە لە ساڵانی ١٩٦٠ دەرچوو بە ناونیشانی «وعاظ السلاطين» هێرشی سەختی دەبردە سەر زانا و ئەدیبەکانی سەردەمی کۆن گۆیا بلوێرژەنی خەلیفە و مەلیکان بوون لە حاڵێکدا تاک تاکەی ئەو زانایە و ئەدیبانە نەبێ خەلیفە و سولطانیان تێنەخوێندۆتەوە، کەچی لە دەمی بڵاوکردنەوەی کتێبەکەدا زوربەی ئەدیبەکانی عێراق بلوێرژەنی عەبدولکەریم قاسم بوون. سەیریش لەوەدا بوو بە ڕادەی تێهەڵکشانی ئەدیبەکان لە داوای شۆڕشگێڕیدا تێهەڵدەکشان بەرەو «قاسم پەرستی» کەسیش خەیاڵی بۆ ئەوە نەدەرۆیشت دیمەنەکە بە دیمەنی ناو کتێبەکەی «وعاظ...» بگرێ و بە خۆیدا بشکێتەوە.

بەڕاستی کە مرۆڤ ئاگای لە نەفسی خۆی برا ورێنەی عەنتیکە دەکات و کۆڵێکیش کەیفی بە خۆی و ورێنەکانی دێت. هەر لە کولانەی نەفەسە بەسەهوو چوەکەی خۆشیەوە سەیری دونیا دەکات بەڵام سەیرێکی سەرەوبن و وەرگەڕاو و سەرمەوقولاتە لێداو. کەسێک کە سەری سووڕا وادەزانێ، دونیا و خەڵق دەسووڕێن.

نالی هەروەک خزمەتکاری تاکە کەس نەبووە خزمەتکاری چ بەرە و تاقمێکیش نەبووە. فکر و بیروڕای هیچ چینێکی دیارکراویشی نەکوتاوەتەوە. کە سەیری دیوانەکەی بکەین بێ لایەنگیریی و رق لێهەڵگرتن دەبینین ئەم مرۆڤە هەڵبەستی بۆ دڵی خۆی هۆنیوەتەوە شیعرەکانیشی هەر بایی تێپەڕینی واقیع و کۆمەڵایەتی بە نەفسی خۆیدا تەرجەمەی واقیع و کۆمەڵایەتی دەکەن. لەلایەن خۆ دانە پاڵ چینی هەژار و بێدەسەڵاتەوەش هەر ئەوەندە دەگوترێ کە نالی وەک مرۆڤێکی مسڵمانی ئەو سەردەمە لە ڕێی ڕاستە باوەڕی ئایینەوە بەزەیی بە هەژاردا هاتوە وەیا دژی ستەم بوە. چ فکرەیێکی روونی فەلسەفی «هەژار دۆست» وەیا دژەوەستانێکی ئاشکرا لە «ستەمکار» لەو هەڵبەستانەوە بەرەو بیرمانەوە نایەن. ڕەوا نابینم من وەیا یەکێکی تر لە ڕێی تەئویلی داتاشراوەوە «هەڵوەست» بۆ نالی دروست کات و بەلای چینێکیدا

بشکێنێتەوە چونکە ئەو خۆی بە چ لایێکدا نەشکاندۆتەوە مەگەر ئەو لایەنەی کە مسڵمانی رووت حەزی لێ دەکات.

بەهەمە حاڵ کە ئێمە بێین لەبەر تیشکی لێکدانەوەی ئەو کەسانە کە نالی بە خزمەتکاری دەرەبەگ و کۆنەپەرست دادەنێین شیعرەکانی هەڵسەنگێنین، چارمان نامێنێ لەوەدا نالی بخەینە ڕیزی هەژاردۆست و ستەم نەویست و دادخوازان، بە پێچەوانەی ئەو لێکدانەوەیە، چونکە زۆر ئاشکرایە قسەی مسڵمانانە و خواپەرستانە ڕاستەوخۆ یەخەگیری دەسەڵاتدار و خاوەن ملْک و پارە دەبێ و لە مەعنادا تاوانباریان دەکات.

بە نموونە قەصیدەی: بەرگی دونیا هێندە کورت و کۆنە و بازارییە  حەیای شتێک دەبات کە بنگەی شانازیی و خۆپێهەڵدانەوەی خاوەن دەسەڵات و پارەیە. هەموو داخوازیەکانی تەرکی دانیشتنی ناوشار و ڕوو لە دەشت و دەرکردنیش کە لەو قەصیدەیەدا هەیە گاڵتەکردنە بە کۆشک و تەلار و دامودەزگای دەوڵەمەندەکانی شاری:

گەنجی ڕاحەت تاجی عیززەت خارجی مەعموورییە
کوندەبۆ هەر بانگەبانگ و هودهودیش هاوارییە
پۆس بە کۆڵی عامیریی فەرمووی کە وا بۆ پوختە بوون
جووتی سەر کێوان گەلێ چاتر لە تاقی شارییە

ئەم ڕووبەڕوو بوونەی نالی دژی ژیانە نەرم و نۆڵەکەی دەوڵەمەندی شاری هەرگیز لە کەس ناسەلمێنێ بلێ گوتەی وەها هەژاران دەبەنگ دەکا و هەستی شۆڕشگێرانەیان دەکوژێ بەهۆی قەناعەت هێنانیان بە کەم بایەخی کۆشک و تەلار و ژیانی ئاسوودە، چونکە هەژاری بەستەزمان ئەم شیعرانەیان نایەتە بەرچاو تاکو ئەگەر مۆرفینی تێدا بێت پێی گێژ بن، کە بۆشیان بخوێننەوە تێی ناگەن. ئەو کەسەی کە لێی چاوەڕوان دەکرێ شیعری نالی بخوێنێتەوە لە سەدەی نۆزدەمدا خوێندەواری ناو شارە کە هیچی ئەو هەژارە نیە پێی بگوترێ پرۆلیتاریا.

دەزانم لێرەدا من خەریکی کارێکی بێ سەر و پێم لەو ڕووەوە کە ئەم تەرزە دەمەتەقەیە بە هیچ کلۆجێک ڕوو لە شیعری نالی ناکات ئەگەر بە زۆرەملێ ڕووی تێنەکەین، بەڵام سووچی من چیە خوێندەواری کوردی ئەم سەردەمە دێت سواری سەر و پۆتەراکی شاعیری وەک نالی دەبێت و مۆرفین و جندۆکە و دەرەبەگایەتی لە شیعرەکانی هەڵدێنجێ و گەنجی شلک و تازەشی پێ سەر لێشێواو دەکات. دەبێ بزانین فکرێکی هەڵە کە چوە مێشکی خوێندەواری گەنجەوە وەها نەقش بەستوو دەبێ یەکجار بە زەحمەت لێی دەسڕێتەوە یاخود هەر ناسڕێتەوە.

کەواتە پێویستە لەتەک فکرێکی هەڵە یەکێکی تر هەبێ تای بکاتەوە و ئیحتیمالی ڕاستکردنەوەی سەهووی ناو هەڵەکە لە مێشکی گەنجدا بەردەست بکات بەر لەوەی سەهووەکە بە تەواوی جێگیر بێت. ئەم مەبەستەش لە بەیندا نەبێت، پێویستە ڕاستی بگوترێت و پەردەی لەسەر هەڵدرێتەوە، هەر نەبێ بۆ ئەوە لە بەرانبەر بیروڕای هەڵەدا هی ڕاستیش نموودێکی هەبێ.

لەمانەش هەموو وازبێنین و لەگەڵ نەفسی خۆماندا هەڵوەستی شەرم و حەیا بکەین دەبێ دەستی

ستەم و نارەوایی مرۆڤی بێرەحمی ئەم سەردەمە لە مردوە بەشەرەفەکانمان کۆتا کەین، لە حاڵێکدا هەمان دەست پەیکەری تەقدیس بۆ زیندووی دڕندەی کوشندەی دەوالپێی خۆسەپێنی میللەت تۆقێنی میللەت فرۆشیش بەرپا دەکات و دێتە ناو چاویشتەوە و دەمکوتیشت دەکات. کە دەوری دڕندە دەوالپێیەکەش بەسەرچوو هەمان دەست کە پەیکەری بۆ دروست دەکرد چەپڵەڕێزان دادەنێتەوە بۆ یەکێکی تر، بەڵام بە درێژایی کات هەر لە بیریەتی دژی مردوە بێتاوانەکانمان بێت و بە گوناهباریان لە قەڵەم بدات. بە دەنگ هاتنی ئەم نووسینە لەم هەڵکەوتە سەرەوبنە «فرض الکفایه»یێکە وەک نوێژی سەر مردوو کە ئەگەر کەس نەیکات هەموو کەسی زیندوو تاوانبار دەبێت.

پاش ئەمە کە بە چاکی لێمان روون بێتەوە نالی و ئەمسالی نالی خزمەتکاری دەرەبەگ و ستەم و ئەفسانە نەبوون، بەڵکو خزمەتکاری دەروون و ویژدانی خۆیان بوون ئەوەشمان زانی کە خزمەتکار نەبوونیان ئەنجامێکی ئاسایی ئەو سەردەمە و ئەو ژیانەیە کە تێیدا بەرێوە دەچوون. دەتوانین چەند شادەماری ناوەڕۆک لە ڕشتەی دیوانەکانیان هەڵاوێرین و بیان کەین بە شەقڵ و دروشمی هەر یەکێک لەو شاعیرانە. لێرەدا ڕێگەمان نیە بەراوردێکی ئەو دیوانانە بکەین بۆ پەیدا کردنی کێشانە و پێوانەیێک کە شەقڵ و دروشمی یەکێکیان لەوانی تر جودا دەکاتەوە چونکە لێکۆڵینەوەی ئەم نووسینە مەیدانی وەها فرەوانی نەگرتۆتە بەر خۆی، قسەکەش بۆیە بوو تاکوو شتێکی گرنگی تێدا بەیان کەم. کە بڵێم لەو دیوانانەدا چەند شادەمارێکی ناوەڕۆک بەدی دەکرێ، پێ دەچێ گوتبێتم شیعری ناو ئەو دیوانانە وەها لەیەکتر دەچن خاوەنیان نەناسرێتەوە لەو ڕووەوە کە دەزانین ناوەڕۆکەکانی بابەتی شیعر لە شاعیرێکەوە بۆ یەکێکی تر گۆڕانێکی بنجی بەسەردا نەدەهات، زۆربەیان یاخود هەموویان چەند مەیدانێکیان داکوتاوە کە ئەمە بە زاهیر وا دەکا بەرهەمەکان لە یەکتر بچن و بۆ هەموان دەست بدات. ئەم تێبینییە بە ڕواڵەت ڕاستە، بنجی مادیی ڕاست و دروستیشی هەیە چونکە دیارە خەریک بوونی چەند کەس بە یەک بابەتەوە وا دەکا ئاکامی خەریک بوونەکەیان لە یەکتر نزیک بێ، تەنانەت زۆر جاران وا بوە تاکە غەزەلێک بە ناوی دوو شاعیر بڵاوبۆتەوە کە ئەمە ڕووی نەدەدا ئەگەر ناوەڕۆکی ئەدەبەکەیان لە یەکتر جودا بایە وەک ئەوەی کە مومکین نیە شیعرێکی ناظم حکمت بدرێتە سلیمان نظیف.

بەڵێ دەزانم قسەکەم ئەم ئاکامانەی بەبەرەوە هەیە، وەک دیتت لە واقعیشدا ڕووی داوە، بەڵام چەند هۆیەک هەیە نەهێڵێ تێکەڵاو بوونی شیعری شاعیران ببێتە خەتەری بێ سەروشوونیی و نەناسرانەوەیان. وا لێرەدا بەوپەڕی کورتبێژییەوە لێیان دەبمەوە.

یەک لەو هۆیانەی پاراستنی شیعری شاعیر ئەوەیە کە زوربەی شاعیرەکان لە کاتی دانانیانەوە بە ناوی خاوەنەکەیەوە تۆمار کراوە و لە نێوان خەڵقدا بۆ ئەو ساغ بوونەوە کە ئەمە شتێکە وەک قەڵغان وایە بۆ پاراستنی مولکیەتی شیعرەکە. هۆیێکی تر ئەوەیە بە عادەت نازناوێک لە کۆتایی شیعردا، وەک تاپۆی خانوو، شیعرەکە بۆ دانەرەکەی دەپارێزێ. هەندێ جار وا دەبێ نازناوەکە بە یەکێکی تری وەک خۆی دەگۆڕدرێتەوە کە کێشی شیعرەکە تێک نادات و گرفت پەیدا ناکات.

نالی، سالم، کوردی، حاجی، ڕاجی، صافی و گەلێک نازناوی تر هەموویان یەک کێشن و دێنە جێگەی یەکتر، بەڵام بایەخی ئەم ئیحتیماله لە زۆر ڕێگەوە کەم دەبێتەوە یەکێکیان ئەوە بوو کە گوتم شیعرەکان لە دەمی بەوەڵەد بوونیانەوە خاوەنەکەیان ناسراوە.

دوەمیان ئەوەیە کە دەشێ لە ناو هەڵبەستەکەدا نیشانەیێک هەبێ خاوەنەکەی بە دەستەوە بدات وەک

که «قادر» مەدح کراوی ناو شیعر بێ شیعرەکە بۆ کوردیی ساغ دەکاتەوە وەیا حەبیبە نالی پێ دەناسرێتەوە. سەرەڕای ناو، وا دەبێ رووداوی ناو هەڵبەست پەنجە بۆ ئەو شاعیرە درێژ دەکا کە رووداوەکە پێوەندیی بەوەوە هەیە.

هۆی سێیەم ئەوەیە کە زۆر جاران لەهجەی شیعرەکە پەراوێزی سەر شێوان تەسک دەکاتەوە وەک هاتنی «ئە» لە پێش فیعلی مضارعەوە کە تایبەتی سلێمانی و شوێنی لەو نزیکەوەیە وەیا وشەی «دەگەڵ» هی موکریانە... بە نموونە دەڵێم ئەم مصرەعەی خوارەوە:

«بە قوربان هەورەمانێ چۆن ببینم» هی ناوچەی سلێمانی نیە چونکە خەڵقەکەی ناڵێن «هەورەمانێ» هەرچەند مەفعولیش بێت (مصرەعەکە هی حاجی مەلا عەبدوڵڵای کۆیەیە).

هۆی چوارەمی ناسینەوەی شیعر ئەو خاسیەت و تایبەتی و دەم و راوێژەیە لێی دەبێ بە شەقڵ کەوا گەلێک جاران غەڵەتی پەرەسەندوو راست دەکاتەوە. هەڵبەستێک کە لە شاعیرێک نەوەشایەوە زەحمەتە بۆی ببێ بە ماڵ هەرچەند نازناوی ئەویشی پێوە بێت و لە نووسینانیشدا بەو جۆرە رۆییشتبێت. لەگەڵ ئەمەشدا وا دەبێ شاعیرێک لە دوو شاعیری هاورێکار «مستوی» بوەشێتەوە و بۆ هەردوکانیش حیساب کرابێت وەک قەصیدەکەی «رەفیقان من ئەوە رۆییم لە لاتان» کە شۆرەتی بۆ کوردیی بەستوە بەڵام لە چەند بەیازی موعتەبەردا بۆ نالی حیساب کراوە.

لەمانەش بترازێ هۆی دیار خستنی خاوەنی شیعر لە گەلێک باری ترەوە پەیدا دەبێ کە ئێرە بۆی دەست نادات خۆی پێوە خەریک کات. بەهەمە حاڵ ئەم باسەی چەند شادەماری ناوەرۆک لە شیعری بوێژانی کوردی صەدەی نۆزدەمدا کە بەسەر لێکۆڵینەوەی شیعری نالی دا ببڕین، دەتوانین لە رێبازێکی ئاشکرا و هەموارەوە گەشتی سرنج گرتن و تۆژینەوەی تێدا ببەینە سەر مەطلەب چونکە مەتانەتی هەڵبەستی نالی وەک شوێن پێی گران مێردان، لە هەموو مەبەستێک و ناوەرۆکێکی هەڵبەستدا توورەی بەستوە هەر دەڵێی بەر پەنجەش دەکەوێت نەک تەنها چاو.

ئەو چەند شادەمارانەی من لێرەدا پەنجەیان بۆ رادەکێشم، بەراستی، لێکۆڵینەوە و روون کردنەوە و شەرح دانی سەربەخۆی دەوێ بۆ ئەوەی بە چاکی ساغ بێتەوە ئایا بۆچی نالی بە زۆری خەریکی ئەم تەرزە واتا و مەبەستانە بوە! ئایا رێی تێ دەچوو نالی لەو بارەی تێیدا بوو بە واتا و مەبەستی ترەوە خەریک بێت؟ رۆژگاری ئەو چ مەبەستی تری دەخستە بەردەست و هۆش و خەریک بوونی یەکێکی وەک نالییەوە؟

لە بەرگی «دوەمی حاجی قادری کۆیی» دا بە پێی لوان و دەسەڵات لایەنی پەیدا بوونی شیعری کوردی لە سەردەمی حوکمی عەبدورڕەحمان پاشای بابان بە دوای شۆرشی فەرەنسەدا روون کراوەتەوە کە دەزانین نالی و سالم و کوردی لە مەڵبەندی سلێمانیدا، بە دوای ئەواندا و شان بە شانی وانیش حاجی قادر و باپیرم و چەند شاعیری تری کۆیی لە مەڵبەندی نێوان دوو زابدا کەوتنە سەر هەمان رێبازی ئەدەبەوە. لەو لێکۆڵینەوەیدا مەتەڵی پەیدا بوونی شیعری کوردی پەردەی مەتەڵایەتی لەسەر هەڵگیراوە. دیارە لێرەدا کە باسی ناوەرۆکی شیعری نالی بکەین و ئەم لاباسەی هۆی کوردیی بوونی شیعرەکانی بخەینە بەر لێکدانەوە دەبێ هەمان بۆچوونەکەی ناو بەرگی دوەمی حاجی قادری کۆیی دووبارە بکەینەوە چونکە، تا ئەمن بیرم بۆ دۆزینەوەی هۆی ئەم دیاردەیەی دەست کردن بە شیعری کوردی چووبێ، هەر ئەو هۆیانەمان دێنە پێشەوە کە لەو کتێبەدا لێیان کۆڵراوەتەوە. کەواتە کوتانەوەی ئەو باسە بەلاوە دەنێم و

خوێنەر دەگێڕمەوە بۆ لای نووسینی ناو کتێبەکە چونکە چی لەوان نوێترم بە چەنگ نەکەوتوە لێرەدا بیکەم بە تەواوکەری ناتەواویی ئەوێ.

کوردیی بوونی شیعری نالی لەلایەن زانینی هۆی پەیدا بوون و زەرفی پەیدا بوونیەوە گەلێک ڕوونتر و ئاشکراترە لە هۆی خەریک بوونی نالی بەو شادەمارانەی کە گوتم ڕشتەی ناوەڕۆکی شیعری پێک دێنن. ئێمە نازانین بە وردی و بە ڕوونی بۆچی نالی پتر لە شاعیرەکانی سەردەمی خۆی عاشق بوە، پتر پەندیار بوە، پتر لە پاشاکانی بابان نیزیک بوە، پتر مەلا بوە، پتر دژی صوّفی بوە، پتریش ئامادە بوە بۆ ئاوارە بوون کە ئەمانە هەموو دیاردەی ئەوتۆن لە شیعرەکانی دەنگیان داوەتەوە و کاریان کردۆتە سەر ژیانی. بەڵێ دەتوانین ڕووکەشێکی ئەم دیاردانە باس لێ بکەین و بە فەندی ڕستەسازیی و مەهارەتی شت تێکبەستن بایی ئیقناع کردنی خوێنەرێکی بەپەلەش بیانخەینە ناو نووسینمانەوە بەڵام چ فایدە کە نووسەر خۆی بەو شتانە ئیقناع نەبێت و باوەڕی تەواویان پێ نەکات. حەیفە من یا یەکێکی تر لەسەر سەکۆی نمایشت و خۆهەڵدانەوە پەڕی ساختەی ڕەنگاوڕەنگی هۆی هەڵبەستراو بە خۆمانەوە بنێین و وەک تاووس چەتری فیزوناز لە بەرانبەر فکرە سافیلکەکەی تەماشاکەران لێ بدەین… بەڕاستی مومکین نیە لە دیراسەی بەپەلەدا هەموو شادەماری ناوەڕۆکەکانی شیعری نالی بدەینەوە بەهۆی پەیدا بوون وەیا بیگێڕینەوە بۆ سەرچاوەی لێهەڵقوڵێن. وەنیە ئەم کارەش کەم بایەخ بێ وەیا ئەنجام دانی لەو دیو سنووری دەسەڵاتی مرۆڤەوە بێ. لایەنی بایەخدار بوون لەوەوە دێت کە بە ڕادەی گرنگ بوونی دیراسەی شیعری شاعیر، دۆزینەوەی ئەو کاریگەرە و ئەو زەرفەی شیعرەکەی لێ پەیدا بوە ئەویش گرنگە چونکە بەم دۆزینەوەیە پێوەندیی شاعیر بە واقیعەوە دەزانرێت و واتا و هێمای شیعرەکانی بەچاکی ئاشکرا دەبێت، کە ئەمە شتێکە گوتراوە و لە هەندێ شوێنی ئەم نووسینەش باسی کراوە. لایەنی ئیمکان هەبوونی دۆزینەوەی هۆی پەیدا بوون و زەرفی لێهەڵقوڵینی شیعرەکانیش بەوەدا مەعلووم دەکرێ کە خەریک بوونی بەردەوام و هەناسە درێژ دەتوانێ ئەو ڕووداوانەی سەدەی بیستەم کە پێوەندیی دوور وەیا نزیکیان بە نالییەوە لە سەرچاوەی نووسراو و دەماودەمەوە وەرگێڕێتەوە و لەگەڵ بەسەر بردنە عادەتیەکەی نالییان بەراورد بکات و تین و تاوی هەردووکیان بخاتە بەرانبەر ئاوێنەی هەڵبەستەکانیەوە و لێیان هەڵێنجێ، لە هەمان کاتیشدا حیسابی تەواو بۆ زات و قابیلیەتی نالی بکا کە چۆن تەفاعول لەگەڵ ئەو ڕووداوانە دەکات.

سەرەڕای ئەمانە، هەموو ئەو ڕاستییانەش تێبخوێنێتەوە کە لە نالییەوە پێمان گەیشتوە و ڕاگەیاندنی تایبەتیان هەیە وەک ئەوەی کە هێندە شەرم بەخۆبوو نەیویست بێ نەبز گرتنی وەزعی سلێمانی و دڵنیا بوون لە پاراستنی ئابڕوو ڕووی تێکاتەوە، ئیتر ئەوە بوو کاغەزی بۆ سالم نووسی لێی داوا کرد کە لەم ڕووەوە خەبەرداری بکاتەوە.

بەڵێ ئەم کارە مومکین نیە بەڵام نەک لەم نووسینەدا کە دەستەملانی دیوانی نالی و چەند بنگەیەکی لێکدانەوە بووە لە ناو چوار دیواری ژوورێکی کۆڕی زانیاری کورددا، هەر جارەش کە ئاڵقەیێکی لێرە بە پێشەوە نەختێک درێژەی کێشا بێ، خێرا بە خێرا ترسی وەتەنگ هاتنی گۆڤارەکەی کۆڕ لە درێژەکێشانی گوتار نەفسی بڕی بێ. ئەم جارەشیان ڕەچاوکردنی یەک قەوارەی لە نێوان سەرلەبەری ئاڵقەکان وا بکا نەتوانم مەیدانێکی وەها فرەوان بگرمە بەر نووسین کە لە دیراسەی دوور و درێژی سەربەخۆ بوەشێتەوە و نهێنی نادیار ئاشکرا بکا.

کەواتە هەرچەند دەزانم تۆژینەوەی سەرلەبەر و بێ کەم و کەسر هەم بایخداریشە و هەم مومکینیشە، بە ناچاری وازی لێ دێنم و دەلکێم بە باسی ئەو شادەمارانەی ناوەرۆک کە نەخشە و ڕشتەی زوربەی هەڵبەستەکانی پێک دێنن وەک کە تا ئێستا لەبەر تیشکی ئەواندا هاتوچۆم بە فکر و خامەی خۆم کردوە.

ئەوەی بۆ هەموو نیگایێکی ڕوون دەردەکەوێت لە هەڵبەستەکانی نالی، زێدە بەرچاو بوونی دوو شادەماری یەکجار بنجی و ڕەگ داکوتاوی عیشق و ئایینە کەوا بێگومان لەبەرایی هەموو بەشەکانی تری ناوەرۆکی دیوانەکەیەوە دێن.

بەڕاستی «عیشق و ئایین» کە خۆیان دوو شادەماری گەورەن، لە هەمان کاتدا سەرچاوەشن بۆ وردە دەماری تر کە ئەوانیش بەشدار دەبنەوە لە تێکڕایی ناوەرۆکی هەڵبەستەکان.

شادەماری عیشق لە شیعری «نالی»دا بە پێی گوتەی دەماودەم کە بەشێکی بەرچاوی شیعرەکانیش پشتگیری لێ دەکەن، لەسەردەمی خوێندنی فەقێیانەیەوە تێکەڵ بە هەڵبەستی نالی بووە ڕەنگە هەر خۆیشی پاڵپێوەنەرێکی گەورە بووبێت بۆ بەردەوام بوونی لەسەر ڕاڕەوی شاعیری، چونکە وەک دەزانین گەلێ شاعیری خاوەن هونەر و خاسیەتی شاعیریەت وازیان لە شیعر هێناوە لەبەر نەبوونی ئاگری عیشق لە دڵیاندا بە تایبەتی کە شاعیرەکان وەک نالی خەریکی خوێندنی مەلایانە و قورئان و حەدیس بووبن. دیارە لەباری وەهادا «مەلا» خەریکی شیعران نابێت ئەگەر سۆزێک لە هەناوی خۆیدا شک نەبا. یەکێکی وەک حاجی قادر سۆزی کوردایەتی لێی بوو بەو جێگرەی عیشق کە تا کۆتای ژیانی شیعری کوردپەرستانەی پێ هۆنیەوە، دەشزانین چ مزگەوت و مەدرەسە و دەرسدانی فەقێیان نەدەبوون بە لەمپەڕ لە پێش گوزەری شاعیریەتەکەی. شێخ ڕەزا کە شاعیرێکی بەردەوام بوو لەسەر شیعر بێ ئەوە عیشق ئاگری لە دڵی بەردا بێت، دەرس و مزگەوتی نەبوو لە شیعری مەنع کات وەیاخود ڕاوێژی بەرەو هەڵبەستی ئایینی ببات. کە مزگەوتی نەبوو، مەبەستی تری هەبوون شیعریان پێوە هەڵبەستێ.

بەهەمە حاڵ وا پێ دەچێ عیشق نەخشەکێشێکی دەست ڕۆیشتوو بووبێت لە ژیانی نالی. نەخشەکێشانەکەشی هەر لەوەندە نەوەستاوە کە شیعری عاشقانەی پێ هەڵبەستوە تا سەردەمی مەرگی. من وا دەزانم «عشق و نامرادی» ئەو فرتەنەیە بووە کە نەیهێشت نالی بەسەر شتێکەوە بوەستێتەوە وەیا بە شوێنێکەوە بگیرسێتەوە کە ماڵ و حاڵێکی تێدا بەیەکەوە بنێت وەیا گوزەرانێک تەئمین کات. هەرچەند نازانین ئایا غەیری عیشق چ کاریگەرییەکی تایبەتی هەبووە وا بکات نالی زێدە لە خەڵقی وڵاتی خۆی ئەو ئاوارە و ئۆقرە نەگرتوە بێت، بەڵام دیارە ئەگەر شتێکی وا هەبووبێ لەو ساڵانەی بەر لە ئاوارەبوونیدا هەر بایی ئەوە تەفسیر بە دەستەوە دەدات کە بێئۆقرەیی ژیانەکەی مەڵبەندی بابانی ڕوون کاتەوە، مومکین نیە ئەو شتە تێمان بگەیەنێ بۆچی نالی هەروا بێ ئۆقرە و ماڵ و حاڵ مایەوە تا کۆتایی ژیانی! بێجگە لە عیشق شتێکی تر بە بیردا نایەت لە بابان ڕووی دابێت و لەگەڵ «نالی» گوێزابێتیەوە بۆ وڵاتان و هەندەران کە لەو دوورەشەوە نەهێڵێ ڕەگ بەزەویەوە داکوتێت.

لەم تاریکستانەی ڕوانگەمانەوە هەر ئەوەمان پێ دەکرێ حیساب بۆ ئەو تروسکانەی ڕووداوی کاریگەر بکەین کە لە مەشقەڵی هەڵبەستەکانیەوە پرشنگ داوێژن. بە داخەوە لەوەندە گوتەی دەماودەم کە پێمان گەییشتووە هیچی ئەوتۆ لە بنی بێژەنگی تەحقیقدا نامێنێتەوە دوو ڕاستییان ساغ کاتەوە وەیا چەند درۆیەکان سپی کاتەوە. زۆر جاران گوتە دەماودەمەکە خۆی لە تەحقیقدا درۆی لێ سپی دەبێتەوە و دەپووچێتەوە وەک ئەو خەبەرەی کە دەڵێ نالی لە قەرەداغ «حەبیبەی ماڵیاوا»ی خۆشویست کەچی لە

هەموو قەرەداغدا «ماڵی ئاوا – ماڵیاوا» و ماڵکاولێکیش پەیدا نیە. دەبینیت چەند دەست بەتاڵین لە بەسەرهاتی نالی!

هەرچەند پێمان ناکرێ بڕیار بدەین لە چ تەمەنێکدا نالی دووچاری عیشقی ئاگرینی «حەبیبە» بووە بەڵام وا دێتە عەقڵەوە ئەم عیشقەی لە ساڵانی خوێندنی دەرەوەی سلێمانی دووچار بووبێ کە سەرەتاکانی تەمەنی جحێڵی و هەنگامەی دەرس و خوێندنی گوندا و گوندی دەگرنەوە. دیارە نالی ئومێدێکی گەورەی بە «حەبیبە»وە هەر ماوە لەگەڵ بەرهەڵستیکردنی باوکی حەبیبەش لەوەی بەیەکتر ببڕێن، ئەم ڕاستییەش لەوەوە بە ئیسپات دەگات کە نالی خۆی دانی پێدا هێناوە لە قەصیدەکەی «ماتەم وەکو زولفەینی سیەهـ...»دا:

بەس گریە بکە بۆ پدەر و بابی حیجابت
بێ بابیی تۆ موریثە بۆ وەصل و مولاقات
بێ بابیی تۆ بۆ من و تۆ بابی فتوحە
بێ بابیی تۆ خواستەیی من بوو بە ئاوات
بێبابی مرادی من و تۆ بوو بە تەمەنا
بێ بابی دوعایی من و تۆ بوو بە موناجات
ئەو بابە کە فەتح و زەفەری قەلعەیە قەمعی
با قەلعی بکا زەلزەیی هادیمی لە ذذات

دیارە حەبیبەش وەک نالی دووچاری عیشقەکە بووە، تەنانەت لە ڕاز و نیازی نهێنی عاشقانەدا بە زاریشیدا هاتووە کە خوا ئەو بابە بباتەوە و بەیەکتریان شاد بکات... بەڵام بێگومان دوای مردنی باوکەش بەرهەڵستی ئەوتۆ هەبووە نەهێڵێ بەیەکتر بگەن کە ئێرە جێی لێکۆڵینەوەی دەرخستن وەیا تەرجیحی هۆی ئەو بەیەکتر نەگەیشتنە نیە. ئەوەی مەبەستەمە لێرەدا دۆزینەوەی لایەنی زوتر دامەزران و چەسپانی عیشق و ئایینە لە ویژدانی نالیدا. ئایا کامیان بەر لەوی تر چنگاڵی خۆی ڕوو چواندوە؟

ئەم چەند دێڕەی لێرە بە پێشەوە لایەنی زووتر ڕسکانی عیشق تەرجیح دەکات، لەو تەرجیحەشدا شتێکی چاوەڕوان کراو و عادەتی بەبەر خۆیەوە گرتوە چونکە دیارە عیشق بەچکەی گەنجایەتیە و ئایینیش هی کامڵتی، لێکدانەوەکەشم بۆیە بوو نووسینەکە تەسلیم بە تاکە بنگەی چاوەڕوان کردن و حوکمی عادەت نەکەم کە زۆر جاران وا دەبێ بە پێچەوانە کار دەکەن.

بەڕاستی عیشق کە قووڵترین و کۆنترین هەستە گەورە و کاریگەرەکانی گیان و هەناوی نالییە، شوێن پەنجەی لە هەموو ئاکار و ڕەفتار و گوتاری نالیدا بەرچاو و بەرهەستە، تەنانەت بەشی زۆری هەنیسکی عاتیفەی دینیشی لە قوڵپ و جۆشی کۆنە عیشقە زامدارەکەیەوە گڕ دەبەستن. ئەو دیاردانەوەی عیشقی نالی لە هەڵبەستەکانی سەر بە ئایینیدا ناو ناوە وەها غەلەب دەستێنێ هەر دەڵێی لەو شوێنانەدا عیشق بەهانەی ئایینی کردوە بە تەقینەوەی خۆی

تووتیی تۆ لە حیرصی دڵ بەندی طەمەع دەخاتە مل
بولبولی من لە عیشقی گوڵ تەغنیەو و طەرەب دەکا

لێرەدا هەرچەند ئەم هەڵبەستە لە زیمنی قەصیدەکەی «ئەحوەلی تەفرەقە نەزەر»دا خەریکی شکاندنەوەی دونیاخوازانە، بەڵام بەجۆرێک بۆتە پێشانگەی عیشق بە حاڵ تارمایی ئایین لەو دیو پەردەی عیشقەوە خۆی دەنوێنێ.

واتای بەیتەکە یەکجار نازدارە، بایی ئەوەندەی تێی دەگەم پێوەی خەریک دەبم.

قەصیدەکە لە سەرەتاوە ئەو کەسانە عەیبدار دەکا کە لە تەک قودرەتی خوادا بایەخ بە کاریگەربوونی «اسباب»یش دەدەن. نالی ڕووی قسەی لە «ئەحوەلی تەفرەقە نەظر – خێڵی چاو شەش و بێش»ە، پێی دەڵێ تووتیەکەت بەندی تەمەعی لە ملی خۆی کردەوە لەبەرخاتری دڵە دنیاخوازەکەت. تووتی مەلێکە قسان دەکا، کەواتە مەبەست لەو تووتیە زمانە. بەند کە کەوتە مل دەبێتە هۆی خنکان، بۆیە ئەو تووتیە بە پەتی تەماع خنکاوە و قسەی حەق ناکات کە بلێ هەر خودا کاریگەرە نەوەک ئەم بڕوایە دنیای لە کیس بدات. مەلی تووتی بە دەوری ملیەوە خەت و خاڵ هەیە وەک ئاڵقە تێی ئاڵاوە و جێی خۆیەتی بە بەند تەشبیە بکرێ –لە هەندێ نوسخەدا «تەوقی تەمەع» نووسراوە کە زیاتریش لەگەڵ واتای بەیتەکەدا دەگونجێ– ئەمە حاڵی کابرای «ئەحوەلی تەفرەقە نەزەر»ەکەیە، با بزانین نالی چۆنە. نالی دەڵێ بولبولی من کە عاشقی گوڵە زمانی کراوەتەوە و شادی دەکات و گۆرانی دەڵێت. دیارە مەبەست لەو بولبولە دڵی خۆیەتی عیشقەکەش عیشقی خودایە کەوا خواپەرست و «عارفی وەحدەت ئاشنا» خەریکی ستایش و عیبادەتی ئەون وەک بولبول کە چەهچەهە بۆ گوڵ دەکات. بولبولەکەی عیشقی نالی لە چەهچەهە کردندا زمانی کراوەتەوە چونەک وەک تووتیەکە بەندی تەمەع لە ملی نەئاڵاوە...

نالی لە سەرچاوەی عیشق، ناوناوە، گەوهەری پەندی دەرهێناوە وەک کە لەم بەیتەدا دەڵێ:

گوڵ بەدەم بادی سەباوە پێکەنی بولبول فڕی
یەعنی عاشق لازمە دوور بێ لە یاری بێوەفا!

وەیاخود لەم بەیتەدا:

تا پێنەکەنێ گوڵ بە دەمی بادی سەباوە
نەمزانی شەوێ بولبولی بێچارە حەقی بوو

هەر لە سەرچاوەی عیشقەوە ئەم دیمەنە تەندروستیەشی هەڵێنجاوە:

دەستم کە لە صەد جێگە بە صەد وەعدە شکاوە
جەبری نیە ئەم کەسرە هەتا نەیخەمە ئەستۆ

له هەندێ ئالّقەی لێره به پێشەوەی ئەم نووسینەدا لایەنی دەرکەوتنی کۆمەڵایەتی له هەڵبەستەکانی نالی ڕوون کراوەتەوە کە ئەویش دەبێ لێرەدا تێی بخوێندرێتەوە هەرچەند لزوم بە دووبارە کردنەوەشی نەبێ.

کورتەی قسە لە بارەی عیشقی نالی ئەوەیە کە ئەم عیشقە بە هەموو سەروبەرێکی ئەدبی نالیدا بڵاوبۆتەوە وەک ڕشتەی دەماران کە بە بەدەندا بڵاودەبێتەوە.

به دوا عیشقدا ئایین ڕووپێوێکی بەرینی لە ناوەڕۆکی شیعری نالیدا گرتوە، بە گەلێک شێوەش جلوەی کردوە. ئەم هەڵبەستانە سەرلەبەریان بە ئایینەوە خەریکن بەشێکی زۆریشیان لە هەڵبەستە هەرە درێژەکانی نالی دەژمێرێن:

١- ئەی چاوە دەرسی حوسن.

٢- ئەحوەلی تەفرەقە نەزەر.

٣- مووی سپی کردم بە شووشتن.

٤- حەڵقەدەر گۆشی کەفی ڕەنگینی تۆیە.

٥- ئەی ساکینی ڕیاضی مەدینەی منەوەرە.

٦- ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا.

٧- شتر بانە.

٨- لە جوملەی موعجیز ئەندەر موعجیز.

٩- لە چاوی ڕووتبارم.

١٠- ساقی وەرە مەیخانە.

١١- نەفەس بگرە.

١٢- ئەی تازە جەوان.

١٣- وەی کە ڕووزەردی مەدینە و...

جگە لەم قەصیدانە زۆر جێگەی هەڵبەستی عادەتی پەند وەیا عیشقیشدا نالی سەری لە ئایین خوار کردۆتەوە و خەیاڵەکەی بە دەوری چرای ئەودا، وەک پەروانە، خول خواردوو کردوە:

دونیا بە فیدای قەدی بکە و دامەنی بگرە
طوبى لمن اختار على المال مالا
جۆشش و تاوە لە نێو دیدەی گریانمدا
چ تەنوورێکە لە تەندوورەیی توفانمدا
تۆ کە حوری وەرە نێو جەنەتی دیدەم چ دەکەی
لەم دڵەی پڕ شەڕە رو سینەیی سۆزانمدا
هودهودی دڵ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە یەقین
خۆی کە دامەنگیری شاهی ئاصەفی ثانی دەکا
ئەو کەسە تەحدیثی نیعمەت بێ مراد و مەطلەبی

میسلی نالی ئیمتثالی ئەمری یەزدانی دەکا
بەم کاسە لەسەر پەنجە دەڵێن نوری علی نور
ڕەخشانە لەمیشکاتی قەدەح دا وەکو مصباح
بنیانی کیبر و سەرکەشیا تاقی کیسرەووی
دانانی زوڵم و ڕووڕەشییە تەختی ئابنووس

سەرلەبەری بەیتەکانی: «لەکن ئەم جەوهەرە فەردە»، زاتەی ئایین.

بۆ تۆ کە بیکر و تازە وەکو حوری جەنەتی
قەیدی چیە عەجووزەی دونیا بدەم تەڵاق
بێسونەتی تەقبیلی دەمت عاطیلە ڕۆژووم
بێ حەضرەتی میحرابی برۆت باطیلە نوێژم

ئەمانە نموونەی بەیتی دینئامێزن لە سێیەکێکی پێشەوەی دیوانەکەی وەرگیراون، کە بێین بە دوا هەموو شوێن پەنجەیێکی دیندا بگەڕێین لە هەڵبەستەکانیدا، خەرمانێکی مناسبی لێ دەدۆزینەوە ئەم شەقڵەی دینی پێوە بێت. دیارە ئەو شیعرانەی کە ئارایشتی خۆیان لە زاراوە و مەوزوعاتی خوێندنی مزگەوت وەرگرتوە ئەویش دەخرێنەوە سەر خەرمانی شیعری سەر بە ئایین. گەلێک پەند و قسەی نەستەقیشی ڕاستەوخۆ لە ئەدەبیاتی دینەوە هەڵکولێیون:

خالی نیە نالی دڵەکەت ساتێ لە هیجران
تاتاری وجودت نەپسێنێ «ملک الموت»

ئەم «ملک الموت»، بە زمان با هەڵدان دەکرێتە «ملی کەلموت – بە واتای ملی وەک مووت – ئەو ملەت کە وەک موو وایە» هەر خۆی «ملک الموت» دەشێ «ملک الموت وەیا ملک الموت» بێت. لە «ملک الموت»ەوە تێکەڵکێشەکەی «ملی کەلمووت» دەردەچێت.
هەر لە سەرچاوەی دینەوە نالی پەندیشی هەڵێنجاوە:

سەهم و نەصیبی ئەصلییە بەختی گیا هو گڵ نیە
تووتنە خەرجی سووتنە مۆدنە ماچی لەب دەکا
لەومی زەمان دەکەی کە بۆچ خواری و ڕاستی دەوێ
غافڵە دەستی ڕاستی خۆت خزمەتی دەستی چەپ دەکا

وەیاخود کە دەڵێ:

گەر ئاب و تابی جەنەتی و دۆزەخیت دەوێ
بنوارە ناوچەوانی بەشوش و برۆی عەبووس

وەیا:

نالی ئاسوودە نیە توولە نەمامی عومرت
بە نەفەس دێت و دەچێ ئەصلی لەسەر بایێکە

ڕێکەوتێکی سەیر لەوەدایە کە نالی لە بەیتێکی ئایینی و یەکێکی تری سەر بە ئاییندا دەسکارییەکی یەکجار شاعیرانە و دەستەڵاتدارانەی دوو وشەی بەیتەکانی کردوە دەشێ بۆی حیساب بکرێ بە نیشانەی پێشەوایی لە مەیدانی زمان و هونەردا. بەیتە ئایینیەکە ئەمەیە:
زەڕڕە لە چاوی بۆتەیی صەڕڕافی کەففەدا
مەخفی نیە دیارە وەکو ڕۆژی نیمەڕە

وشەی «نیمەڕە» کورتە و گۆڕاوی وشەی «نیوەڕۆ»یە کە ئەویش کورتە وشەی نیوەڕۆژە. بەیتە سەر بە ئاینیێکەش ئەمەیە:

مەمخەرە هاویەی هەولی فیراق
دەستی من دامەنی توو ڕۆژی قیا

وشەی «قیا» کورتەی وشەی «قیام وەیا قیامەت»ە.
ئەم مامڵەتە لەگەڵ وشەدا بەرهەمی دەست ڕۆیشتنی لە ڕادەبەدەر و خۆ بە ئوستاد زانییە. حاجی قادریش لەم نیوە بەیتەدا مامڵەتێکی وەهای کردوە:
تەماعی گەورەیی بێ چەک نەکەن نەک

لە کتێبی «ابن الرومي: حەیاتە من شعرە»ی عەباس مەحمود عەقاددا دەبینی «ابن الرومي»ش بەهۆی لەخۆڕازیبوونەوە دەستوورێکی ڕێزمانی عەرەبی ملکەچ کردوە بۆ ئیجتیهادی خۆی لەوەی کە دەڵێ:
«دعوني و ایا ابا علی» «ابا» دەچێتە سەر ڕاناوی لکاو «ضمیر متصل» نەک ناو وەک لێرەدا شاعیر بە ئارەزووی خۆی بەکاریهێناوە: نموونەی تریش لەم بابەتە لە شیعری شاعیری دەستەڵاتداردا هەیە، چەند دانەیێکیان لە کتێبەکەی «مع المتنبی»ی دانانی «طە حسین» دەخوێنێتەوە.
باسی ئایین لە ناوەڕۆکی شیعری نالیدا درێژەی زۆرە کە دیارە لێرەدا جێی نابێتەوە، ئەوەندە بەسە بڵێم چی لێرە بە پێشەوە –لە بەشەکانی پێشوو تردا– دەربارەی مەیلی نالی بۆ تصوف مەزهەبی «جبر» گوتراوە دێتەوە ناو حیسابی ئێرەکانەوە، هەرچەند لزوم بە دووبارە کردنەوەشی نەبێت.
بە دوا عیشق و ئاییندا دەماری تری ناوەڕۆک لە پەند و قسەی نەستەق و دروشمی کۆمەڵایەتی و

خۆهەڵدانەوە و خۆشکاندنەوەی صۆفیانە و ڕەندیی و شیعری بە ڕواڵەت کوردۆست، ئەمانە هەموویان بەشدار دەبن لە پێکهێنانی تابلۆی سەر جوملەی ناوەڕۆک لە شیعری نالیدا کە ئەگەر تاکەتاکەیان بە درێژیی باس بکەین بە درەنگەوە لێیان دەبینەوە تەنانەت نموونە هێنانەوەیان ڕووپێوێکی فرەوان دەگرێ لە قەوارەی ئەم نووسینەدا. ناوناوە بە پێی پێویستی ڕوون کردنەوە، ئەو نموونانەشی کراونەتەوە، هی تریش وەک ئەوان لە دیوانی نالیدا دەدیترێن و هەموو کەسێک تێیان دەگات کە ئیتر پێویست بەوە نەماوە چیتر پێیانەوە خەریک بم.

وێڕای ئەم شادەمار و وردەدەمارانەی ناوەڕۆک کە باسم کردن، یەکێکی تر هەیە دەشێ ئەویش بە شادەمار حیساب بکرێ. لە گەلێک جێگە و موناسەبەدا هەستێکی زۆر بەهێزی «خۆ بە کورد زانین» لە شیعری نالی گەرمایی دەداتەوە کە ئەگەر بخرێتەوە سەر کوردیی بوونی زمانی شیعرەکانی، ئەم هەستەش دەبێتەوە بە یەکێک لە کەرتە بنجیەکانی «ناوەڕۆک» نەک «ڕوخسار – شێواز – ڕواڵەت»ی شیعری نالی بەتایبەتی کە بێین تێبینی داخوازییە ئەدەبییە – سیاسییە – کۆمەڵایەتیەکانی ئەو سەردەمە بکەین کە نالی شیعری تێدا هەڵبەستوون بە درێژایی عومری دوور کەوتنەوەی لە سلێمانی. زمان بە عادەت دەخلی بەسەر ڕواڵەتەوە هەیە، بەڵام بە نیسبەت بوێژی کوردی ١٠٠ – ١٥٠ ساڵ بەر لە ئێستا، بە تایبەتی کە لە دەرەوەی کوردستانی بەسەر بردبێ و نانێکی لەو زمانە کوردییە وەرنەگرتبێ، دیارە زمانەکە دەبێتە مەبەس و ناوەڕۆک و هەست نەک قەپێلک و دەفر. لەگەلێک شوێنی دیوانەکەیدا خۆ بە کورد زانین دیمەنێکی بەرچاوی ناو هەڵبەستە، من لێرەدا مەودای دەلالەت لێ وەرگرتنیانم بە دەستەوە نیە، بۆیە دەیان دەمەوە بە پەرۆش و پێوە خەریک بوونی خوێنەران، بەڵام تاکە مصرەعی کۆتایی محاوەرەکەی نێوان خاکی و نالی تام و بۆنێکی بەهێزی کوردایەتی لێ وەردەگیرێ کەوا دەشێ حیسابێکی تایبەتی بۆ بکرێ، چ دووریش نابینم محاوەرەکە لەو سەردەمانەدا بووبێت کە قەصیدەی «تاقمی مومتازی شاھ» و «تا فەلەک دەوری نەدا»ی تێدا هۆنرابێتەوە. وەک بزانم «خاکی» هەر لە دەوروبەری سلێمانی نالی دیوە کە ئەمە پتر جێ و کاتی محاوەرەکە نیشان دەدات لەوەی دیتنیان لە دەرەوەی کوردستانی عێراقیشدا بووبا:

موحەققەق مەشرەبی «نالی» لە شیعرا هەر وەکو «خاکی»
خەیاڵی کوردییە بەیتی سەراپا زولفی دوو تایە

گومان نیە لەوەدا مصرەعی دوەمی بەیتەکان هی نالین، هەم لەبەر تریسکانەوەی ئاکاری دارشتنی نالی یانەیان و هەم لەبەر هاتنی ناوی حەبیبە لە مصرەعی دوەمی ئەم بەیتەدا:

لە دونیا جەننەتی باقی تەلاری شاهییە ساقی
«حەبیبە» طوررەیی طەوقی ملی شیرین و عەززایە

دیارە خاکیش لە ڕووی ئەدەبەوە ناوی نالی پێش هی خۆی خستوە لەو مصرەعەی کە بووە بە نیوە بەیتی کۆتایی قەصیدەکە و ناوی هەردوویانی تێدایە.

چەند بە ناكامی و نیوەچڵی دەست لەم گوڵچنینەی گوڵزاری نالی هەڵدەگرم: «گەلێ قسەم لە دڵا بوو حیكایەتم مابوو» بەڵام صەد حەیف و مخابن، مەودای حیكایەتخوانی بە پایان گەییشت و تەڵەسماتی گەلێک قەڵای داخراو نەشكێنرا، گەوهەر و نهێنیەكی تێیاندا هەبێ بۆ قارەمانێكی تری تەڵسم شكێن بەجێهێڵرا، منیش هەر ئەوەم بۆ مایەوە، لە پایانی گەشتی ناو باخەكەی نالی، پڕ بە دڵ بڵێم:

دەسكێک گوڵ، دەسكێک نێرگز
مەرگی كورد و كوردستان نەبینم هەرگیز

× × ×

پەراوێز

١– ئەم دوو بەیتە بە چەند شكڵێكی تریش نووسراون.

٢– لە هەندێ نوسخە لە جیاتی «بە سەر چووم» نووسراوە «لە دەست چووم».

٣– وشەی هونەركار لەبارترە بە واتای فنان من لێرەدا پەیڕەوی غەڵەتێكی مەشهوور دەكەم.

٤– لە قورئاندا ڕۆژ بە «ضیاء» و مانگیش بە «نور» تەشبیە كراوە.

٥– لێرەدا بەیتەكەم بە جۆرێک شكڵ نووس كرد كە لە دیوانەكەی مەولەویی بە سەرپەرشتی كردنی مامۆستا مەلا شێخ عەبدولكەریمی بیارەیی لە چاپ دراوە، لە خەڵقی ترم بیستوە بە شێوەیێكی جودا دەیخوێننەوە: لە جیاتی ڕوخساریْ، ڕوخسارەش دەڵێن و لە شوێنی ویش، لێش دەخوێننەوە. جودایی تری غەیری ئەمانەش هەیە.

٦– ئەم بەیتەم شكڵ نووس كرد لەبەر دیوانی نالی كە لە ١٩٧٤ لە چاپخانەی كوردستان لە هەولێر چاپ كراوە. دیتوومە بە جۆری تر نووسراوە بەڵام پێی ناوێ بە دوای كەوین.

٧– ئەم بەیەتە لە چاپكراوەكەی عەلی موقبیلدا «ئایا مەجالی هاتنە» نووسراوە، لە چاپكراوەكانی چاپی كوردستانی هەولێریشدا هەروەها چاپ كراوە بەڵام لە نوسخەی تردا بەم شێوەیە كە من نووسیومە.

× × ×